تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

# دياری پیرانشار

## گه شاندنه وه ی ئاگری دامر کاوی پیشینیان



نوسه ر:
محی الدين برشان
(مه شهور به محی الدين گوی ره ش)

# سياري پيرانشار

## گه شاندنه وه ی ئاگری دامر کاوی پیشینیان

( ۱ )


**نوسه ر :**

**محی الدین برشان ( مه شهور به محی الدین گوی ره ش)**



**ناشر : سامرند پیران شهر**

برشان، محی الدین ۱۳۱۱- Barshan
دیاری پیرانشار: که شاندنه وه ی ئاکری دامرکاوی پیشینیان/ نوسه ر، محی الدین برشان. پیرانشهر سامرند.۱۳۸۴/ ۳۳۷ص. ۲۰۰۰۰ ریال.
ISBN: ۹۶۴-۸۶۲۰-۲۰-۲
فهرست نویسی براساس اطلاعات فیپا.
نثر کردی- قرن ۱۴. ۲- شعر کردی- قرن ۱۴.
الف عنوان.
۴ ب۷۴۷س/۳۲۵۶ PIR ۸/۹/۲۸فا/۸ ۸۴-۳۵۹۷۶م
کتابخانه ملی ایران

**انتشارات سامرند پیرانشهر**




۰۹۱۴۱۴۴۵۳۵۸
۰۴۴۴-۴۲۲۷۷۶۰

- ☑ نام کتاب : دیاری پیرانشار
- ☑ نویسنده : محی الدین برشان ( مشهور به محی الدین گوی ره ش)
- ☑ ناشر: سامرند
- ☑ تیراژ: ۲۰۰۰ جلد
- ☑ نوبت چاپ: اول ـ ۱۳۸۴
- ☑ شابک : ۲-۲۰- ۸۶۲۰ - ۹۶۴
- ☑ قیمت : ۲۰۰۰ تومان

نێوەرۆك

بسم الله الرحمن الرحيم

## پاڕانەوە

بەنێوی ئەو خودایەی هەم غەفوورە، هەم شەکوورە، هەم حەکیمە، هەم حەلیمە،هەم کەریمە، هەم ڕەحیمە، هەم ڕەحمانە، هەم لوقمانە، هەم قەهارە، هەم جەبارە، هەم قەسیمە، هەم جەسیمە، هەم وەسیمە، هەم بەسیمە، هەم شەفیعە، هەم سەمیعە، هەم لەتیفە، هەم زەریفە، هەم موبینە، هەم یەقینە، بیٚوەزیرە، بیٚنەزیرە، بیٚوەکیلە، بیٚدەلیلە، بەنێوی ئەو خودایەی کەئەوهەموو ماوەڕاو و ئەرز و ئاسمان، بەهەشت و جەهەننەم، مانگ و ڕۆژ و ئەوهەموو ئەستێرانەو کەهکەشان و ڕوحی بنیئادەم و مەلائیکەو جن و پەری لەنەبوی خەلق کردوون، بە نێوی ئەو خودایەی نەنووسراوی دەخوێنێتەوە و نەگوتراویش دەزانێت و هیچی لیٚ پەنهان و ون نیەو بە نێوی ئەو خودایەی کە ئێمەی تۆفیقدا هەتا بیناسین و ئیتاعەتی بکەین.سەلەوات و درووود بۆ ڕوحی پاك و پاك خولڵاوی ڕەزگاری دەری عالەمی بەشەرییەت بۆئەو زاتەی پێشەوای ڕەسولانە و شارەزا دەری بەرەی ئادەمە،و بۆئەو زاتەی کە شەفیعی ڕۆژی مەحشەرە وبۆئەو زاتەی کە بە ئیشارەی قامکیٚ مانگی شەق کردوە و بۆئەو زاتەی کە دینی موبینی ئیسلامێی بەتەواوی خەڵکی دنیایە ناساندووەو درووودو سڵاوبۆئەو زاتەی زۆر ئەمینە بۆئەو خودایە. شەفیعی ڕۆژی جەزایە،

دونیا و قیامەت لەبەرە وی داندرایە،

بە زار و قەڵەمی کەس تەعریفی نایە،

نێوی پیرۆزەو،بۆگشت موئمینین،،

ئەحمەدومەحمود.موحەممەدئەمین «ص».

((بە نێوی خوای مەزن ))

## خۆناساندن و ناساندنی باوکم

١ـ ئەمن نێوم: محیٚدینە، نازناوم:بەرشانە، نێوی بابم مام ڕەحیم و دایکیشم نێوی پوورزەینەب بو.پێمدەلێن ((محیٚدین گویٚڕەش))چونکەمەرحوومی بابم ‹بەدەرویٚش ڕەحیم گوێڕەش › ناوبانگی دەرکردبوو.

بابم لەساڵی هەزاروسیٚ سەدوحەفتاوشەشی هەتاوی لەتەمەنی نەوەدو دو ساڵی دا ئەمری حەققی بەجیٚ هێناوەو تەرمی پیرۆزی لەسەرویست ووەسیەتی خۆی بەدەففەو زیکری بردومانەتە شنۆیەلەگومبەزیٚ لەخزمەت حاجی شێخ سمایلی وحاجی شێخ مارف بەرزنجی کەهەردوکیان ،ئوستادی بونە،بەخاکێمان ئەسپاردوە.مەجلیسی پرسەشی لەمزگەوتی حەزرەتی ئیبراهیم و لەشاری پیرانشاری بۆداندرا.

١ـ ئێمەبەنەتەوەدەچینەوەسەرتایفەی شێخشەرەفیان.لەئاوایی کەوتەرو سەرم ساغلیٚ لەڕۆژئاوای سابلاغیٚبوینە، وەکی باپیرەگەورەمان گێڕاویەتەوە دەبیٚ بە ملکایەتیش ئەو دو دێیە، هی بنەماڵەی ئێمە بووبیٚ، دیارەئەوەدەپێش دەسەلات داربوون وچەندساڵیش دەزەمانی قادرئاغای ئیندرقاشی دا ئەودوگەورەپیاوانە١ـ مەروان ئاغا ٢ـ خەلی ئاغا؟ گەورەو ئاغای ئەودو دێیەی بوونە.جانازانم هۆی لەدەستدانی ئەوملکانەچ بوە؟

بەلام وادەردەکەویٚ لەئەوزەمانەی دابوە ئەگەرشێخ شەرەف بۆخۆڕاسانی بەزۆر. ڕاگوێزراون، کەهەتاساڵەکانی هەزاروسیٚ سەد.هەزارسیٚ سەدوودوی هەتاوی٠ قەباڵەکەی لە لای یەکێك لە بەرەبابەکان هەرمابو،جا ئێستا نازانم، ماوە یان نەماوە.

٢ـ وەك هەموخەلکی پیرانشارو شنوو نەغەدە.وزۆرلەخەلکی سابلاغ وسەردەشتیٚ، دەزانن بابم دەنگ خۆش،شاعیروبوێژێکی زۆرماهیربو،شێعرەکانی هەمو عیرفانین، مەجازیم تێدا نەدیون، لە چەند شێعران زیاتر.خوا یاربیٚ خەریکی چاپکردنیان دەبم.

دایکم هەروەکوو لەشێعرەکەیدا ئیشارەم پیٚکردووە، لە خزمەت (سەیدی زەنگیاویٚ کە شەخسێکی زۆر گەورە و بەئیحتڕامەو خەڵك دەچنە سەری بۆونۆبەتێیان) نێژراوە.

پوور زێنەبێ دایکم کچی حاجی مەلاحوسێنی مەنگوڕبوە‹حاجی›یەکەمریدی پایەبەرز خوالێخۆشبوی شەمس‌الدینی بوڕهانی بووە ئەگەر تەمەنی بڕێك چۆتەسەرێ کەمتر هاتۆتەوە ماڵێ هەر لە خانەقایە دەماوەو خزمەتی خانەقاو ماڵە شێخی دەکرد.کە یەکە قورئان خوێن یەکە ڕێ نیشاندەری مەنسوبەکانی شێخی بوڕهانی وەئەستووی خۆگرتبو. حاجی مەلاحوسێن وەختی خۆی لەنێومەنگوڕان وئاخرەکەی زیاترماڵی لەکەڵەکوکەی و دۆڵێ هەوشینان دەبو،کەمتروابوەبەپوڵی مەلایەتێ ژیابی هەربەهێزی باسکی کاری کردوە ونانی خوی وژن ومنداڵی لەڕێگای کاروکاسپێ وئارەقەی نێوچاوانیێ وەدەست هێناوە.

بەڵێ، ئیمەش هەربەفەقیریمان هێناوە؟بابم بەدرێژایی تەمەنی خۆی هەڕینەچێتی کردوەو هەمیشە هەر دەست کورت بوینە وەکو جیرانی کابرای و بڕێکیش خەرابتر، زۆر ڕۆژان واهەبووە نەنانمان هەبووە نە دۆو نەجێگای ژیان ونە هیچ.

ئاوا بە فەقیری بەخێوی‌کردوین.

٣ نازناوی بابم لە شێعرەکانی‌دا «عاریفی» و ‹‹گوێڕەش ››داتابو. ،

٤ـ نازناوی خۆم لە شێعرەکانمدا (پەرێشان)داناوە، کەچی کەمترم دەئەوکتێبەی هاویشتوونەو کەڵکم لە نازناو وەرنەگرتووەلەچەندشێعران زیاتر.

لە شێعرەکانی ئەو کتێبەی‌دائەوەی بیرەوەرێکم هەبوە ؟لەجێگای تایبەتی خۆی دا نوسیومەتەوە، وئەوەی باسیشی لێنەکراوەدیارە هیچ بیرەوەرێکی تێدانیەو؟! تەنیابۆلێك نیزیك‌کردنەوەی،ڕەدیف و قافیەی شێعرەکانە وبەس ؟؟.

٥ـ ئەو داستان و قەیاتانەی نوسیومنەتەوە زیاتر لە سەدا نەوەد لە خوالێخۆشبووی بابم گوێ‌لێبوونە،چونکەبابم،جگەلەشاعیری ودەنگخۆشی و بوێژیی، بیرێکی ئەوەندە تیژی هەبوو، هیچی لەبیرنەدەچۆوە.کەم بەیتیش هەبوە نەیزانیبا،ئەوبەیت وگوتنانەم هەموی لەبابم گوێ لێبوونە« زەبیل فرۆش »

١ـ شێخ فەرخ ٢ـ عەبدوڕڕەحمان ٣ـ محەممەدحەنیفە٤ـ پاییزە ٥ـ حەیران ٦ـ سەعید و میرسێوەدین ٧ـ ئازیزە٨ـ لاوکۆو ٩ـ سوارۆو١٠ـ گوڵێ گوڵێ ١١ـ بەیتی قەشەمشای

١٢ـ کاکەمیروکاکەشێخ ١٣ـ حاتەم ١٤ـ لەشکری١٥ـ کاکەمەم وخاتوزین ١٦ـ برایمۆك ١٧ـ لۆلیٚ ١٨ـ ئیسماعیلنامە ١٩ـ ناگەهان ٢٠ـ قەتارە٢١ـ نمای نمای ٢٢ـ بەهارە ٢٣ـ وهەمووجۆرەشێعرێکی عیرفانی ٢٤ـ وردەئاهەنگ بەگوتن و بەدەنگ.

جا ئەمن لە کاتی منداڵیم هەتا بابم کۆچی دوایی کردووە هەرچی بەقسە ش بویٚگێراومەتەوە، هیچم لەبیرنەچۆتەوە هێناومن نووسیومن و ئەوەی توانیومە کردومنەتە شێعر، خوا یاریێ ئەگەر مەرگ مۆڵەتم بدات لە داهاتودا ئەوداستان وقەیاتانەی دیکانە ش پاش کۆکردنەوەوورێك وپێك کردنیان چە ندی کراشێعرو،یادەناهەربەنەسر دەیان نووسمەوە ،ئینشائەڵلا هوو تەعالاو پێش کێش بە خوێنەرانی خۆشەویستی دەکەم.



مام دەروێش ڕەحیم گویٚ ڕەش دەوەختی شێعر خوێندنەوە و دەفە لێدانیٚ دا

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

حەمد و سەنا.بۆ ئەو خودایەی کە کەسی بێکەسانە، کەسی لە ڕەنگی نیە و ئاگای لە هەستی مارو مێرووی هەیەو ڕازقی ڕزقی هەموو جولەوەرێکیەو کەسیشی بێبەش نەکردووە، هەر وەکو خوالێ خۆشبوو سەعدی شیرازی دەفەرموێ :

ای کریمی که از خزانه غیب گبر و ترسا وظیــفه خور داری

دوستان را کجا کنی محـروم تو که با دشمنان این نظر داری

خۆم بە بەختەوەر دەزانم ئەو هەلەم بۆ ڕەخساو توانیم ئەو چەند لاپەڕە پێش کێش بەدۆستە خۆشەویستەکانمی بکەم بەلاّم بەرلە هەمووشتێك داواوم ئەوەیە ئەم پێشەکیەی بخوێننەوەو هەرجۆرە کەم و کورییەکی هەی بێت تکایەبەگەورەی خۆتان بم بورن یادەنابەنوسراوە پێم ڕابگەیێنن چونکە هیچ شتێك بیٚ کەم و کووڕی نابێ ئەوەش دەزانم ودەزانن ئەگەر چم نەنوسیبا کەس ڕەخنەی لێنەدەگرتم وباسیشی نەدەکردم. چونکە ئێوەی بەڕێز باشی لیٚ حالێن ودەزانن نوسین زۆر زەحمەتە بەتایبەتی بۆکەسێکی کە بەزمانی زگماکی خۆی نەیخوێندبێت ونەی نوسیبێت ئێستاش بنوسیت؟!

ڕەخنەکان بەئەو ناو ونیشانەی کە لەئاخری ئەوکتیبەیدا نوسیومە بۆم حەوالەبفرمون.

زۆر زۆرسوپاستان دەکەم.

ڕەخنەگران زۆربەیان دەبیٚ خوشکەکان بن.دەلێن بۆدەبوبنووسیٚ فلاّنەژنەهەبوەو دەلاّلەکەی فێری کردوەخۆی نەخۆش کات هەتامێردەکەی بنێرێتەگەلاّخڕنووکان ولانی کەم دوورۆژان لە مالێ وەدووردەکەوێتەوە.

یان بلێن بۆدەبووبنووسیٚ لەفلاّنەمالەی کابراژنەکەی لەکولەکەی بەستبوو لێداوە لەسەرکاری ناحەزەتادەلاّلەکەشی دمی براوەیان فلاّنەژنەبۆوابوەفیسەرانەژنەبو ...

چونکە هەرلای ناحەزەکەی دەبینن ودەخوێننەوە.ئەوەش شەرتی ئینساف نییە

ئەگەروابێ هەر لای ناحەزی ببیندرێ و لای جوانی چاوپۆشی لێبکرێ.
لای دیکەی ئەوەیە،ئەوقەیات ونەقلٚ وحیکایەتانەکەکوتراون ئەمانەتن و هەموشیان دیاری کراون پیاو چۆنی گوێلێ بووەدەبێ هەرئاواش بینوسێتەوە کەم وزیادکردنی دەبێتەهۆی سەرلێ شێواندنی خوێنەر،وخەیانەت بەفۆلکلۆری کوردی وزمانی ڕەسەنی نەتەوەکەمان، جگەلەوەی کارەکەش بێ بایەخ دەکا،دیارەکەم وورۆریش هەربووەهەردەش بێ چونکە ئەوانەسەنگ بەسەنگ هاتون وکەمتریش وابوەلەزمانی کەسێکی خوێندەوارەوە نوسرابێتەوە.بڕوانەتوحفەی موزەفەرییەی خوالیٚ خۆش بومامۆستاهێمنی؟ئۆسکارمانێکی ئالمانی کوردی نەزان ولەزمان ڕحمان بەکری بێ سەوادەوەنوسراوە هەرچەندمام ڕحمانی مەڕحوم خزمەتێکی زۆرگەورەی بەفۆلکلۆری کوردی کردوەوجێگای ڕێزو حورمەتە.،

ئەوجار؟ دیتوتە چۆن تەعریفی حەبیبەی ژنی میرزا برایمی کراوەئەگەر مەردانە قۆلی لە تۆلەی هەلٚمالیوە وای خواجەحەسەن بەسرایی،تەنبێ کردوسمتی مۆرکردوەو کردوشێەتە پیاوی خۆی بە پێی کاغەزو بەلگە هەتا بمێنی پیاوی ئەحمەد ئاغای کوێستانی بێ ،

یان ئەوژنەی تۆلەی مێردەکەی کردۆتەوەوکەپوو لوتی ڕێگرەکانی بڕیون ودوایەش بۆتەژنێ مەمێندی ویاخۆازێ چۆن مەلا وەسیمی لەخۆڕیاو کردو چۆلەمەشکێنیشی لە مێردەکەی بردۆتەوەو.چەند وێنەی جوانی دیکانەش ئەوە لەبەرچاوە.

چاویشم لە وەیئەبوە هێرش بەرمە سەر چین و یان تەبەقەیەکی تایبەتی. یان خوانەکاخراپەیان بلێم .ویستی من زیندوکردنەوەو وەبیرخستنەوەی لێ زانی و بوێری ڕابردوی نەتەوەکەمان بوە. هەرچەند بەداخەوە دەبێ بلێین لەڕاست ژنان ڕاکە نیوەی کۆمەلٚ پێك دێنن،هەموشیان دایکن یان دەبنەدایك وجائیمەش ئاوابەدایکمان هەلا دەلێین و هەمیشە وەك بوتیك دەیان پەرستین و بەڕاست ئەگەر لێی وردبینەوەو تێیفکرین،دیسانیش کەمەبۆدایکان ! بە حەق ڕابردویەکی زۆر تاریکمان هەیە، نازانم ئەودایکانەچۆنمان لێ خۆش دەبن یاخواووناوێ خوای هاوار.

## یەکێك لە وێنە جوانەکان ژنبەژنەیە؟؟؟..

ڕەنگ بێ بۆخۆم وەبیرم نەیەت، ئێوە پێم بڵێن کام کوڕو کچە بە دڵی خۆیان پێك گەیشتونە.

کامەکچ وێراویەتی بڵێ ئەمن مێردبەکوڕی فلانە،یابەفلانەکەسی دەکەم

چەندجار ئێوەدیتوتانەکچێك کەزۆرجوان وخوێنشیرنە،دەگەڵ کوڕێکی لە خۆی خوینشیرنتروجوان ولەبەردلان تر،پێك هاتونە لەجێ ژوانێ یکتریان دیوەلەماچ وموچیش بێبەش نەبونەو.،ئارەزویان ئەوەبووە.ئەودودڵدارە پێك بگەن وببنەهاوسەری یەکتری و ئەبەئەوهیوایەی ڕۆژ ژمیریان کردوە،کەچی کوڕەکە؟یان باریەهای نەبووە یان فەقیرو هاوشانی ئەو کچەدەوڵەمەندەی ئەوکچە ئاغایەی نەبووە، نەیانداوەتێ.دیسانیش هیوایکیان هەر هەبووە ڕۆژێکی شتێکیان بۆبڕەخسێ.کەچی دەبیندرێ شەوێکی چەندکەسێك لەماڵە بابی ئەو کچەی وەژوردەکەون، مەلاشیان ئەوە دەگەڵە،پاش چاخواردنەوەیەك کچەی بانگ دەکەن وپێی دەڵێن، ئەوە لە فلانە؟یاله کوڕی فلانە کەست مارە دەکەین!!

ئەوکچەوەك لەبانیڕابەربیتەوە پێی وایە چونکەئەوبەستز مانەقەول و قەراری دەگەڵ کێیەو لەکێی مارەدەکەن؟ئەوەی بەدڵی خۆی هەڵبژاردوە کێیە؟ وئەوەی دەڵێن، لێت مارەدەکەین،کێیە ؟بەدگوز ؟ خوین تاڵ و ناشیرن. بەڵام دەتوانی چ بڵێ؟

ئاخر ئەوە خوشکەکەی ویش لە کاکت مارەدەکەێن، دایك و بابی و خوشکێ گەورەی ڕوی تیدەکەن وپێی دەڵێن ڕۆڵە کاکت ئەوەعومری گەیشتەچل ساڵی، کەس مێردی پێ نەکردوە،خۆ ئەوکچە بەدبەختە ناتوانی هیچ بڵێ ویا بڵێ نا.یابڵێ خۆشم ناوێ ،جارێ سەبرێکی دەگرین؛ چونکەخەنجەری لە سەرحازربوەو،جابەناچاری دەبێ بچێتەلای مەلای وبڵێ ئەمن ڕازیم وزۆریشم خۆش دەوێ هەتا مارەبکرێ؛

ئاوامارەکراوەو هەمو ئارەزۆکانی بونەتە خەون و خەونەکەشی ئاوا لێ هاڵۆز بووە.

## گەورە بە چوکە؟؟ و بەرخوێن؟؟!

کورو کچێك پێك هاتون دەنێرێتە سەری، بابی نایداتێ ودەیکاتەهەلآهەلآیەك مەگەرئەوخودایەبزانێ، دەلێ بابەئەمن کورم هەیە،ژنم بوکورەکەم پێ نایەجائەگەرکچی جحێلێیان هەیەبابێ هەتاژن بەژنەی بکەین، ئەمن ژنبەژنەی پێدەکەم.

بەلێ پاش هاتن وچونێکی زۆر رێك دەکەون چونکەکابراچارەی نامێنی ودەزانی لەدەستی دەچێتەدەرێ،

ئەوکورە خوشکێکی لەسەر پشتی لانکیێ هەیە.دێنن ئەو بەستەزمانەی لەپیاوێکی بە سەروسیما مارەدەکەن،خۆ هە تا ئەو مندالە دەگاتێ، کابراش ردێنی سپی دەبی، جاوەرە ئەو مندالە بێتاوانەی بدە بە کابرایەکێ بەسەروو سیما و ردین سپی.

یان کچێك بە ناچاری بەزۆرمارەکراویا؟ ..رەدواکەوتوە،کابرای دە حەولان دەگرن، گیشەی لێدەسوتێنن، ریگای پێدەگرن، بلأم کابرا کچی گەورەی نیە دێنن ئاوا مندالێکی دەکەنەبەرخوێن وهیچ بیرێکی لێ ناکەنەوە.ئەگەرتوشی کارێکی گەورەو دئەوبەینەیدا وەکو پیاوکوشتن ودەربەدەربون وزعێکی زۆرناخۆش وچاوەروان نەکراودەبن وشتی واخەراپیان بۆدێتە پێشێ وتازەش بەپەشیوان بونەوەچارەیان بۆ ناکرێ و؟وەك ئەو باسەی پێشترمارەی دەکەن وهیچ بیرێکیش لەدلی ئەوکچەبەستزمانەی ناکەنەوە؟؟.

بەپێویستی دەزانم هەروەکی لەئینسانانی زاناوباوەرپێکراوم بیستوەگوتویانە؟؟! زۆرکەسیش ئەوباسەیان دوپات وچەندکردۆتەوەو،ئەمنیش باوەرم هەروایەتاوانی تەواوی ئەو سەریەسەرەو ،ئەوزولمەگەورانەو،ئەونابەرابەریەی دەزەمانەکانی پێشودا رویان داوە؟ لەئەستوی گەورەگەورەکانی ئەوکاتی بووە؟چونکەمسکێن لەکەم هەتازۆردەئەوزەمانی دا هیچ دەسەلأتێکی نەبوە،تەنانەت لەترسی میرودەرەبەگەکان ،نەیوێراوەزمانیشی بگرێ ؟ هەتا بلێ وادەکەم و،واناکەم ؟

**خوێن کوژاندنەوە؟؟.**

هەر ئەوجورە ژنانە بنەگرتو نەبونە، ڕەدودەکەونە.بەڵێ، ماڵە کابرای کە ژنیان هەلگرتوە دە حەولان دەگیرێن، کلکی گامێشیان دەبڕن، سەروگوێلاکی چەند کەسان دەشکێ،چەند جاریش ڕێگایان پێ‌گرتون،بۆیان نەگیراون،ئەوماڵەکچێکیان دێنادەکردە بەرخوێن یاخوێن کوژێنەوە،جل وبەرگ دەکراو؟لێرە هیچ مافێك بۆژنێ بەرچاونەدەگیرا ، دەیان برد.دەماڵەکابرای ژن ڕەدوکەوتویان داویشت کەدوژمنیشیان بو،بەئەوجورەی خوێنیان پێ دەکوژاندەوە وبەلاَم ئەوبیرەیان نەدەکرد،کەئاورهەڵدەکراوە؟ ئەوکچەجوانە ،ئەوکچەبێ تاوانە،تەواوی هیواوئارەزوەکانی هەڵبوەشێننەوەبێ ئەوەی کابرای دیبی،ناسیبی و دوژمنیش بیت،بیدەنێ،بۆیەشی بدەنێ لەگەڵی بنویت وببێتەهاوسەری ئەی لەئەوکارە ناحەزەی؟لەئەوکاری وا دورلەئینساف، چ ویژدانێکەئەوکارەی قبول کردوە.چ غیرەتێك ڕێگای بەئەوکارەناحەزو دورلەهەموڕێگاوڕەسمی مەزهەبی ونەتەوایەتی ومرۆڤایەتی داوە، هەرئەوجورەژنانەبونە،بەزۆرمارەکراو،گەورەبەچوکە،بەرخوێن (خوێن کوژێنەوە،سەر خوێن وچی وچی)وەدوای ئەوکارە ناحەزانە کەوتونە، و هیچ ناحەقیش نەبونە، وسەرئەنجامی ئەو زوڵمانە،ولاَمێکی بەئەوجورەی دراوەتەوەماڵم قەبرەهەق بونە.

بەلاَم بەخۆشیوە.ئەوڕۆئەوکارەناحەزانەزۆرکەم بونەو،ژنی بەمێرد. ڕەدواناکەوێ و هیچ مەلایەکیش منداڵی چوکەمارەناکات؟

ئەدی ئەوڕۆ.ئەوڕۆش کاری ناجوانی دیکەدەبینرێ‌نەك بەشێوەی پێشو؟: وەکوو؟

حاجی سێمان دیارە بەنێوی باپیرە گەورەمان کراوە،

کیژێکی بۆکوڕەکەی خواستبوو! : نا ! نا !باشە دەی بابۆنەوەکەی بێ !

:ئاخر کوڕی چوکە بەتایبەتی ئەگەرلە ژنی ئاخری بێ زۆرلەکوڕەکانی دیکە خۆشەویست ترە! کوا ئەوە کارە ، بۆیە دەڵێم پێنج سەت هەتا نەبێتە درۆو دەنا لەسەر نیوەی مڵك و سامانەکەی خۆی مارە کردوە!

کەچی مڵك و سامانی ئەو مامە حاجیەی بە کەس حیساب ناکرێ ،

دەی بەڵکە کامپیوتێرێکی هەورازتر لەکارخانەی بێتە دەرێ و حیسابی بکات .

جیا لەوەی چەند بڵێم چەندان ماشێنی بۆمارەکردنێی دەرێیە کردووە؟

باشە مامە حاجی کوڕو کچ فەرقی چیە هەردوك لە جەرگی خۆت نەبونە!

ئەو هەموو خەرجەی بۆکوڕەکەتی دەکەی! ئەوە ئەگەر کچەکەت بەمێرد.دا؟

بێ ئەوەی بزانی کابرای کچەکەت داوەتێ هەیەتی یا نیەتی دەڵەی ئەمن جەیازی تەواوم دەوێ و کارەکانی خۆت نایەتەبەرچاو! کچەکەت بە جەیازی کابرای دەڕازێنێوە، ئاخرمامەحاجی گیان هەرنەبێ پێنجێکی بۆکوڕەکەت خەرج کردووەبۆکچەکەتی خەرج کە. نازانی هەرچەندی بۆکوڕەکەتی خەرج کەی وبۆکچەکەتی خەرج نەکەی وهەرئاوا بە پوڵی بابی زاوای بیڕازێنێ وەیا بێ حورمەتی وەك بە ژن دان و بەرخوێن یا سەرخوێن و باربەهاو.لەباتی ژنێ بەمێرد بیدەیەدوژمنت؟

دیسانیش هەر کچ لە کوڕی بە ڕوحم و موحیببەت ترە!

زۆریش وەوەی دەچێ بەچاوی خۆشت دیبت ؟

یائەوهەموزیادە خەرجیەی وکاروانی ماشێنان وچاوەش وگەلەکۆیی وبەزم وهەڵڵا وبەکلۆپوڵ خەرج کردن وچی وچی فکرت لەجیرانەڕەش وڕوت و فەقیروبێ پوڵەکەت کردۆتەوە کەهیچی نیە. ؟بم بورە هیچی دیکەت سەر ناهێشێنم !!؟؟

تێبینی؟؟

دەبێ ئەوەش بەباشی بزانین هێندێك شت گوتراوە،نوسراوە زۆریش جوان وبەجێ بوە، هێندەش وەڕاستان چوە پیاو وای باوەڕ پێکردوە، وەختبوە سوێندێشی بۆبخوا و بڵێ، ئەوە،قسەلێکردنی ناوێ،ڕاست وبێدرۆیە؟بەلام ئەو نەقڵە، ئەو قسانە لەڕوی تەجروبە یەوە داندراوە وێچوەو ناکرێ بڵەی بێ شك ڕوی داوە..

بەعزە شتێك دەنەسری‌دا هەیەودە شێعری‌دانیەیاکەمە.لەئەوبارەیەو،تکایە بمبورن.

## جل و بەرگی کوردی

هۆ لاوی کوردم هێزی هەناوم          پەڕوی برینی جەرگی بڕا وم
چرای ڕ وناکی کورد وستانەکەم          هیوای دواڕۆژی نیشتمانەکەم
بەیانان ئەشێ زووهەستی لەخەو          نەبیەنیشانەی تیری ئەم وئەو
گویزانت تیژکە وریشت بتاشە          سمێڵ تاقنج بێ پترم پێ باشە
ڕانك وچۆخەڵەی شینکێکی مەرەز          لەگەڵ کەراسێك پڕئیشتیا وبەلەز
سپی بێ وەکو بەفری یەکشەوە          جاسۆرانیانی بەجوت بەردەوە
لەچیتی گوڵ ورد پشتێند ببەستی          ڕیشۆ ڵدار دەسرەی بەرپشت ودە ستی
عەسڵەشەدێکی مۆدموکریانی          خرۆقوڵەڕیشوی دەناجامانی
پەستەکەسوری دابی لای خۆمان          یاقوڵەباڵەکەی قوتەی هەورامان
شەمامەبەندی یاهەرکەڵاشە          خۆماڵی دۆڵاغ خۆ هەربەلاشە
خەنجەری دەبان لەشاخی نێری          دەسکی بۆچاکەی جاکوادەوێری
لەبەرخەنجەرت کێردی تیژ کراو          د یار دی پێ وکوژەکاتی چویەڕاو
دەسحێبێکی زەرد عەسڵەکارەبا          دەڵێن زەردوویی ودەردوەلا دەبا
بڕۆسوێ کوێتێ وتیرئالیکی کە          خۆت مەگنخێنەوخێرازینی کە
سەرڕاوێ بگرە وشینەی هەستێنە          د یاریەکەی تەمال زیاتربستێنە
هاتیەوەئەسپی بگێڕەبەجلەوە          ماندوێتی دەرکردنەوجاردایکەوە
بەئەوداب ورەسمەبەئەوبەرگەجوانە          لای ڕۆژ ئاوا یەبگرەگوێسوا نە
بروانەورد وردبەسیلەی چاوی          لەرێگای کانی بنگێوەگراوی



## کاتی پیری

ڕەفیقان ڕێگەیەك بۆ.ودڵەی پەشیێوم بەغەفلەت تابەکەی ڕێگابپێوم
دەبینی چۆن لەشی پاك داچۆڕاوم نیشانەی دیشەباری سەردولێوم

دڵە! تا کەنگی خۆیناویێ دەنۆشی؟ وەبیرخۆت بینەوەڕۆژانی خۆشی
دەناڵێنم لە حەسرەت دوری لەیلا بەتاسەوەبەگریان وپەرۆشی

سەرم داییم دەسورێ گێژو وێژم لە چاوم بێ وچان ئەسرین دەڕێژم
لە ئاخر ساتمە خەم هەن لە دەورەم بەشم وایەو کە هەر تاڵی بچێژم

کەل و پەل بون ددانی شاڵ و واڵم ئەوەی ماون لە دەستانێان دەناڵم
نیە ڕیگەی ڕوناکیم لەم جیهانە بڕۆم بۆ کوێ لەدەستی ژینی تاڵم

نیشانەی پێرییە پشتی چەماوم بە بێ هێزی وبەجەرگی هەڵکزاوم
کە هەستم جێگەکەم جارێك بگۆڕم دەفیزێ ودەمکەوێنێ قاچی خاوم

پشوسوارو نەخۆش، نوساوە دەنگم بەلادادیم وەکوسەرخۆشی بەنگم
دڵم ڕێگەی ئەوین دەبڕێ ئەگەرچی زرینگەی گوێم دەدا ئاوازی مەرگم

لە سەر چاوم تەنیوە تۆڕ و تانە بە هەرلادا بڕۆم هەر بۆ نەمانە
پەرێشان و حەزین و موبتەلاخۆم لەلای دیشم خەم ودەردی زەمانە

*** 

## بۆ باوکم

بابە! پێم وایە لە ماوەی ژینت — وەك شەم سوتابوی لەرێی ئەوینت
دەنگی گریان ونالەی شەوانەت — بەنەغمەخوانی وئەودەنگە جوانەت
بە مەدح و سەنای ئێزەدی مەننان — ویردی زمانت، شەو تا بەیانان
گەورەیی وڕوحمی ئەوپادشایە — هێند زۆرە وبە کەس تەعریفی نایە
ڕێزوحورمەتی ئەحمەدی موختار — کوا، کێ دەتوانی بیخاتە ئەژمار؟!
وەحی رایگەیاند: لەبەر تۆ نەبا — خەلقم نەدەکرد هیچ با هەر نەبا
شاعەبدولقادر مەولای دەروێشان — هیمداد دەخوازین بە یاهوکێشان
شێخ نیزام ئەالدین پاش کانیکەوە — تەریقەت لەشنۆدەست پێ بکاتەوە
لە حەلقەی بەزمی ئەو عارفانە — خزمەت شێخانی ئەو خانەدانە
ئاوال مریدان دانیشتن بە سەف — وەجۆشت دێنان بە ئەشعار و دەف
بەو زمانی حال زیکرت پێکردن — غەفلەتت نەکرد لە ڕۆژی مردن
بە پێی زانین ووەسف وبۆچونت — وەك حەقپەرستێك لە ڕێگەی ڕونت
حەیف نەناسرای وەك دەبو ئاوا — هەربۆیەش بێ دەنگ کردت ماڵئاوا
باوە بەو خۆ ایەی کەسی گشت کەسە — بۆ عەبدانی خوی چەند فریادڕەسە
ئازادم نەکەی تۆ بە دڵ و یەقین — چۆن داندراوە لێخۆشبون، بەخشین
کارم دژوارەو هاواربەماڵم — هیچ کەس نەبینێ ئەو ڕۆژی تاڵم
بەزەیی و هەمو خۆشەویستی تۆ — ڕونیش دەبینری وبیرو هەستی تۆ
ناخۆازی تەنگ وچەڵەمەم توشبی — ناعیلاج دەبی و دەبێ لێمخۆشبی
خۆاش فەرمویەتی هەربەوحیسابە — ڕەزا و ڕەحمەتم لە دایك و بابە

***

## بۆ دایکم

دایە لەوەختەی کەبویە دایك ومـاندو،وشەکـەت
شەو لە ڕۆژ ماندوتر و هەرنەتبوکاتی خۆشی قەت
بۆ بژیوی حالّی ئیمەی زار ئە لەو ڕۆژەڕەشە
قەت نەبوی غافلّ لەخزمەت ویستی خۆت بوئەوبەشە
ئەرکی خۆت هێندە بە دلّسۆزی وەکو دایك نواند
تا تەم و تۆزی نەهاتی و نیکبەتی ئێمەت ڕەواند
ئارەزوت بو بێتە بەر، داری ئومیدت بەلّکە تۆش
لیێبخویێ لە بنی بنوی تا زۆر ببینی خەوتی خۆش
داخەکەم کۆزت بە ساوایی بەجێ هێشت ئەی دریغ
کۆمەلّێك ڕەنجت بەسەر بابدا بەجێ هێشت ئەی دریغ
بو بە ناسوّر تا دەمی مردن، برین هەر مایەوە
کۆچی دوایی تۆو شەهیدم بۆیە هەر دەکولایەوە
بۆوشەهیدەی ویستی تۆویستی هەموخەلّکی دەویست
بۆو شەهیدێك دەنگی زولّم وزۆروزۆرداری دەبیست
بۆو شەهیدەی گیانی خۆی دانا لە سەر خاك ولات
لای‌نەدا، ڕیگەی بڕی تاکو سنوری سورخەلات
بۆ دەبو لەو سەرزەمینە، بۆو برینەی مەلّحەمێك
کەس نەبا بوی دابنابا و مەنعی گریان با دەمێك
تا قیامەت با بمێنێ مایەوە هاوار بە خۆم
با لە جێگەی شادمانیم دەرد و حەسرەت، غەمبخۆم

کـــواچ ئـــەولادێك لەدەســـتی‌دێ ئەمـــەگ بـــێنێ تـــە وە
نـا ئـەوە بۆخـۆی" بـەڵام بـا دایـك و بـاب بخـوێنێ تـەوە
خـۆ بـە بـڕوای کـەس نـەبو هینـدە بـزە و غـەمخـۆری تـۆ
سـەدهەزار ڕەحمـەت لــە قەبرت،پڕلـەنور بـێ گـۆڕی تـۆ

دەئەوچەندشێعرانەدا،ناڵەوپەرۆشی باوکم بوەبۆلەدەست دانی ڕۆڵەیێکی ئاواقارەمان ونەترسێك وەکوکاك عەلی گوێڕەشی وهیچ دڵخۆشێکی نەبوەو،هەتاکو؟شورش لەئێرانێ داڕوی داوەسێبوری بەهیچ شتێکی نەدەهات؟!



## بۆ کێوە بەناوبانگ و سەربەرزەکانی پیرانشار

شارەکەم، شاری پیرانشارە کە چەند جوانە دڵم
هەمو خەڵکی کە دەڵەی خونچەیی خەندانە دڵم
دیمەنی تۆم هەبێ بێباکم لە بون و لە نەبون
دور لە تۆ مەملەکەتم پێ وەکو زیندانە دڵم
ناوچەکەم مامەش و لاجان و گەدە و بەرینەیە
بەری پیران و نەڵێنە و بەری مێرگانە دڵم
کێوەکانت بە قەرای ویستی هەمو ئازادی خوا
بەرزە سەریان تۆدەڵەی سەرلە سەرئاسمانەدڵم
تۆلەسەردوندی چیای ئەستەمی قەندیلی مەزن
جوان و خۆشتر لە هەمو باغ و گوڵستانە دڵم
قەڵاتی شای ئەرێئەی کێوەلەمێژینیەکەمان
خاوەری وەك سپیسەنگ سەروە موکریانە دڵم
کانی خوای بەرقەد و لاپاڵی هەتا قوچێ قەلان
وورد ئەگەر بێتەوە بیرت، خۆ پەرێشانە دڵم

❊ ❊ ❊

## باسی مەنتیقەی پیرانشار

شارەکەم ڕۆژێک، نێویان نا خانە    چەند ماڵ زەرگەتەن، دوای کۆنەخانە
عێلی پیرانان ،بە چوك و گەورە    تێکۆشان هەمو،وێکڕا لەو دەورە
خانەیان نێو نا، پیرانشار ئیدی    نێوەکەی خۆشە، باس‌ناکەم چیدی
شارم بەو نێوەخۆشەی،ناسراوە    پیاوی بەهێز و،گەورەی لێ ژیاوە
بێشکەی ڕازاوەی،زۆرگەرەپیاوان    هەروا دلسۆزبی، بۆ دایك و باوان
پیرانشار! یاخوا،هەر ئاوەدان‌بی    بۆ میوانانت،هەر خانەدان بی
لاجان بەهەشتە،مامەش دەگەڵ بی    بە پاکی و مەردی، ناشی دەغەڵ بی
کوا کاسەکەران،ناوچەی لاجانە؟    لەمبەرە؟ یاخۆ، لەگەڵ پیرانە؟
گرداشەوانەو،لەگەڵ ڕکاوێ    کەندەقولانم ، خەراپەی ناوێ
لاوێنەوئەوجار، گردەگۆرانە    گەنەدارئاخر ، دوا ی بەرکەمرانە
خۆتۆنابی بچی،بۆخڕێ بەرداشان    نەکورپێت کەون،بە بەردوگاشان
لە کەندەقولان، لە لای مامشێخم    بابارگە و بنەی خوێی، لە لا بێخم
بۆ وەتماناویم،دڵ بە پەرۆش بو    خۆ گەپلەسەنیش،گاڵتەی لێخۆش‌بو
ساڵی بیست‌ونۆ،ئە لەو زەنگیاوە    لای سەیدی شەهید، دایکم نێژراوە
لە دایەشێخی، هەتا تورژەڵێ    ئەو قەرەخدرە کوا ڕاستی دەڵێ
لە سنجەلێڕا، بۆ شێلمجاڕان    خۆ لە قڕ وچاوێش، زۆر باری باران
گردەبنم زۆرجار،لێی گیرساومەوە    دەورانی لاویش، لێی گەشاومەوە
کاك مەلاقادری، زاناو تێکۆشەر    خۆی تەرخان کردبو، بۆو کارەی یەکسەر
مەلای ئاوایی و،هەم بۆپێش نوێژی    تا بناغەی عیلم و،دینی دابرێژی
هەرگیز نامرێ و،زانا زیندووە    لەلای زانایان،دەرسم خوێندووە

کێلەسیپانم، بن‌بەردی گوێزێ دەی؛ باگرداسێش، بێتە نێو ڕێزێ
خۆ زینوی ئینجیان،دڵی نارەنجی ڕیکێان‌خەینەوەو،دەگەڵ خورینجی
سەرشاخان چۆلە،ئیدی پیێ‌ناوێ کانیەزەرد، کێلی، کورێ، سەیداوێ
بەڵێ هەوشینان، بازارگەو، د ێلکە د و کەڵەکوکەو،شێوەبرسێیکە
هەر لە سەرشاخان، ئەو بابەکراوە وەك ئەحمەدغەریب،لەجێی خۆی ماوە
بەغەڵدەغەڵدبوم،لەوحاجی غەڵدە وەك لگبن بەڵا، کوا دا بۆم هەڵدە
لە سەر بلێندەی، کانی‌مەلاێە دەشت قوڕێ بانگ کە،بۆدەنگت‌نایە
هومام بۆ گەرگول،کوا لە سەر ڕێیە ؟ گەرگولی خوارێم، ڕوی دە قەسرێیە
جیێ دەولەمەندە،ئەو کانی‌بداغە جیێ خۆش بۆ زستان، هەر کانی‌باغە
شاوەلە داخوا،ئەو گەورەدێیە دەگەڵ بایزاوێ،دێتە سەر ڕێیە
پەسوێ شارەد یی، بیانوشێ نا وێ هەر ملکی وێ یەو، تا سەر ینچاوێ
لە کانی شکەوتێ،هێندە خۆ ماوێ بیری زۆر تیژی،لێبو، تۆبزاوێ
هەبلەس ! کوندرێ،بۆ وا بێ‌دەنگە گەلێك هاتم و چوم،لەو شۆزەنگە
لەپەی بەلەبان، بێ‌شەمای کێلێ لە گردکسپیان،با قوڕێ بشێلێ
دەتوانم بلێم:ئەو گردکشانە وەکو ئەندێزێ،سەر ڕێگاوبانە
دیێ سەروکانێ، هەتا سۆفێانێ توانێش نێوبێنین،لەگەڵ جەلدێانێ
با بە گو ڕ گورم،وەبیرد ێتە وە برینی جەرگم،دەبرژێتەوە
بابچینەکولیچی،لای مام دەروێشی دەنا دەزانم، شێخ دڵی دێشی
وەکو بەربنە،کوا لەکوێو د یوە گوێزی کاك مەلا و،زێوکەی پڕ میوە
هەروەسەرکەوی،دەچیە گردەسور بۆ گردی کاولان،بۆتە کێوی تور
سەرسەوز و بەرزە،بەهاران ماشکان لەبیرتەسێلۆی،چەندناخۆش تێ‌شکان

| | |
|---|---|
| هەمزاواوشێتبوم،بۆنیوقەدتەسكان | خاڵدارجیێ سەیدو،شاڵ وسەركەسكان |
| كوا پیرەكانی؟ قوببە لە كوێیە؟ | هەوارەبیمان، زۆر لە سەر ڕێیە |
| بەردەقەل جێگای،دوازدەحاجیانم | ئێستا زۆر تەبان،وەك لێی دەزانم |
| هەبڵەسی پیران،جگەرخوارەكەم | دریكەش جێگا ی،خەفەتبارەكەم |
| كوا كەڵەكین بو؟ نانانا دەلاوان | بندرێش جارجار،جیێ بەڵەكچاوان |
| مەلائا ودە لیش،خوی لێ هەڵماڵی | ئەگەرتوان دەخوێی،بچۆخواجاڵی |
| لە قسقەپانی و،یان كاسورەدێ | لە كۆنەلاجان،گولاوێش بۆن‌دێ |
| خۆ لێك نیز یكن،گەزگەسك و زێوە | لە گردیمخانێ،هەرخۆ مەبزێوە |
| ما وە سێگردكان، شیناوێ شارە | زێدان زیادنەبوە، كوا ئەوەش كارە؟! |
| جەڕان خۆ پیاوی،گەورەی پێگەیاند | داری ئومێدی،بۆ دواڕوژ چەقاند |
| چیانەو سۆغانلوێ،هەتاكو قەلات | ئێمناباد ئەوساڵێ، چەڵتوكی دەكات |
| قەلاتەڕەشێ و د یلزی لە بنارە | نەمنجێ داخوا،ڕازیە بەوكارە |
| لە ناوچەی پیران، د یی باد یناوێ | بابچینە ماسیان، د و قولاپان باوێ |
| چۆلە قەلاتێ،موتاوێ گوتیان | قەمتەرێش هەروا،لەگەڵ تەمەرچیان |
| بەری مێرگانم، كوا ڕەنگ و بۆنی | ماویەو لە بیریە،ڕەفیقی كۆنی |
| گردشەیتان، بێكۆس،دوا باد یناوە | لە كانیشكەوتی و،گرد ڕەحمەت ڕاوە |
| گردباساك لەگەڵ،كۆی یاران خۆش بون | ئاوخواردەوكەوپەڕ،بۆم بەپەرۆش‌بون |
| جێی شێخ و مریدە،تركەشی شێخی | دەرویش و سۆفیان،بێنی و ڕێك بێخی |
| تركەش ناوەند و،مەكۆگەی خۆمان | قوبادبەگیانە و،د وایە د وچۆمان |
| شێخی باوەلێم، هەر داربەدەستە؟ | بۆ شێت و شوران،دیسان تەڕدەستە؟ |
| لە كانێ شینكێ، بچۆ تازەقەلا | ئە لەئەو گەزگەسكەی،زۆر باری بەلا |

لە قەبری حوسینی،تا شیوەمێرێ   لە پشت سەپێکان،چۆن خۆدەبوێرێ
چۆڵن گوڵفەت و،خەرپاپ و زەویان   خرێ چەوندەرێو،دێی ماڵی سۆفیان
بەڵێ خۆناوچەی،مەنگوڕیەو، نەڵێن   گەدەش دەورانێك،خۆشیش بووبژوێن
بەردەڕەشانم، کەوتۆتە نێوێ   دەزانم، بە ڕەبەی،هیچێان ناپێوێ
ئەوەت کانی‌سێو، ئەسحابەش لێرە   فاتیحا بخوێنە، بۆ مرد و خێرە
گەنەدارەکەی،ناوچەی مەنگوڕی   خرێ ئاغەلانیش،زۆر بە خۆی خوڕی
کوا مەلاحوسێن، ماوە هەنگەوێ   پشتێن شل لەکوێن،حەرامکەن خەوێ
میشەدێ دیارە،کوانێ خات بەسێ   با بە لەنجەولار،بێ تەشی برێسێ
خۆشە باوەڵێ و، چۆلە قاداوێ   بۆ دەشتێ گەنمان،هێندە خۆداوێ
زۆر کوڕپەگوی بو، ئە لەوبەردە کوڕە   تا نێو شەختانێ،بە هەڵاوبە گوڕە
کێ دەڵی گولەك،کەسیان پێناوێ   زۆر بسیرەوەریم،هەن لە بەدراوێ
لەو باستان بەگەی، ژیاون گەورە   کوا بۆ گرد نەڵێن،هەبوە ئەو دەورە
مام هێبە خۆشە،یا نە شەکراوێ؟   زۆری دەمێنێ،تاکو شاڵیاوێ؟
کێچی کونەکێچی، شەشیان دو سێنە   ئەگەر دەیزانی،کوا ولامی بێنە
هەر بە تێزەتێز، سەرتێز وا هەلات   خوێنەگرتەوە،هەتا نێو قەلات
کەرمندار پیاوی،گەورەی لێ ژیاوە   وتەو برپیاری،ئێستاش هەرماوە
شارستێن حوجران،سەلۆس وەرمیشان   مێرگێ قوڕێ دەنائاخری بازرگان
گردەشینانم،وەك جاران مابێ   لە دۆڵێ گوێزان، گوێز خەلاس نابێ
میشەد یێ سەرێ،زۆرنەبی مەحتەل   هیچ وەخت نابێ،دەگەیە قۆیتەڵ
کانێ نۆبەتێیەو،کانی کیسەلان   جوانی ئۆغە نیم،کەوتنە بەردلان
گردی مرادبەگی، تا سێوێ گەدەی   بچوبۆ کانێ کلێ و،پشوی لێمەدەی

کانــی خلیــل و،یاقوشــیش بــۆ مــن خــزم و د وســتی زۆر،نــیزێکی خۆمــن

❊ ❊ ❊

## شی کردنەوەی شێعری باسی مەنتەقەی پیرانشاری

دەپێش خانێدا، کۆنەخانێ هەبوە، لە سەر کانیەیەکی کۆنەخانێ کاروانسەرای لێ بوە. کاروان هات وچۆی کرد وە،لەمیسرو شام و حەڵەبان ڕا بۆ ڕەی و کشمیری و هیندوستان،وکوێ و کوێ لەوێشڕا بۆ ڕەی بۆبەغداو شام ومیسر حەڵەبان...،

بەزاراوەی کوردی عێراقی وزاراوەی زۆرلەکاروانچیەکان،بەکاروانسەرایان گوتوەخانە (کاروان سەرا) دوایەش چەند کاروان سەرا لە خانێ داندراون، نەزاندراوە هوی ئەوەی چبووەو؟لەبەرچی کاروان سەراکانی کۆنەخانێ لەکارکەوتون و کارو هات وچۆ هەربۆکاروان سەراکانی خانی بووە، و هەروا کاروان سەرا ماونەتەوە پێیانگوتوونە خانە یانی کاروان سەرا.جائێستاخانێش ئاوائاوەدان بۆتەوە وەکوئێستاکەدیارەودەیبینین زەرگەتەن وکۆنەخانێشی وەبنەخۆداون وتێکەڵ بونەتەوەوبۆتەئەگەورەشارە.

جا پاش ئەوەی، بە کۆنەخانی گوتراوە کۆنە خانە (کۆنە کاروان سەرا )

❊ ❊ ❊

## زەرگەتەن

ئەوێش چەند ماڵێك بوە، بەڵام دەپێش دا لە خانێ زۆرتر بوە بە بیری خۆم ساڵی هەزارو سێ سەدو بیست وهەشتی هەتاوی هاتومەتە ئەو خانێیەی پێنج شەش دوکانی هەبون، ڕوبەڕوی خانوبەرەکەی گومرگی ئیستا. دوکاندارەکان ٠

١ـ مەلا عەبدوڵڵای نەمنجێ ٢ـ حاجی سەید شامە ٣ـ چە ند دوکان داری دیکەشی لێبون بەڵام ئەوانم نەدەناسین یا لە بیرم نەماون.

خانێ چونکە لە ناوچەی پیرانان هەڵکەوتوە، پیران حەولیان بۆدا، نێویان نا پیرانان شار(شاری پیرانان) و زۆریش بەجێیە.

بۆ میوانانت:مەبەستم لەئەوڕۆڵە ئازا ونەبەزانەبوە،کە بو ئازادی وڵات و لەناوچونی حکومەتی پەهلەوی و بنەبڕکردنیان، گیانی خویان بەخت کرد ؟

لە ساڵەکانی هەزار وسێ سەدو چل و سێ هەتا هەزارو سێ سەدو پەنجای کە شۆڕشی چەکدارانە لە مەڵبەندەکانی پیرانشار، سەردەشت و سەرسنوروشاخ وکیوەکان دەستی پێکرد، زۆر ڕۆژان تەرمی پیرۆزی لەخویندا شەلاڵی یەکێك لەئەوشەهیدە سەربەرزانەیان دهینانەوەپیرانشاری.دیارەئەگەرلەساڵی هەزارو سێ سەدوچل وشەشی دادگای نیزامی بەسەرکردایەتی«تیمسار ئووەیسی وسەرهەنگ سیدقی» لە سەربازخانەی جەڵدیانی دامەزرا،شەهیدەکان زورتربون دەیان لاوی بەزیبکی وەك نامیقی قارەمان و هەوالآنی تری بانەیی.برامان داریوش وبەهمەن لەهۆتی وکاك عەلی گویڕەش وکاك سولەیمان کەرقەشان وعەولای بایزەقنجەی وکاك سالح لاجانی ومینە شیرێژ و حەمەسوڵتان و حوسێن چل کۆچ وقادرەشەل ولاوەکانی دیکەی پیرانشاری لە بێدادگای جەڵدیانێ بەئەو حوکمە ناڕەوایە مەحکوم و گوللەباران کران، یا ئەوانەی لە کێوان بەهوی جاسوسی سیخوڕەکانیان شەهید دەکران بۆ چاوترساندنی خەڵکی.پاش گێڕانیان بە هەمو شارە کوردنشینەکان‌داو، بڕێکیش لە ناو شارە غەیرە کوردەکان‌دا؟! دەیان هینانەوە پیرانشاری و دەیان هاویشتنە سەرداشقەی و دو ژاندارم لەگەڵ و لە دەرکی مزگەوتی حاجی سەیدبرایمیی فرێیان‌دەدان،بەلآم، خەڵکی پیرانشاریش، زۆر ئازایانە تەرمی ئەو شەهیدانەیان دەشوشتن و کفنیان دەکردن و لەگۆڕستانی زەرگەتەنی دەیان‌ناشتن. شەهیدەکانی لەهۆتی و بانەیی و ئەوانەی دەگەڵ سالح لاجانی و سولەیمان کەرقەشانی بونە هەر لەجەڵدیانی ولە سەر ڕێگایە نێژراون.بە قەولی بەعزەکەسێکی سولەیمان وڕەفیقەکانی وەکوعەولای بایزە قنجە ی سالح لاجانی ومینە شیرێژو...لەنێو پادگانی بەبەرگی خۆیان بە لوّد ێری وەبنگڵیان دا ون وبەرگی خۆیان لێ بۆتەکفن.

**کاسەکەران**:بە ئاوەڕۆو لاجانە بەلآم بەناوچە دەگەڵ پیرانانە.

**کەندەقولان**:مام شێخ (مام شێخ حەسەنی مەڕحوم) کە ئینسانێکی زۆرباش وبەئیمان بو زۆریش خزمەتی بەخەڵکی کرد، ئەگەر منداڵی جیرانەکانی ئەونێوەنێوەی نەخۆشی لەمەیی‌یان دەگرت،دەیانبردە کن مام شێخ حەسەنی وبۆی لێدەبرین و

چاکدەبونەوە.

**وەتماناوی**:مەرحوم کاک سەید برایمی حاجی سەید وەهابی کە ئینسانیکی زۆر موحتەرەم بوەو،ئەگەرمەرحومی بابم(( دەرویش رەحیم گوێرەش))دەیگوت ئەمن بۆخۆم کەرامەتم پێوەدیوەو ئەودەمەی ماڵمان لە زەنگیاوێ بووە.

**گەپلەسەن**:بنەماڵەی قورغچیان بەعام قسەخۆش وساحیب مەجلیس بونە. دەروێش عەولا قورغچی یەکەمریدی ماڵە حاجی شێخ سمایلی کانیکەوەی شاری شنویە و یەکەئاواڵ مریدودۆستی گیانی بابم بو.،خوای تەعالا دەگەڵیان بەرەحم بی ولێ یان خۆشبی.

**دربکە**:عەلی برام ئەگەر دەوڵەتی شای گۆرکراو، ئیعدامی کرد ماڵن لە دربکەی بو، ئەگەر.رۆژی بیست ونۆی خەرمانانی ساڵی هەزار وسێسەدو چل وحەوتی هەتاوی بە رۆژی جومعەی لەجێگای پازگای شومارە د وی ئێستا بەینی کۆنەخانێ وخانێ لەگەڵ سێ لاوی تێکۆشەری د یکەبەناوەکانی١ـ کاک حسین چلکۆچ٢ـ کاک حەمەسوڵتان ٣ـ کاک قادرەشەل، گوللەباران کران.

**هەبلەس**: لە هەبلەسیرا؟! راپۆرت لەئەو لاوانە درا.بەینی شە وو رۆژان لە پشت پادگانی و بەر کەلەکینیرا توشی شەری بون، هەتا ئێوارێ شەریانکرد ئاخریکەی دە قوچێ قەلاندا وبۆ شەوێ چونە ئالانی عێراقێ بۆنان وفیشەك ووسائیلی ولەوێ دیسان توشی شەری هاتن وبرایمی حەمەدی مام عەولای مەنشوربەبرایمی( دەلاوان) شەهیدکراو عەلی گوێرەش بەدوجێگابریندابووحوسین چل کۆچ حەمە سولتان قادرەشەلیش هەتادوا، فیشەك شەریان کرد وئەگەر،چیان پێ نەما ئەوجاربەدیل گیران ، دیارە ئەوە زۆردورو درێژە، ئینشائەللە دەداهاتودا زۆربەوردی و بەجوانی دەینوسمەوە.

**زەنگیاوێ**:لە ساڵی هەزارو سێ سەدوبیست ونۆی دا،دایکم لە زەنگیاوێ ئەمری حەقی بەجێ هێناوە، لە خزمەت ئەو( سەیدەی کە لە بناری کێوی سوفی بابەکری

شەهیدکرابو،لەگۆڕستانی زەنگیاویٚ نێژراوە، وخەڵک بۆنۆبەتێیان دەچنە سەری) بەخاکیٚ ئسپێردراوە.

**گردەبن**:لە سالی هزارو سیٚ سەدو سی و دوی رامالن چۆتە گردەبنی، لە زەنگیاویٚ کەلەخزمەت مەرحومی بابم و مەلا سەید سمایلی قورەیشی برێکم خوێندبو، لە گردەبنیش لەخزمەت خوالێخۆشبو مام وەستا مەلاقادری جێژنی چوار سالانم خوێندوە کە زۆربەباشی و بەوردی و رێك وپێکی دەگەلمان حەولی دەدا زۆر سپاسی دەکەم رەحمەتی بۆ دەنێرم، خوای تەعالا دەگەلیان بەرحم بێت ئینشاواللەوتەعالا.

مرێەمی دایکی دوهەمم لەگەلٚ خوشکێکم بە نیوی حەلیم و برایەکی چوکەشم بە نیوی حاسلٚ لە گردەبنی مردون وپوررابی نەنکم وخالی بابم بەنیوی وەستا رەسولٚ وەستا وسوی لەگردەبنی مردون و گلکوی هەموانیان لەچاکی گولانەکەوتۆتەپێش مالی سنجەلیٚ، هەتابەهاری سی وهەشت کە چوینەتە دربکەی، تەمەنی تازەلاویم لەویٚ تێپەر کردوە،دومالە مامیشم بە نێوەکانی١ـ مەرحوم مستەفا بارامی(مازان) ٢ـ مەرحوم دەروێش ئەحمەد بارامی لەویٚ بون، کە ئێستاش بنەمالەو کورەکانیان هەر لەویٚ ماون.

سالی چل و چوار مالم چۆتەوە گردەبنی و ژن و مندالم هەبون،

جارێکیش لە سالی هەزارو سیٚ سەدو شێستی هەتاوی مالم چۆتەوە گردەبنی.

**خورینج**:دیارە شێعرم بۆ داناوە لێرە هیچیدی باسی ناکەم.

**سەرشاخان**:چونکە جستانان کەمێك بەفری زیاتر لیٚ دەباری دە دی چولکراون، هاوینان دەچن کاسبی و کشت و کالیان کۆدەکەنەوە ودینەوەخواریٚ.لەخواریٚ خوشتریان بۆ دەگوزەریٚ ؟؟گەرمێن، کوێستانیٚ دەکەن رەنگ بیٚ وەختێکی بگەرێنەوەویٚ.

**حاجی غەڵدە**:بە مندالی سالێکیش مالن لەویٚ بوە .

**لگبن**:بەراستی بو ئێمەبەلابو رۆژ نەبورئیس پاسگا، نەنبابۆ پاسگای و ئەگەر دەشیبرد ین هەتا پشون دەهات لێیدەداین دیگوت ئەنگۆدێمۆکراتن. مام ئەحمەدم لێدانی رئیس پاسگای پێوەنوسا،چاك نەبووە، سالی پەنجاویەکی لەنەخۆشخانەی،

نەغەدەی عەمەلیشیان کرد چاك هەرنەبۆوە هەتابەنەخۆشی لێدانی رئیس پاسگای، ئەمری حەقی بەجێ هێناوگیانی خۆێ فیدای کورد وکوردوستانی کرد. ڕوحی شادبێ.

**هومام و بایزبەگ** ،دو هەوارگەی ماسوەیانن.

**تۆبزاوێ**:مام کاکەڵڵا،کە ئاغاومالی لەتۆبزاوێ بووبە،مام کاکەڵڵای تۆبزاوێ نێوبانگی دەرکردبو،ئینسانێکی زۆرزانا قسە خۆش وقسەدروست بو.

**بەلەبان**:وەختێك لەپەی بەلەبانێ بەنێوبانگ بو، قامێك هەبو دەیانگوت؟ دەگەلێ لێوئالی دەکولم وەك لەپەی بەلەبانێ.

**کێلی**:توتنی بێشەمای، کێلی بەنێوبانگ بوەبەلام وابزانم کێلیوبابەکراوێی سەرشاخان بوە نەك کێلێ وبەلەبانی خوارێ .

**کوندرێ**:سولەیمان کەرقەشان، کە ئەویش یەکێك بولەئەو ئینسانەبەغیرەت و ئازایانە، ئەگەرشای خاین، لەپادگانی جەلدیانێ ئیعدامی کرد، خەلکی کوندرێ بو.

**گردکسپیان**: دۆستالی مالی لە گردکسپیان بوە زەمانی ئاغایان کە خەلك بەهاران مالی لەئەودێیەی بۆئەودییەی دی دەڕویشت،کابرایەك دەچێتە گردکسپیان بۆ دلخۆشێ توشی دۆستالی دەبی ودۆستالی دەلێ چۆنە هاتویە ئێرە.،

کابرا دەلی هاتوم بۆدلخۆشێ. دۆستالی دەلی مەیەئێرە. ؟ئێرەگوڕە !

دۆستالی عەجم بووەوزمانی بۆکوردێ ڕانەهاتوەوبەقوڕیێ گوتوە گوڕ؟ ئاغائەوقسەی دەزانێتەوە،ولەدوای دۆستالی دەنێریت:دۆستالی ! ئەگەرخەلك د ێتەئێرە بۆدلخۆشێ، دەلەی مەیە ئێرە.گوڕە ؟

دۆستالی قسەی خوی دەناسێتەوە، زۆر تێکدەچیت، بەلام دیسان تائەندازەیەك خۆی نەدۆڕاندوەوگوتویەتی ئاغا دەلێم گوڕە ! تاو هەلدی،ئیشکە ؟دا، !

**گردکشانەوئەندێزی**:پاش دروست کردنێ ئەوپادگانەی کەوتۆنەتەسەرڕێیە.

**کولیچ**:دەروێش برایم مرادی، ئێستا نابینایە، هەتا بچینە کولیچی، سەری دەدەین

وئەحوالْی دەپرسین

( شێخ) مەنزورم لە(پیری تەریقەتە) پیری دەستگیر(ق) بوەو،لێرەنوسراوە،؟

**بەربنــــە**.بـــارزین هەوارگەوریگایـــەکی بەنێوبانگەلەکوێســـتانەکانی دەبەربنـــەی

کاك موحەمەممەدی مـاملێ گۆرانیـەکی بـەنێوی ڕاوچیـان بەئـەوجورەی خوارەوەگوتـوەو

بەندێکیشی بەبارزینی هەلاگوتوە،

ڕاوچیـــان ڕاوە،ئــەی چ ڕاوەئـــەی ڕاولـەدەشـتی لاجـانێ
ئەسپان زین کـەن،ئـەی لـغـاوان.تـاژیلان بـەرنـەسەرلانێ
ئەی سەفێسواران چەندجوانن،ئەی لەبەرمالْی مـاشکانێ

❋ ❋ ❋

ڕاوچیان ڕاوەئـەی چ ڕاوە،ئـەی ڕاولەبنەی بەردی گوێزێ
ئـەسپـان زین کـەن ئـەی لـغـاوان تاژیلان بـەرنـەدەرێزێ
چـاوی سـەرم بـەرڕاوچـی ئـەی لـیـێ بستـیـێـنـن پارێزێ

❋ ❋ ❋

ڕاوچـیـان ڕاوەئـــەی چ ڕاوە،ئـەی ڕاولـەسـەری بـارزینی
ئـەسپان زیـن کەن ئـەی لغاوان،ئـەی خـۆبـاوێنەسەرزینی
جاوەرن سەیرێ تاژیان کەن،ئەی لەگەلْ کەروێشکەشینی

❋ ❋ ❋

لەسێلْوێش ئەورِوداوەدلْتەزێنەڕوی داوەو؟

لەسالْـەکانی پێشودا، پەنجاوچوار سالْ لـــەوەپێش یابلْـەین لـەئاخری سـالْی هـەزارو سێسەت وبیست پێنجـی هـەتاوی ،تـاقمێك چەکدارلـەدیوەخانی ئاغاکـانی سێلْـوێ وەژور دەکەون پاش چەند دەقیقەیەك ئەوئاغاونۆکەرانەی دەوەتاغێدابون وەبەر تفەنگانیاندان. نیزیکـەی حـەفدە هـەژدە کەسیان بەئاغاونۆکـەر،ویـان خانـەخوێوە کوشـتن و مـــەیتیان بەسەریەکدا ئێخستن، بۆخۆشیان دەنێو کەلاکەکاندا دەستیان بەنان وچا خواردنێ کـرد، پاشـــان لێیـانـدا ڕۆیشـتن دیارەئەوکارەسـاتە پـاش تێشـکانی دێمۆکراتـــی ودەســت

بەسەرداگرتنی کورد وستانی لەلا یەن حکومەتی ناوەندیٚ ویالەکاتی بیٚ سەرەو بەرەیەولاٚتی داڕوی داوە.

**خالٚدار:**هەرلەقەدیمەوە دەلٚێن:سەیدان شالٚکەسکە، خالٚدارە گێتی، چل مالٚی ماوەت عێراقە گێتی.

**بەردەقەل:**نیزێکەی سی سالٚ لەوەی پیش لە بەردەقەلی کەم مالٚی واهەبو حاجیان نەبیت مالٚی وا هەبو دوکەسی چوبونە حەجیٚ.

**زێدان:**لەئەو نێوەی زێدان وەك خۆی ماوەتەوەو زیاد نەبوە.

**ئێمناباد:**دەپێش ئەوەیدابرینج هێندە زۆربیت، خواردنی خەلٚکی کوردستانی بە زۆری برینجی گردەبوە چونکەبرینجی سەدری تەنیاجێژنان ئەگەروەدەست کەوتبا ئەویش لەتاق تاق مالاٚن دەناخۆکەس نەیدەدی،جالەبەرئەوهۆییەی لە زۆر جێگایان وەکو جەڕان و ئێمنابادو سوغانلوی و زۆرجێگاوناوچەی دیکەش بەعام چەلٚتوك دەکرا.

**جەڕان:**جێی لەدایكبونی ڕوٚلەی ئازاوبەجەرگ،کاك مراد شیرێژیە،

**بادیناویٚ:**ماسی خۆمالٚی زۆر لێیەو ماسی پەروەریشی شی هەرزۆرن.

**ترکەش:**بنەمالەی حاجی سەید عەزیزی ترکەشی شێخی سەرچاوەیەکی خاوین و زورگەورەومیوان گروبەئیحتیڕام بونە.

**باوەلیٚ:**خالٚ سەید عەزیزی باوەلیٚ شێتان چاكدەکاتەوە، بە شولکان لێیاندەدات هەتا جندوکان هەلٚدەن، نێوی جندوکان لەکاغەزی دەنوسی وکاغەزەکەی دەسوتێنیت و شێت چاك دەبنەوە.

**مالٚی سۆفیان:**دێیەکە ،ئێستالەبەرسەختی ڕێگایەوسەرمایە،زستانان، ؟؟چوٚلە.

**نەلٚسێن:**لە نەلێنیٚ مەنگوڕان تیٚپەڕی دەگەیە نەلێنیٚ فەقیٚیەسێان.

**کانی‌سێو:**ئەسحابەی بارەبیە بەرانبەربەمالٚی کانی‌سێوی بۆخۆی دەخەویٚ مەڕحوم مام وەستا مەلا عەولاٚی کێلەسیپان هاتوەوگوتویەتی ئەمن نێوم ئەسحابەیوٚسفەجێگام لە

لەشکری فەخری کائینات بوە، فەقێ هەتا ڕێگات دەئەولایە کەوت وەرە نویژم لە سەر بکەو قورئانیشم بۆ بخوێنەئەوکاتەی مام وەستامەلا عەولاّ موستەعیدبوەوخوێندویەتی.

**هەنگەوێ**:مەلاحوسێنی عەبدوڵلاّزادە گورانیەکی بەئەوجورەی خوارەوە بە هەنگەوێ هەلاّگوتوە:

ئاوەدان بێ هەنگەوێ باریکێ شل و شەوێ
هەرچی لێی دەردەکەوێ شل دەبەستن پشتێنێ
لێم حەرام دەکەن خەو
ئۆف خرینگەخرینگەخرینگەخرینگەی بازنەکەی
ئەرێ دەستم نەبردوەدەنابۆشەمامەکەی
چاوت ئەستێرەی شەوێ کوڵمەت دندوکی کەوێ
باسکم بۆبکەبەسەرین بەجوت خەومان لێبکەوێ
هەرکەس ئە تۆی لەمن کرد دەك ڕەبی کوستی کەوێ
ئۆف خرینگە خرینگە خرینگەی بازنەکێ؛
ئەرێدەستم نەبردوەدەنابوشەمامەکەی

❋ ❋ ❋

**میشەدێ**:گۆرانیبێژ کاك محەممەدی ماملێ ومەلاحوسێن عەبدوڵلاّزادە، گورانێکیان بەئەوجورەی خوارەوە بەبەسێ هەلاّگوتوە؛دەڵێن بەسێ خەڵکی میشەدێ بووەو بەبەسێ ئەحمەدەرەپەی نێوبانگی دەرکردوە:

هەی بەسێ عەمرم بەسێ،دوت کوشتون مەیکە بە سێ
جا بەسێ لەبەر بێلاّیە ئەرێ جوانە تەشی دەرێسێ
هەرکەس وەك من بی بینێ دەنا شێت دەبێ ودەعەبەسێ
خۆ دڵم بە تۆوە شادە، ڕوت بێنە زولفت لادە

هەرکەس وەك من نەسوتێ تا ملانی بە قوڕیدادا
کە کوتیان نەخۆشە لەیلا دەنا وەك شێت بەسەرخۆمدادا
دەی سەری خۆم هەڵگرت ڕوییم وەڵلا هەی بە کێو و بە سەحراڕادا
هەی بەسێ عەمرم بەسێ، جا بەسێ بە من ڕازییە
ئەو بەسییەی من دەڵەم ئەری د و بسك و چل کەزییە
جابەسێ لەبەربێلآیەجوانەقەت حەنتیکەی وانیە
بۆ من حەزرەتی خدرم عومرێکی تولانیم بێ
لێقەوماوو فەقیرم هیچ کەس بە دەستەم نەبێ
هات ڕابرد گەردنێ بەخاڵ یارەبی بەچا وەنەبێ
شەش دانگ موڵکی موکریان ئەرێ قوربانی چا وێکی بێ
هەی بەسێ عەمرم بەسێ د وت کوشتون مەیکە بە سێ
جا بەسێ لەبەر بیلآیە دەنا پۆپەشمینەی دە ڕ ێسێ \
هەرکەس وەك من بی بینێ ئەرێ شێت دەبێو دەعەبەسێ

❋ ❋ ❋

**باستانبەگ**:جێگای حوکمڕەوایی باپیرئاغای حەمزە ئاغای مەنگوڕبووەکەبەهەمزائاغای سەربڕاو نێوبانگی دەرکردوە کە ئەوەش حیکایەت و داستانێکی دورودرێژوبەیتی هەیەئەمن نازانم بەیتەکەی کێ گوتویەتی وچۆنە بەڵام بەیتی باپیرئاغای مەنگور دە توحفەی موزەفەرییەی مام وەستاهێمنیدایە.

**کەرمندار**:خوالێ خۆش بومەلاڕەسولی کەرمنداری پیاوێکی زۆرگەورەوبەرچاوولە ڕێگای عیلمدازۆرزانابووە،ئێستاش خەڵکەکە هەر باسی دەکەن:مەلا ڕەسول فلآنە شەرعەی ئاواکردوەو.فلآنەبڕیارەی ئاواداوەو.زوربەی خەڵکی لەنێومەنگوڕان سوێندێ

هەربەسەری مەلاڕەسوڵی کەرمنداری یابەقورئانەکەی مەلاڕەسوڵی کەرمنداری دەخۆن .

* * *

( **بازرگان** )ماملێ گۆرانێکی بە زێڕنۆکی بازرگانی هەڵگوتوە بەئەوجورەی خوارێ ئەگەردەیخوێن نەوە٠

خــۆم قاســیدی زێڕنۆکێــم، وەرەئــەی ســبحەی دەڕۆم بــەیانی
کاڵـوکێ خـۆم دەپـێ کـەم، جوانـی! هـەر بـە تۆفیقـێ سـوبحانی
خـۆ دەڵـێم بێنـە مــاچت کـەم، ئـەی زێڕنۆکـێ بازرگــانی
خــۆم قاســیدی زێرنۆکێــم ئــەی دەڕۆم دەچمەخۆشــناوان
دەچمــەکن زێرێــن گــەری ئــەی دەســك دەکــەم دراوان
ئــاخ وەبــەرزێڕنۆکی دەخــەم ئــەی بەڵکوهــەڵبێ نــێ چــاوان
خــۆم قاســیدی زێــڕ نۆکێــم ئــەی دەڕۆم دەچمــەزێباری
دەچمــەکن وەســتاکاران ئــەی بــوم د روســت بکــاگواری
ئــای وەبــەر زێڕنۆکیــی دەخــەم جــا بێتــەدەرکێ حەســاری
خــۆم قاســیدی زێڕنۆکێــم ئــەی دەڕوم ســبحەی ســەحەری
کاڵـوکێ خـۆم دەپیـێ کـرد حـەیات ئـەی لـە خـۆم شـەتدا کـودەری
دەچمە کن بـابی زێڕنـێ جوانـێ خـۆ حـەوت سـاڵان بـە نۆکـەری
جـا لەبـەر خـاتری زێڕنۆکـێ ئـەی بەڵـکو ڕوحمیـم پێبـەری

* * *

**گەدە**:وەختێکی هەوارگە بوەو چادر و چیغ ومەڕومالات ڕەوەوگاو،گۆل و گاڕانی لێبونە ئاوەدانی یان ماڵێ لێ نەبوە؟



وێنەیەکی تەواولەکاك عەلی گوێڕەشی سالّی هەزار و سێ سەد و چل وشەشی هەتاوی لەبەندیخانەی ورمێ

## بەهاری کوردستان

تایبەتی چاك و پیرو هەوارگەو کوێستانەکانی پیرانشاری

(بەشێعرگوتراو ە)

چاوهەڵێنە بەئەو بەڵێنە دیمەنی جوانی بەهار
تێر ببینە چەند شیرینە دەشت و کێوانی بەهار
شاخ و پێدەشت وتەلانن زێدەکەی ڕەنگینەکەم
کۆلکەزێرینەن لە لاپاڵان گوڵ و بۆانی بەهار
دەنگی بولبول د ێن لە سەرچڵ تێکەڵاوی سەقرو باز
باللورەی کێلگەردنانە مزگێنی و ڕەوانی بەهار
کوردستانە چاوەڕوانە ئاوی کوێستانێان دەوێ
ئەی خودایە کەی ڕەوایە بێبەشی خوانی بەهار
دەشتی پیران نێوی شارت چۆن لەخۆ شت داودەڵەێ
کەوتمە بەینی وا بە عەینی کێوو ئاوانی بەهار
شێخ شەروو شێخ ئایشن دەگرن سنور و سەرحەدان
بۆتە ڕێگا ڕۆژ و شەو و تا پاشی شێوانی بەهار
پڕ بە دڵ بڕوانە دۆڵە نیە و سەری قەندیل بڵێ
تاکو ئاجی برایم و سەکران[1] ڕێز و هەیوانی بەهار
باری دو د ێری بە سەر مێرگان و ئەشکەوتێ سێکۆ

---

١ ـ حەساری سەکران لە ئاجی برایمیە.

دەروی گوێزان شاخە ڕوخاو زێدە پاروانی بەهار
تا شەمەکورتان و قەبرەستان یا قوچێ قەلان
گۆمەشینە[1] جوان ببینە تەرزی سیروانی بەهار
ناز اواو کانیڕەشن وا بێبەشن بۆ ملکەوار
گابەڵەك مۆڵێ هەباساغانە زیزبوانی بەهار
مانگی جۆزەردان بەری مێرگان لە کاملاوە بڕوۆی
مەستی بێمەی خۆشەوەك ڕەی شەوگەڕو وژوانی بەهار
تاڵەگەزتوو[2] چاکی زینوێ بیانە جێێ ڕاز و نیاز
جا بۆ قەبری حوسێنی غازی ڕێگەپێوانی بەهار
تۆمەوارگەی کانێزەرد جێێ ٣ داخ ودەردحاشارگەیەك
ڕاگری پیاوی بەجەرگ ئەو جوتە میوانی بەهار
بۆ دەبوو وا بێبزە و بێڕوحم و ویژدانبی نەکەی
لاگری ڕێگە و مەڕام و دابی پێشوانی بەهار
جێ هەوارشێخان و بادەڵ قەپ قەپی و بەردەڕەشان
گۆڕە دێمە و کاسەبەردینەن لە گوێسوانی بەهار
بابەسەن کوترەل دەچێتە تاتی د وێ بۆڕاوەکەو
خۆ لە دوڵ ڕیواس و بەردستێنە هەموانی بەهار
جوان بنۆڕی ئەوهۆارگەی مێرگژان بێ برك وژان
یانەئاوی سپی و لەئاغاسەرشەوزوانی بەهار

١ـ سەری گۆمێ ٢ـ چا کی تاڵەگەزەی٣ـ جێگای شەهیدبۆنێ شەهیدمرالشیرێژیە

کــەوڵ و ترشــینان و د وێــرە باسکەشــین و بانــەپی
کــانی ئــاجی مــەند و شــەرگە، د وڵ بــەهاروانی بــەهار
تیخــزاوە مێگــەل و چــون هــەڵدراوە چــادر و چیــغ
بێیــەوە خــەرپاپ و زەویــان چــۆن دەڵــەی کوانــی بــەهار
تــا نــەڵێن بــو زۆر بــەڵێن بــو گورگــەمێش بــا هــەر ببــا
نەعرەتــەی هــەوری دەرەش بــێ ونمنــەمی جوانــی بــەهار
خــۆش و بژوێنــە گــەدە و کوێســتانەکانی کــانیزەرد
وەك ســەری لــەندانی شــێخان چەشــنی شــیروانی بــەهار
کــارگی لــەندی بابــەرۆ بێژینــگ بەسەررێواســەکەت
خۆشــەوەك لــۆرك وپــەنیری مەنجــەڵ ئــەخوانی بــەهار[1]
جــێ هــەواری کوێرکــی پــەرژینان و زەنگــی[2] و هوڵــەمار
وەك هــەوار ورچــان و مانگــا زێــر و زێوانــی بــەهار
گردبــەران و قــاقڕ و ڕۆبیــان و تــا گۆڕکــی قــەلات
زینــوی شینکان بێتــە ســەرلێر چینچێنۆکوانــی بــەهار
کــانی شــێخی چــەورە بــی موڵــێ بــەرانان تــەختگاە
وەك دەروی ڕۆســتەم بمێــنێ مــۆر لــە کــەیوانی بــەهار
خۆشــە ماســتاوێك بــە ئــاوی کانیــە ســپێ کەیتورگــەنی
پــڕ لــە ڕیحانــە و شــویت بــێ و شــینە قــەزوانی بــەهار
د وڵــەرەش مزگەوتــە ڕژدە تــا بڵێنــد کــانی مــەلا

---

١- ئاخوران ٢-بەردی زەنگی

بچیە ئەشکەوتی دەرو ئەزە بازو بەروانی بەهار
مامەش و لاجان بە بونی شەخسی زاواکێو دەڵێن
خانەخوی زۆر چاك و پیرین جوان کە بروانیٚ بەهار
چاکی جینگەجینگەی دەمێکەوەك پەنایەبۆتەخۆش
گوێزی پیرساڵیش دوایین مانگ و یا دوانی بەهار
بێیە سەر ئەسحابە خوێپێش سنجەڵیٚ زو پێتدەڵیٚ
چاکی کانی گلاڵنە وەك گلٚ خاسە لیٚ روانی بەهار
نێوو کاتی میوەکانی دایە شێخیت پیٚ بلێیم
پایزان دردوك و گێوژ تاڵەسێوانی بەهار
سەیدی زەنگیاوی کەخەڵکی دەچنە سەربۆ تاوولەرز
یا لە بەرکەمران مرادن بۆ مراد روانی[1] بەهار
د ینە ئەو شەخسانە داواکاری ئەو لاد یك دەبن
کچ بیٚ بێری وکورِ مراد حاسلٚ ورەسو شوانی بەهار
خزمەتی ئەسحابە یوسف باری بییٚ لیٚ بوتە جیٚ
چاکی ترشی و کابۆرە جارجار لەبیرچوانی بەهار
خو لە زاواخانی د یارە مەرقەدی پیاوچاکەکان
چل شەهیدانی شەهید چاکی بەری توانی بەهار
جی نزاو سەیرانە چوارشەمانە چاکی شێخ رەشی
رەش بەڵەك بیٚ نێوبری و رێبوار و گاوانی بەهار
بەرینە وەك خوٚم ونە کوا گوٚمەشینت د یتەجیٚ

[1]ـ مراد رەوان، مراد رەسول، مراد حاسل، بیری و شوان

یانە هەر وەعدە وەعیدە و چاوەڕێی خوانی بەهار
هەر لە کانیخوای هەتا کوێستانەکانی سامڕەند
لێدەدەن شمشاڵ بە دایم زۆر بە سۆز شوانی بەهار
تاتی کاران بچیە دەستارە و بەرە و قوچێ قەلان
خۆشە بارزین جێ هەوار و ڕاوی پیاوانی بەهار
بۆ بە گۆرانگێ دەڵەیی بێخێرە یانە چەق چەقە
سەقرو دوڵ مەیدان و هەلگورد و دە راوانی بەهار
خەرگەداشان د وڵەزەنگ کوێستانەکانی کوڵبەسەر
جا بڵەئی تیغە دەرێ و سێچۆم تۆ چوزوانی بەهار
خۆ گڵەزەردان سپیڕێز سەربەزێر و کەندەشین
کوانی بایزبەگ خەلەك ئان [1]چۆن پەشیوانی بەهار
تاڵەجاران هیزەڕۆنان کانیەکەی میرلەنگەری
تا سەری سۆلتان و بنرەش مێرگەچەکوانی [2]بەهار
بۆ پەرێشان ڕەنگ و بۆنی زۆر بەهاری دیشیبێ
تۆزێ ماتەم نارەوێتی د یارە ناتوانێ بەهار

١ـخەلەکان ٢ـمێرگەچکۆ

## شێعرێکی ئاشقانە

کیژەجوانەکـەی قەدشمشـالەکەم بسـك ئاوریشـمەی ڕوبەخاڵـەکەم
دڵ ڕفێنەکـەی چـاو کەژاڵـەکەم چـرای ڕونـاکی مـاڵ و حاڵـەکەم
هـێزی هـەڵفڕینی بـۆ شاباڵـەکەم

بسـکت تەنافـە و بـەژنت سـێدارە چا ویشت بە قـازی دانـدرا دێـارە
بە گۆشـەی هـەروا کـردت ئیشـارە جـەرگم بە تـیری موژەت بـو پـارە
یـان لـە هیجرانـت دەبـێ ناڵـە کـەم

چـرای ژیـانمت لێ کوژاندمـەوە ئـاگری ئـەوینت لێ گەشـاندمەوە
برینـەکانمت بـۆ کولاندمـەوە تـورای وهـەروانـەشـت دوانـدمەوە
هـاتی وتیکـتدان ئیکجـی ماڵـەکەم

ئەوئاشـقانەیێ بـۆت،دەریـەدەربون وەکومەجنونی شێت وشیدات بـون
داوەو ئەوینـەو،بـوت ئاڵقـە کـردون دەزانم بـەڵێ چـەندت لێ کوشـتون
وە ئەستوم دەگـرم سـەد ئوباڵەکـەم

ئـەو کیـژە کـوردە ئـەو باڵابـەرزە شـەیدای ئەرلـەنجەوئەونازوغەمزە
ئـەوەی تـۆ دەڵێـێ بـەو تـوو تـەرزە ئـەوەش بزانـە لـە سـەرئەو ئـەرزە
ڕونـاکی د وارۆژ ژینـە تاڵـەکەم

ئێستاش خـۆ مـەیلی جـارانم مـاوە بـۆ ڕێبازەکـەت سـەرم دانـاوە
بـۆ هـەرد وکمانـە ئـەو داوو ڕاوە پەرێشـان کـەوتوم کـارم کـراوە
دارمـاڵ لەعیشـقت دڵ عەبداڵـەکەم

* * *

## هەم ئاشقانە و هەم عارفانە

ڕەنگی زەرد و ئـاهی سـەرد و هێمـی پڕتینـت دەوێ
د یدە پـڕ ئاو ڕەنگی گوڕاووجـەرگی پڕخوێنـت دەوێ
بەرهـەمی من وا لـە مـاوەی عومـری بێحاسـڵ وەکـو
بـاغی بێبـەر مـاڵی بێ هــەر دەرك و پـەریژینت دەوێ
مـن کـە ڕوتم، وێڵـی ڕوتم تـو بـە عیشـقە پاکەکـەت
بیـێ لـە فــەریام ڕو لـە بریـام ژیـانی شـیرینت دەوێ
بـۆت پەرۆشـم بیرو هۆشم چـو لــە پێنـاوی و دەڵێـێ
خۆشـەوێڵبون تــەرزی مـەجنون کێووهــەردینت دەوێ
غـەرقی دڵ خوێــن ولــەڕوم دێـن وبـەزۆری پێمدەڵێـن
باش بزانــەو ڕیـی ئەوانـەی سـین١ بێ بۆ شینت دەوێ
دورە ڕێگاودیارە جێگـا چـۆڵ و هوڵــە و پرلـە خـۆف
شـوێنی خاسـان زۆر بــە هاسـان بگرەگـەردینت دەوێ
مـن کـە پـیرم کوانـــی بـیرم بـەو هـەمو دەردو خەمـە
کەوتمـە نیـو بـیر بومـە یەخسـیرکۆت و زنجـیرت دەوێ
خـۆم پەرێشـان دورلـە خوێشـان بەودڵـەی پـڕ ماتــەمم
بــەش‌براوم و.وا دوڕاوم چــاو بــــە ئەسـرینت دەوێ

١-ئیشارەیە.بۆمەوزوغی شێخ محێ دینی عەڕەبی؟

✻ ✻ ✻

## سوڵتان مەحمود ی غەزنەوی وجوتێر

سوڵتان مەحمود ڕۆژێکی،دەگەڵ گەورەگەورەکان دەچوو ڕاوێ وەختێکی وەدەرکەوتن وله دەری شاری ولەقەراغ ڕێگایە،پیاوێکی پیروبەسالاچو.جوتی دەکرد،سوڵتان لای‌داکن ئەم مامەپیرەی ؟

وەزیرونـاییبیش هەمولەدەورەیان کۆبونەوەو،سوڵتان دەگەڵ مامی پیر ئاوای دەست بەقسان کرد ؟

:مامی پیر بۆ زوجوتت نەکردوە ؟مامی پیر؟ :زوم جوت کردوەخودا نەی‌داوە.

سوڵتان:ئەدی مامی پیردەگەڵ دوان چونی،مامی پیر:دوم لێبون بەسێ ،

سوڵتان:باشەمامی پیر.دورت چۆنن ،مامی پیر:لیم نیزێکبونەتەوە،

سوڵتان:زۆرچاکە ئەدی مامی پیر؟خزمەکانت چۆنن؟مامی پیر:خزمەکانیشم شاڵ واڵ بونە وئەگەرسوڵتان لەئەوپرسیاروڵامانەخەلاس بو دەڵێ !جامامی پێرباپێت بلێم، ئەگەر؟

مامی پیریش دەڵێ جا قوربان،بەخوای مەگەر؟!

سوڵتـان ڕاوی بـەتاڵ کـرد وگـەڕاوەبۆ مـاڵێ و، ڕوی دە وەزیـر و نایبـان کـرد، پێـی گوتن؟وت وێژی من دەگەڵ مامی پیر چ بوە ؟ چم لێ پرسی؟ ئەو چی ولام داومەوە ؟

زۆریان حەولدا هەمویان بۆنەچۆوە سەرێك. سوڵتانیش هەڕەشەی لێ کـردن، گوتـی ئەگەر نەیزانن واواو لێدەکەم؟

ناچار بون چەندکەسیان چون بۆلای مامی پیرو،بەتـەواوی ڕازیـانکرد،ئـەویش ئـاوای حالی کردن .

پرسیار:بۆ زو ژنت نەهیناوە ؟خوا کوڕی دابایەی کاری بۆکردبـای ئەتۆحەسابایەوەو لەکۆڵ کوێرەوەرێی کردبایەوە ؟

ولام :زوم ژن هیناوە خوا کوڕی نەداومەتێ.

سوڵتان: ئەدی لاقت چۆنن؟مامی پیر :بێ هێز بونە بەگوچانی نەبێ ناتوانم بڕوم.

ئەدی چاوەکانت چۆنن؟مامی پیر:لەنبزیکەوەنەبی هیچ نابینم،سوڵتان:

ئەدی ددانەکانت؟ مامی پیر:ددانەکانیشم دەنکدەنك نەبی نەماون،ئەوانیش کرمۆڵ بونە.
:ئەگەر پیاوەکانی من بێن ولێت بپرسن پییان بڵەی لێت نارەحەت دەبم ها!،
مامی پیر:جا بەخوای مەگەبەکەیفی خۆم رازیمکەن.
دوایە پاشا،گلەیی.لە مامی پیرکرد:نەمگوت ئەگەر پییانبلێی لێت نارەحەت دەبم.
مامی پیردەڵێ ئەدی قوربان عەرزم نەکردی مەگەبە کەیفی خۆم رازیمکەن،
ئەوانیش تەواو رازیان کردوم، جائەوجار پێمگوتون،
سوڵتان مەحمودغەزنەوی برێك پێکەنی و پێیخۆشبو ئەو بەزم و رەزمە.

## سوڵتان مەحمودی غەزنەوی دەگەڵ جوتیری ((شێعرەکەی))

شا سوڵتان مەحمود رۆژێك دەچۆڕاو  
لـــەگەڵ کومـــەڵێك لـــە زانـــا و پێکـــراو

لــە قــەراغ رێگــا جوتــێرێکی پــیر  
زە وی دەکێــلا، چــوّو لای پــیری ژیــر

لەگەڵ ئەومامەی دەستی کردبەقسان  
دە ورە یـــاندابون وەکـــو بەرپرســـان

بۆ زوت نـەکێلا زە ویەکـەت بـەڵکو  
وەکو ئـەو خـەڵکـە ی بـت بـا بـەرو بـو

خۆ زوم کێلاوە هـەر خوا نـە یـداوە  
د واکـەوتوم چ بکـەم کوڵـــەم کوتـراوە

داخوا د وت چونـن وەك جاران مـاون  
هــەروا بــە گـرو هــیز یـاخو چـەماون

د وم لێبون بە سێ وەختە ببنە چوار  
خللـوّردە بمــە وە دەروّم بــەرە و خــوار

لـەگەل دور چۆنـی؟ پیم بڵـێ خاڵـە  
نــــیزیك بونــــەوەخۆ لــــەمیژساڵە

خزمـەکانت چـۆن جێگایـان چۆنـە؟  
شــاڵ واڵ جێگــاش کــەلاوّە کوّنـــە

نارەحـەت دەبم مـامی پـیر ئەگــەر  
پاشـام خاترجـەم، بـەخوای جامەگـەر

ئەسپی بـاداوە و راوی کـرد بـەتاڵ  
هەموبەکومـەڵ هاتنـــە وە بـــۆو مـــاڵ

بـانگی کـرد کێهـە زوّر ئاگـادارە  
زیرەکـەو زانـا، راســت و وشـــیارە

حەفتەیـەك تـەواو موّڵـــەتو دەدەم  
ئـە م وت وێـژ ەم بـە بـێ زیـاد و کـەم

لێتـان دەپرسـم ئەگـەر نـەیزانن  
بەرپرســــی دوّاڕوّژ ئێـــوە خۆتـــانن

چەندی حەولیان‌دا بیریان کردەوە بە کۆمەڵ، تەنیا،بەگروگردەوە
هەمویان وێگرا بۆ نەچۆوە سەر حەتمەن هەردەبو بیکەن چارەسەر
هەڵیان‌بژاردن سێ چوار کەسی ژیر ناعیلاج بون چون بۆ لای مامی پیر
:هاتوین پێ‌بڵێی ئەو گوفت وگۆیە لەگەڵ سوڵتانی، چاومان لە تۆیە
:هەر ئاوا هاسان مەسئەلەو دەوێ کواخۆبۆ هیچکەس وا هەڵناکەوێ
:چەندی لێت بوێین زێڕو پولۆ ماڵ د تدەینێ تەواو بە دڵ لێت حەلاڵ
پاروی چاك داگرت تێشی‌گەیاندن ئەو ترس و لەرزەی لە دڵ پەڕاندن
هەموی لە دە وری خۆی کۆکردنەوە ئاوا بە ووردی بۆی شی‌کردنەوە
:بۆ ژنت نەهینا کوڕت کار بکا لەو ماندوبونەت تۆ ڕزگار بکا
:زوم ژن هیناوە خوا کوڕی نەداوە بویە دەمبینی کەوتومە دواوە
لاقەکەت چونن؟ کوا هێزیان ماوە؟ بە گوچان دەڕوم، قاچم چەماوە
چاوەکەت چۆنن؟ ئەرێ مام دەرویش خۆ هیچ نابینم تانەیهێننە پێش
دەی تۆ خوا چونن ددان و زارت جوانیان با بزانم ئاکام وکارت
ددانیش هەمو کەلوپەل بونە کەم ماون ئەویش بێ‌کەلك بونە
:نارەحەت دەبم حاڵیان‌کەی ئەگەر جا بە کەیفی خۆم ڕازیم‌کەن مەگەر
چونەخزمەت شای چەند کەسی زانا ولامیان نوسی و لە پێشیان دانا
هەر کە تێ‌فکری زانی چباسە بەوردیش پرسی ئەو باس و خواسە
ڕۆژێکی پاشا ئەو مامەی بانگ کرد ئاوا بە وردی گلی‌یەکەی لێ‌کرد
نەمگوت تێلدەچم،حاڵیان‌کەی ئەگەر نەمگوت جا تەواو ڕازیم‌کەن مەگەر
چەندی پێم‌خوش‌بولێم ئەستاندونە زۆر بەکا ڤەخۆش حاڵیم‌کردونە
پێی‌ناخۆش نەبوسوڵتان ئەو بەزمە زۆرجار د یترابوو ئەو جورە نەزمە

*** 

## مەولـەوی تاوەگۆزی

وادەگێڕنەوە شاعیری گەورەی کورد لەلایـەن حـاکمی وەختـەوە، گـیراوە ماوەیـەك بەتـەنێ لەبەندیخانـەیدا ماوەتـەوە،لەتـەنیایی زۆرعێجزبوەچونکـە پیـاو بەتـەنێ دە.دیوێکی دابی زیندانیش نەبی عاجز هەردەبێ،

ڕۆژێکی لـەناکاوکوردەیەکی دەگرن ودە حەپسییدەکەن، دەی بەنە لای مەولـەوی، ماموستا ئەگەر کابرای دەبەنە لای وی و دەشـزانێ کوردە تائەندازەیـەك پیـێ خوشحالْ دەبی چونکە ئـاودەنگی بۆپـەیدا دەبـێ : شـێعران کـە دەخوێـنێ تـەوە کـابرا ئـەوەخۆی بۆڕادەژێنێ، ماموستا ئەگەرچاوی بەکابرای کەوت ئەوە بە شێعر خویندنەوەکەی خۆی بۆ ڕادەژێنێ خوشحالْ تربووەلەباڵەخویداگوتی جگـەلەوەی ڕەفێقی بەندیخانەمە وادیارەلێشم حاڵیە چە.لەوەی خۆشترهەیەباحەپسیش بم چانیەڕەفیقێکی ئاوازانام هەیە،

مام وەستا ڕۆژێکی گوتی بابرێکی بدو ێنم بزانم چێ لێ هەڵناکەم ؟

بەئەوجورەی خوارەوە دواندی؟

:ئەرێ لالوئەتۆ چۆن لـەو شێعرانەی من حالی؟!کابرا :شێعر؟:شێعری چی؟!

مامۆستا ئەم شێعرانەی ئەیانخوێنمەوە!

ماموستا مەولـەوی ریشێکی درێژوجوانی هەبوە،

کابرا:من شێعرومێعر نازانم.

ماموستا:ئەی چۆنە وەختێ من شێعر ئەخوێنمەوە، تۆخۆت ئـەلارێ نیـوە و زۆریـش نارەحەتی. کابرا کەمێکی بیر لێکردەوەولەنەکاو.

:ئەها ! ئەوە ! بە خوای ڕاست ئێژی ؟:ئەوەئەزانی چیەبرا ،مام وەستائێژێ فەرمو، ئەوەئەگەر ویرەویر ئەکەیت و ریشت ئەجولێتەوە، هەروەکو سامرەکەی مالی خالۆم ئەچی و،ئەوم دێتەوەبیرو،بۆمالی خالۆم زۆربەپەرۆشم ؟فرمێسکی هاتنەخوارێ!

ماموستادەلێ کورەخۆتەوە بە نێریم لی حالیە.

***

## مەولەوی تاوەگۆزی ( شێعرەکەی)

ماموستای شاعیر، مەولەوی زانا   لە تاوەگۆزێ بناغەی دانا
لە لایەن حاکم؟پاشای زەمانە   گرتیان و بردیان بۆ بەندیخانە
دەمێک لە بەندێ تەنیا مایەوە   برینی جەرگی زۆر دەکولایەوە
وا بە تۆهمەتی پڕ و پاگەندە   مایەوەبێ قسەهەر وا لەوبەندە
دۆست وڕەفیق و یارو هاودەمی   خوێندنەوەی شێعری پڕلە ماتەمی
لەوڕۆژەی بڵەی چەندلەخۆشی دور   خستیانەپاڵی کوردەی شارەزور
بەندی خۆبوکەس ناکرێ بڵەی خۆشە   جێی خەفەتباریەودەردوپەرۆشە
چون زۆری چێشتبو دەردی تەنیایی   هاتنی ئەو پیاوەی بۆ بوبە شایی
ما وەیەک ئەودوە، ویگرا مانەوە   ماموستا شێعری کە خویندبانەوە
هەر ئی خۆی بایا،هەرچی خوێندباوە   ئی پێشوی بایان، تازەی داناوە
ئەو فەقیرەش وا، دەستی پێ دەکرد   ڕادەژا وهێند خوی،بێتاقەت دەکرد
لەبەر پەرۆشی و،زۆر خەفەتباری   زۆرجار فرمێسکی، لە چاو دەباری
لەبەر خۆیەوە، مەولەوی دەڵێ   دەست بەسەربەندین، زیندانین بەڵێ
هاوڕێی زانایان لە بەندێدابون   نەک لە نیو نەزان، لەخۆشیدا بون
جیا لەوەی هاوڕێی،بەندیخانەمە   زانای بەڕاستی،ئەو سوتانەمە
هەستی دەرونم کوا کێ دەتوانێ   وەک ئەو هاوڕێیەم،تێبگا و بزانێ
ئەوجار بەخۆی گوت با بڕێکی بدوێنم   بزانم شتێکی،لێ هەڵدەکرێنم
ڕێشی ماموستای لە پاکی و جوانی   شیرن بو بە دڵ، هەر لێی بڕوانی
لێیپرسی لالو تو ئەو شێعرانە   پێت چونن، دادەی لێ یان بڕوانە
شێعری چی؟! خۆ من شێعر نازانم   ئەی من هەر ئەیڵێم، نەخێر نازانم

بەم شێعرە، ئەی تۆ خۆت ئەلارێنی بێتاقەت دەستت دە چۆك وەرد ێنی
پاشی کەمێ بیر، ئەها ! ڕاست ئێژی من نازانم چییە یا تۆش چی ئێژی
ویرەویر ئەکەیت ڕیش ئەجولێنی سامرەکەی ماڵی خالۆم بیردێنی
مامۆستاش دەڵێ ئەم گێلەپیاوە خۆ ئەمنی لەجێی نێری داناوە
ئە وگەورەپیاوە،زانا،هەم ئەدیب جیای غەم وەمەینەت،کواچی بوەنسیب



## گۆشت بە دەهۆڵ و زوڕنا

سێکی گۆشت کڕی ئەو ڕۆژەی حوسێن کفتە و شۆرباوی دەبا بۆ لێنێن
لۆتی کە دیتن وا ڕادەبردن گۆشت لەسەردەست ولۆتی بانگ کردن
دەهۆڵ و زوڕنام دەپێشدا لێدەن تا دەرکی ماڵێ ئەو یارمەتیم دەن
ئەوەش دوقۆشە ها لێم وەرگرن من دەڕوم ئێوەش بەدوامدا وەرن
وەپێشیان کەووت ڕوی بەرەو ماڵ دەهۆڵ و زوڕنا و بێکار و منداڵ
گەینەوە دەرکێ پەری خێزانی ئەو بەزم و ڕەزم و تەقەی پێزانی
هاتەدەروگوتی حوسێن چباسە ؟! :باسی شۆرباوەو گۆشتیە خولاسە !
ئەلەوچەندجارەی من گۆشتی دەکڕم قەرزدار دەبم، پول لە خۆم دەبڕم
جارێکی ئەبوە لەو هەمو گۆشتە پشکێکم خواردبی یا نیسکێ کفتە
دەهۆڵ و زوڕنام بۆیە هێناوە بێبەشم نەکەی ئە لەو گۆشتاوە
پەریش پیی دە لێ تۆ بێ بەش نابی بە دڵ بە، باش بە کابە ڕەش نابی
ئاخرپێمخۆشەسەخی بی و مەنشور چیدی پێتنەڵێن حوسێن مەندەمور
جا نوێژی شێوان لەوڕۆ بەد واوە لە شانی ڕاستت سەلامت داوە
لە کێ و چ کارەی لێ مەخوێنەوە بە بێباس دەگەڵ، خۆتی بێنەوە

کابراشی فێر کرد بچوو لای ڕاستە
سەرت دانوێنە و نوێژت دابەستە

بەڵێ خۆی ساز کرد تا بخوا کفتە
حەکو چەند خۆشە کفتەو؟ وا مفتە

کفتە و فاتیحای لێ ببوون تێکەڵ
یەک هات لێی تێکدان کردی بەگێچەڵ

ڕەحمەتو لێبێ پاڵ وێکدەن کەمێك
نوێژ کرا و حوسێن سەلامون عەلێك

کابرای لای ڕاستەی هێناوە زۆر زو
پەریش حاڵ بو کاری لێ تێکچو

:فێڵێك ساز نەکەم چ فایدەی نییە
دەڵێ خۆ حوسێن پیوازمان نییە

تامی لێ نایە گۆشتی بێ پیواز
دە بڕێکان بێنە تا نان دەبێ ساز

حوسێن چوو دەرێ پیوازان بێنێ
نەیزانی پەری وای بە سەردێنی

هەر ڕۆیی تەپشو و مشاری هێنان
بەرەوڕووی کابرای لەپێش خۆی دانان

هێنای دارێکی زۆر لێك و لەبار
هەر لوسی کرد و دەیتاشی جارجار

کابرا وەجواب هات: د یارە ئەو دارە
ڕێك و لەباری دەکەی وادیارە

ڕەنگ بێ کارێکت پێیبێ زۆر زەرور
بەڵام بەوشەوەی فڕیێدە بۆ دور

پەریش پێیدەڵێ د یارە نایزانی
ئەوە تایبەتیە هەر بۆمیوانی

میوان پاش نان و کێشانی قەلون
عادەتەو سینگی دەبێ بکەینە قون

میوان تێگەیشت، زانی بە باشی
سینگی بۆ پاشی میوان دەتاشی

هەستا داپەڕی هەڵات سەروە ژێر
بەخۆی گوت حاشاهەم لە خێر و بێر

هەر میوان ڕۆیی گەییەوە حوسێن
:چ میوانێكبو هێنات مل بەکوێن

دەستی کردبەگرمەوەهەڵاوشاتەشات
دیزەی شورباوی خۆڕفاند و هەڵات

:دا سێ چوار نانم وێدەن بە ئەژمار
حوسێنیش کەوتە د وای کابرای بەغار

هەر بە هەڵاتن بانگی لێدەکرد
هەڵمەیە، مەڕۆ تکای لێدەکرد

ڕاوەستە تێینێم با من ئەوەندە
کابراش ترسابو لەو سینگەی هێندە

میوان پێیوابـو ئـەو سینگی تاشـراو بۆیـــەی هێنـــاوە تـــا بیخاتـــە دا و
نان سپی دەچوبــــەد وای دادەهـــات وای زانی سینگەودیێ تـــا تێی ڕاکـــات
دەیگـوت نـا ئـەوە بـۆ ئیـوە چاکـە ئـەو سینگە لوسـەی دە بـابت ڕاکـە
حوسێن گـەڕاوەو، کـابراش هـەر هـەڵات نـەکا بـە دوامدا هـەربێ و سـینگم کـات
پـەری بەئـەو بـەزم و تەقـە و هەرایـە نەگۆشـــت نەگۆشـــتاوهیچی نەدایـــە

## ئەنەوشیرەوانی عادڵ و بەختەکی وەزیر

خـۆ زۆر لـــەمێژەو زۆر بـاس کـراوە ئـەو نەقڵـەم بیستوە ئـاوا گوتـراوە
لـەو وەختـەیدابو تیشـکی ڕونـاکی ئیسلام دایدەگرت دونیا بـە پـاکی
ئەنەوشـــیرەوان، عەداڵـــەت بـــەناو توانا وهێندسەخی واهاتبۆەبـەرچاو
وەزیرێکـــی بـــو ڕوڵـــەی زەمانـــە باشـی دەزانـین هـەرچیکی زمانـە
لـەگەڵ بەختـەکی زیـرەك و وشـیار دەگەڕان وێکڕا ڕۆژێـك لـە نێوشـار
وێگرادنیشـتبون ئـەواگورج وتونـد گوفتوگۆیـان بودیاربو قـەل و کونـد
پییدەگـوت بـە کونـد کچێکم دەیـە بـۆ کوڕەکـەم هیـوای دواڕۆژم هەیـە
باشـە مـن ئـەوە کچەکـەمدا پێـت تـۆ چیمدەدەیتێ تـا بـە کـارم بێـت
زیـاتر دەتدەمـێ لـەو بـەر و بۆیـە کـەلاوە کۆنێـك چـون خواسـتی تۆیـە
بـــەقەل دەڵێ کوند،دەوری بـاپیرت یـــان چـەدەوڕێکە،هـاتوتـــەبیرت
ئەنەوشـــیرەوان ئـــاوا وەجوڵـــێ سـەد کـەلاوە کـۆن، هەیە، بە پوڵـێ
لێیپرســی ئـەرێ وەزیـری زانـــا لـە عـەقل و بـیر و هۆشـت تەوانـا
ئـەوەدەڵێن چـی ئـەو قـەل و کونـدە وا د ێن و دەچن لە سـەر ئـەو دوندە
چۆنـی گـویێ لێ ببـو.هـەروای گـێڕاوە شـا تێـك چوودەتگوت تـیری لێ دراه

واد یارەئـــەمنیش ناعەداڵـــەتم — زۆر شـــەرمەزارم لـــە ڕوی میللـــەتم
مەرجـــەو لـــەوڕۆژا هـــەتاکو مـــابم — بـۆو میلـەتەی خـۆم وەکـو بـاب وابم
زنجـیرێك وەكـو ڕوكـنی عەداڵـــەت — داینا پـیێڕ ابگـا بـەدەردی میلـەت
هەرکـەس دادی بالـــەراندبای زنجـیر — زو بـۆی چـا دەکردهـەریۆخۆی ئـەمیر
ئـەوەی زنجـیری گەییشـتبا دەســـتی — بویـان پێكدێنـا کـار و مەبەســـتی
دەســـتی بـەزنجیرکێ نەگەیشتبایـــە — تاوانبـار، دەکـرا ئـە لـەو دەزگایـە
زەمـان تێپـەڕبو ئـاوا چـەند سـاڵێك — نـەزانرا، چـۆن بـو لـە لایـەن کـاڵێك
فێڵێکیـان سـاز کـرد واخسـتیانە کـار — تـا لـە لای زنجـیر، بـڕوا ئیعتیبـــار
زنجـیریش بەودوفێڵـــەی وا خـــەوت — کـەس نـــەید یتـــەوە، لەڕووپۆکـــەوت

## یەکێك لە نمونەکانی

## زنجیری عەداڵـەت و کەرێ بریندار

کابرایەك کەرێکی هەبونەگەر کەرەکـەپیر بووپشتیشـی هـەمو برینداربوچونکە هـەتا بەکارهات و باری بـرد کـاری پیێکردو نەیهێشت بحەسیێتەوە،و.وەختێك ئـاوای لیێ هـات بەرهـەڵڵایان کـردو.نـەیان هێشـت بێتـــەوە،لەکوچـەوکوڵانان دەگـەڕا،لـەنێوزبلێ و زاڵـی ورکەنانێك شتێکی وەدەست کەوی یـاچی؟ قـەزاوامات ئەوکـەرە ڕۆژێکی توشـی جێگـای زنجـیری عەداڵـەت دەبـیێ خولاسـەهەر سـەری هـەڵدێنی خـویێ بخورێـنی مێشـان لـەخۆی بڕەوێنی .چەبکا وەزنجیرەکەی دەکەوێ وزنجیردەبزوی و ڕادەژێ پیـاوی پاشـایی ئەگـەر هاتن وتەماشایان کرد ودیتیان ئەوەکەرێکی پیری پشت بریندارە.

هاتنەوە ئەوەیان ڕاگەیاند کەئەوە کەرێکی پیری پشت بریندارە.

ئەنەوشیرەوان دەستوری دا ؟سـاحیبی ئەوکـەرەم دەبـی بـۆ بیبیننـەوەدیارە ئـەوە هاتۆتەشکایەتیێ؟

دارۆغەچۆو نێوشاری بەگوڕپەگۆڕپو،هەڵلا هە ڵلا،ساحیبی کەرێ پشت ڕزیوی دیتـەو

هێنایەخرمەت شا.ئەنەوشیرەوانی ئەنەوشیرەوان لێی‌پرسی:ئەو کەرە ئی‌تۆیە؟

کابراولاّمی داوە:بەڵێ‌قوربان .

پاشا:بۆ بەرەڵلات کردوە؟! کابرا:چی‌لێ‌بکەم. بۆ کاری نابێ، پیربوە.

ئەنەوشیرە وان دەڵێ،ئاخر ئەوەتا پشتیشی هەمودەگەڵ بارەباری بریندارە وهیچ گیانیشی نەماوە. کابرا عەرزی دەکا بەڵێ قوربان وایە.

ئەوجار شادەستوری پێ‌دەدات:دەبی پشتی ئەو کەرەی زۆر بەجوانی چاك کەیەوەو بەجورێك نابێ هیچ برینێکی لەپشتی بمێنی وپێشی بخوێنی؟

کابرا مەجبوربوکەری وەپێشەخۆیداهینایەوەماڵێ ،

ماڵ ومنداڵەکەی لێ یان پرسی ئەو کەرەت بۆ هیناوەتەوە؟ئەدی ئەنەو شیرەوان ئەتوی بۆچەبو؟! ئەتۆو ئەنەوشیرەوان ،

کابرازوربەنارەحەتی ولاّمی دانەوەگوتی چارەڕەشی روی تێ کردوم ئەوکەرەسەکەت لێ دراوەتوشی زنجیری عەداڵەت بوەو ئەمنیان بۆیەبانك کردوەوپاشاحوکمی لێ کردوم ئەوکەرەی واچاك کەمەوەنابی برینی لەچەجێگایان بمێنێ سەرباری هەموشتێکێش دەبێ ببم بەمام وەستا وپێشی بخوێنم یائیلاهی ئەمنی چارەڕەش چەبکەم؟

ئاوای بیرلێ دەکەنەوە؟

کابرایەکی زۆر بێچارە و هەژار — هەیان بو کەرێك بۆهەرماڵێ و کار
کاری مەزرایەیانە بۆ ئاشی — بیخەسەر پشتی یاڵلا باراشی
بێگاری ئاغا و بۆ جیران حاجەت — هەرنەیان دەهێشت ڕابوەستێ قەت
هێندیان بۆکاری زۆر بۆ هێنا بو — پشت و شان و ملی پاك دافەتابو
هەرچەند حەولی دا و یاسەعی بۆکرد — بۆچاك کردنەوەی ڕێی بۆ دەرنەبرد
گەیبونەوە یەك پیری و برینداری — بێ حەسانەوەو هەر بارە باری
چارەی بۆ نەکرا چو بەر ەلاّی کرد — پێشی خۆش نەبونەگەرچی وای کرد

کابرا هەر چیکی باش کاری بۆبکا خزمەتی لازمیٔ زیاتریشی بۆ بکا
هەتا باری برد و هەتا کا ری کرد لە میزا ن بە دەر خز مە تی پیٔ کرد

شا،ئاوای پیٔ دەلٔیٔ

:تا کاری پیٔکرا هەر خزمەتت کرد زیاد لە ئالیکیش هەر بەخێوت کرد
ئیستا کە پیربوەو پشتی بریندارە بەرەڵلات کردوە، کوا ئەوە کارە ؟
هەرچی پێت دەلٔێم بەدلٔی بسپێرە لە بریاری من هیچ خۆمەبوێرە
کەریٔ بەرەوە و بکەوە شوێنی چاکی بکەیەوە و پێشی بخوێنی
ئەوکەرەتا کو کاری پێکراوە کەلٔکی بە باشی لیٔ وەرگیراوە
سەر پنج وچالٔوك خۆ بۆسە رشتلأن گوێنی ودرِودالٔ زریشك و شیلان
پێت کێشاونەوەها توچۆی بێستان تۆوی مەزرایەوناردنی بۆ کوێستان
د وایەش نارد و تەنوٚ ڕ ۆ ژ بۆگێر ە بۆ خالٔە سما یلی فەرموتە خێرە
هەرچی پیٔ ویست بووەئەنجامت داوە پیر بووەوبریندار کا ریشی کراوە
بەرەڵلای بکەی ئا وا بە و جورە نازانی چەندیش لەویژدان دورە

ئەو پیاوە فەقیرە کچێکی زۆر زانای هەبوە وبەبابی دەلٔیٔ برۆ سابون و لفکەو کتیبێك و دو ڕبە شم جوٚ بوٚ بکرە وبوٚم بێنەوە جا هەمو کارەکانت بوٚ جیٔ بەجیٔ دەکەم.

بابەکەی زۆر بەناهومێدی چو چی کچەکەی ویستبوی بوٚی هێنا.

ئەو کچە هەمو ڕۆژیٔ دەستی لیٔ هەلٔدەکردو پشتی ئەوگویٔدرێژەفەقیرەی بەئاوی گەرم و سابونیٔ دەشوت وجوان ئیشکی دەکردەوەو دەرمانی دەکردو،لە.لەوەڕێش ئاگای لیٔ بوو.تیٚری دەکردهەتابرینەکانی چاك بونەوە.ئەوجارجوٚی بوٚلەسەرکتێبی ڕوٚدەکرد، جوٚیەکەی دەخوارد دوایەبوٚی وەبن پەڕێکی کتێبەکەیدا هەردمی تیٔ هەلٔدا هەتاپەڕەکەی لەسەرجوٚیەکەی وەلابردوخواردی. ئەوجارکردیەدوپەڕ،سیٔ پەڕ،و... هەربوٚی دەبن پەڕی کتێبەکەی دەدا،کەرەکەش هەر لوتی تیٔ هەلٔدەداو فێری جوٚی ببوو هەتا وایلیٔ هات

هەرکتێبێکی بۆتدانابا،بەلمبۆزێ هەموی هەڵدەداوەولەجۆی دەگەڕا،جائەوجار کچەکە کەری وەپێش بابیداوپێیگوت جافەرموبیبەوەخزمەت شا ئەنەوشیرەوانی؟ کابرا کەری هێناوەبۆلای زنجیری عەداڵەت، پیاوی شای هات وبردیانەخزمەت شای نەیان ناسیەوە. هەتا کابرا بۆخۆی نەیگوت

پێی ڕاگەیشتبون هێندە بە جوانی  شوێنێك نەمابون،لەبرینە کانی
جورێك گۆڕابو،نەدەناسراوە  پێیان سەیربو،چۆن واگۆڕاوە

جا ئەوجار کەرەکەیان تەماشا کرد چاك ببۆوەو.شا لێی پرسی.

: ئەدی پێت خوێندوە؟!

کابرا گوتی بەڵێ. ئەمری کرد کتێبێکی بۆبێنن، کتێبیان هێناو لەپێشیان دانا بە لمبۆزێ هەموی ئاوەژو کردەوە. ئەنەوشیرەوان گوتی ئەدی بۆ چ نالێ؟!

کابراش ترسی شکابو گوتی قوربان خوێندنی کەرێ هەر ئەوەندەدەبێ ؟

شا.خەلاتێکی باشیشی دا بەکابرای فەقیرو کەرەکەشی وێداوە.

کەرێك بو ئە و دەم بریندار و پیر  حوکمی لێ کردبوین بەتوندی ئەمیر
چاك بکرێتەوەوخویندنێش فێربێ  لەخواردن وخەویش هەردەبێ تیربێ
وەکی دەی بینن چاك چابۆتەوە  لەخویندنیش ئاوالەخۆبۆتەوە

## دو داستانیش بۆبێ ئیعتیبارکردنێ زنحیری عەداڵەت

### بەیتی ١ ـ دزییکی بێشەرمانە:

لە زەمانی ئەنەوشیرەوانیدا،دوکاری خەراپ ئێك دزی و ئەوی د یکە زۆر قەبیح بوە. جا دەڵێن لەبەر ئەو دوفێلانە زنجیری عەداڵەت هەڵکشاوەتەوەوکەس نەیدیوەتەوەو تازەش کەس نایبی نێ تەوە؟

یەك :کابرایەك دزی لە جیرانەکەی دەکا. دزیەکەش ئەوە بوە کابرای لیرەی هەبونە جیرانەکەی ویش چووەو لیرەکانی لێدزیون. بۆ شاردنەوەو بۆ فریودانی و کەڵەك بازی،

چونکە دەیزانی شك هەر لەوی دەکرێ ئەوعەسایەی کە بە دەستیەوەبوە هەموی هڵۆڵ دەکابەقەرای لیرەکان و لیرەکانی هەمو دەنێو عەسای کردون و بە پەڕۆ پاڵی و ... وای لێ کردون دەنگیان نەیەو بێ هەست بن. زێڕی زەمانی پێشوزیاتر لیرەبونەکە ئێستا،یەك ود وونیو و پێنج لیرە هەیە.کابرای دزیلێکراو،شکایەتی لەکابرای جیرانی کرد.

دزێك خۆی سازکردئاوای بیرلێ کرد — وابەبێشەرمیش هات بەڕێوەی برد
نێو وەکازەکەی وا هەڵۆڵ کردبو — بۆ لیرەدزینێ ئامادەی کردبو
لیرەی تێئاخنین تابردی بێ هەست — بۆ هەر جێگاوشوێن عەساهەربە دەست
دزی لێکراویش شکایەتی کرد — نامەکەی نوسی و بۆ پێش حاکمی برد
دەستوری بۆ نارد هەرئەوکات ئەمیر — بۆ ڕونکردنەوەی بێت بۆ لای زنجیر
چونە لای زنجیر تا کار مەعلوم بێ — دز خەجاڵەت و پاکیش مەعسوم بێ
گەینە زنجیر و تۆ ئەو خودایە — دادەی بۆم بگرە ئە ئەو عەسایە
عەسای دا کابرای دەگوتی یا ڕەبی — چی ئەوەی دەی وێ بەدەست من وە بی
زنجیر تۆ هیوای بۆ هات و نەهات — لە لام بێ یا خوا دەستم پێت نە گات

کابرای دز.دەستی هەڵێنا و دەستی گەییشتە زنجیرێ و هەمو تەماشایان کرد ئەوە دەستی گەیۆەتە زنجیرێ و وبێتاوانە.

عەسای لەکابرای وەرگرتەوەوبرێکیش خوی لەدزی لێکراوی توڕەکردو.گوتی ئەتۆ بە خۆڕایی ئابڕوی عالەمێ دەبەی دزی خۆشت ناناسی یاداخوا هەربۆخۆت شاردوتنەوە یاچت لێ کردون.

چۆوە ماڵێ ئەو ماڵە حەلا لەی بە بێدەنگی خواردوهەرگیفەی سمێلانی دەهات وکابرای دزی لێکراویش دملەپوش زێڕەکەی خوراوکەسیش ولامی نەداوە.

نە زێڕ و نە پول چی بۆ ڕانەکرا — خۆلەلای حاکمیش کاری بۆنەکرا
لای ماڵپەرستان زێڕ لەگەل گیانە — بەلام دز دەڵێی هەر لێی نە با نە

ئارەق نەڕێژی لە سەر زێڕ و ماڵ    لێی نەکوڵیەوە حەرامی و حەلاڵ
بۆت پێك بێ ئاوا خۆشە بەڕێ چون    ڕۆژی حیسابێ کوارێگای دەرچون
خۆزگە لەوکەسە لەو ڕێیە ژیاوە    دڵی هیچ کەسی لێ نەئێشاوە
خۆزگە لەوکەسەی وای ڕابردووە    خوێ مشکلۆزمەی کەس نەکردووە

**بەیتی دو : فێلی ژنێکی فێلاوی**

دەڵێین کابرایەك ژنێکی هەبوەو لە ژنەکەی زەنین بوە بەڵێ کەیفی بە کابرایەکی دیکە دێ بەقەولی گوتوانیش ،وا بوە:

ڕۆژێکی مێردەکەی پێیدەڵێ بەڕاستی ئەمن لە تۆ زەنینم و هەرچەند جورێکی دیکە ئەگەر خۆت نیشان دەدەی بەلام ئەمن بەقات پێناکەم. ژنەش هەرچەندە سویندی بەدرۆێ بۆدەخوا،کابرا بەقای پێناکا. وەکی شیعرە فارسیەکەی کە دەڵێ؟

ان چیز کە عیان است    چە حاجت بە بیان است

خولاسە بە هیچ جورێك کابرا، بەقا بە ژنەکەی ناکا، چونکە حەتمەن شتێکی پێوە دیوەدەنا پیاو ماڵەخۆی لەخۆڕا وێران ناکا. ژنە:

زۆرم پێسەیرە تۆ وا زەنینی    خۆشەویستی خۆت لەمن نەبینی
خۆ لەتوبەدەر ئە بەو خودایە    نیرم پێ نێر نیە، لە سەردونیایە
بە سەری بابم و چوار براکانم    من هیچ پیاوێکی، بە پیاو نازانم

زنجیری عەداڵەت نێوبانگی وادەرخستبو هەرکارێك و ئیشکالێکی خەڵکەکە بۆیان ڕون نەبباوە دەئەوزەمانەی دا .دەچونە بن زنجیری عەداڵەت هەتا کارەکەیان بۆڕون بێتەوە. ئاخرەکەی قەراریان دانا سبحەینێ بەیانی بچن بۆ زنجیری عەدا لەت وکار تەواوبێ وبۆیان مەعلوم بێ چییە.

ژنەبە کابرای حەریفی دەڵێ، ئەتۆ سبحەینێ گوێدرێژێکی دەگەڵە خۆت بێنەو وەرە فلانە ڕێگایەی ئەمەبەوێدا دەچین بۆ زنجیری عەداڵەت. ئەمن لە ڕییە خۆم نەخۆش دکەم

و سواری کەرێم کە. دوایە خۆم دەکەوێنم، ئەتۆ کارێکی وا بکە دەستت وەبەدنی ڕوتیم کەوێ، جا ئەودەمی بۆخۆم دەزانم چ سازدەکەم.

بەڵێ! سبحەیێ بەیانی کابرا دەگەڵ ژنەکەی وەڕێکەوتن هەتا بچن بۆ لای زنجیری عەداڵەت کارەکەیان بۆ ڕون کاتەوەو، لە نێو ڕێگایەدا گەییشتنە کابرای.

ژنە بەمێردەکەی گوت ماندوبومە. بەئەو کابرایەی بڵێ بزانە برێکم سواری ئەو کەرەی ناکا، خۆ بەخودای ناتوانم بە ڕێگایەدا بڕۆم و برێکیش ناسازم.

بە خوای کابراگیان!کەمێك ناسازم لە ڕی ڕۆ یشتنیش بۆیە بیۆازم

بە کابرای ساحێب کەری گوت براگیان منداڵەکانم ماندو بونە و برێکیش نەخوشن، زۆری منەت هەیە، برێکی سواری ئەو گوێدرێژەی خۆت کەی.

کابراش هەر زویەکی لە کەرەکەی هاتە خوار و کەرەکەی ڕاگرت:براژن فەرمو سواربە !ژنەلێی سواری کەرێ بو.برێك ڕێگاڕۆیشتن،مێردەکەی وەپێشکەوتبو،غەرقی فکران لەبارە ی ژنە کەیەوە،ژنە سواری کەرێ و ،ساحیب کەریش لەدوایەو.ئەویش لە کابرای مێردی ژنەی پرفکرتربو، گەییشتنە جۆگەلەیەکی، لەگەڵ پازدانی کەرێ، ژنە خۆێ کەواند و وایکرد بەدەنی ڕوتی وەدەرکەوێ و کابراشی نەسیحەت کردبو، هەر دەگەڵ کەوت بەغار خۆێ گەیاندێ و دەستی گرت وهەڵینەستاندەوەولەوی ماندووعاجز لێی دانیشت ومێردەکەشی گەڕاوە:ئەوە چبو؟!

ژنە:دەگەڵ ئەوگوێدرێژە لەئەوجوگەلەی، پازدیدا وەعەرزێ کەوتم.

برێکی دیش لەوی دانیشتن ودوایەهەستان وکەوتنەڕێ. کابرا:ئەدی سوار نابیەوە؟

ژنە:نا.تازەسوارنابمەوە،ناوێرم،دەکەوم کابرا،بەکەرەوە،لێ داڕۆیشت و تازەکاری وی تەواوبو.

برێك ڕۆیشتن گەییشتنە سەر ئاوێکی، بەمێردەکەی گوت ئەمن دەستنوێژێ هەڵدەگرم. مێردەکەی:ئەدی ئەتۆ دەستنوێژت هەڵنەگرت بو؟

ژنە:ئەگەرلەسەرئەوکەرەسندان کوشتوەی وەعەرزێ کەوتم،ئەوکابرایەماڵی ئاوەدان

بێ، دەستی گرتم و هەڵی‌ئەستاندمەوە،خۆدەنامەردەشخینکام دەنیوئاوەکەی‌دا. تەماشای ئەولەشەم چی لێ هاتوە، بە دەستگرتن و هەڵستاندنەوەی دەستنوێژم شکاوە.

بەڵێ؟ ژنەی فێڵەزان، دەستنوێژی هەڵگرتەوە و ڕوییشتن گەییشتنە زنجیری عەداڵەت.

ژنێك بی هەوێ چ لە مێردی بکا رێگای دەزانی چۆن فێڵی لێ بکا

بوسەی بە نیفاق خۆ شیرن کردن بۆ بەڵگەو، هەتا باوەڕی پێ‌بکا

جائەوجارژنەچو دەستی بۆ زنجیری عەداڵەتێ درێژ کردو گوتی ئەی زنجیری عەداڵەت! ئەگەر ئەمن لە مێردەکەی خۆم و ئەوکابرایەی سواری کەرەکەی کردم دەستی هیچ کەسێکی دیکەم وێکەوتبێ، یارەببی دەستم نەتکاتێ دەنا دەستم بتگاتێ،

هەر ئاوا دەستی ڕاکێشاودەستی گەییشتە زنجیری عەداڵەت ولەپێش چاوی مێردەکەی.

وکابرای مێردی چاوی تێ‌بڕیبو،عیلاجی نەبوبەقای پێ‌کردجونکەڕوسمی ئەوزەمانی وابوە، گەڕانەوەماڵێ کەچی هەر لێشی نیگەران بوو.دەیزانی ئەوژنەفێڵێك کەڵەکێکی حەتمەن ساز کردووەشتێکی دەباران هەیە.

***

**خاڵەی تۆو هەرزنی**

سەرەبەهارێ کە دەست بەکاروکاسپێ دەکرێ مام عەلی لە کوڕەکانی دەپرسی : فلانە زەوییەی دەکەنە چی؟!

چونکی کوڕە گەورەکەی زیاتر سەروکاری دەگەڵ کشت و کاڵی بوە،گوتی، بابە پێمخۆشە بیکەینە هەرزن، بەڵام دەزانم توو هەرزنیشمان نیە،

مام عەلی دەڵێ ڕۆڵە ماڵە خاڵت تا ئیستا چوار پینج جاران خەبەریان داومەتێ، دەچم سەرێکیان لێ دەدەم وتووهەرزنیشیان هەیە وچە ندی لاَ زمن بێ د ینم ود ێمەوە.

پور خاتون لەوێ دانیشتبو گوێی لەقسەکانیان بو،دەڵێ عەلی بەخودای دەبی بەیانی زو وەڕێکەوی لەمێژە ئاگامان لێیان نیە خەبەرێکی ساغ وسەلامەتی وانیشمان بۆ بێنەوە وتۆوهەرزنیش زوبێنەبوٚئەولولایان نەڕۆیی ئەتوبرێك کەترە خەمی؟

بەڵێ مام عەلی بەیانی زو وەڕێکەوت بچی توو هەرزنی بێنی دەی بەتەمای خوای، زۆر نەڕویی توشی سێ چوار کەسان بو، دەچونە سەرەخۆشێ بێجگە لەئەوەی ئەوسێ چوارکەسانەناسیاربون ساحێبی مردوی کە دەچونە سەرە خۆشییەی هەم ناسیارو هەم خزمێکی زۆرلێك نیزیك ولەپێش بو،ڕەگەڵەوان کەوت بۆ سەرەخۆشێ؟ سەرەخۆشی تەواونەببو کچی خزمێکیان ڕەدواکەوت،چونکە مام عەلی کەمێك بەتەمەن وئامالْ کەیخودابو دەگەڵە خویان بردەوە ماڵێ، لەوی ماوە هەتا کاری مەسڵەتی تەواوبو.

ئەوجار.بەسەرلێ دان لەخزمان هەردییەی دەگەییشتێ، ئەگەر سەرەخۆشێ ونا کۆکی لێنەبا، لانیکەم د وسێ شەوان لەوێ دەماوە !

ئاواڕۆیشت هەتاگەیشتەماڵەخەزوری؛ وەختی هەرزنچاندنێ بەسەرچوبوچونکەزانی وەختی هەرزن چاندنێ تێ پەڕیوە باسی هەرزن مەرزنی نە کردو گوتی هەربە سەردان هاتومەچونکە لەمێژبوخەبەرمان لەساغ وسەلامەتیونەبو،

مام عەلی بەئەوجورەی کە چوبو هەر ئاواش گەڕاوە، هەر دییەی سێ چوار شەوانی لێدەماوە،

مام عەلی هەتا بە سەلامەتی گەییشتەوەماڵێ،لەقەراغ دیی لەنیو زەویەکەی خۆیان، دروێنەی هەرزنیان دەکرد، فکری کردەوە:ئێی!خۆ ئەمن بۆ توو هەرزنی چوبوم. ئەوەدروێنەی دەکەن چەبکەم، بەغاربەنیوباقاندا بۆ لای کوڕەکانی هەڵات،

دەباقەهەرزنێکی هەڵەنگوت لەسەرڕا،وەعەرزێ کەوت وهەستاوەبڕێکی خۆتەکاند.و وادەکا حەك بەلا لە کاری بەتاڵوکەدا؟!ئەمن ئەوەبۆ تاڵوکەیێ دەکەم.

## (شێعری)خاڵەی توو هەرزنی

بەکوڕەگەورەکەی مەحمودگیان ئەرێ
کوادەیکەی بەچی زەویەکەی سەرێ

مەحمود: پێمخۆشە هەرزنی بچێنین
خۆ تووێشمان نیە دەبی بوی بێنین

مام عەلی دەڵێ زەویەکەی بکێڵە
هیچ کۆسپ وپەڵەی لەنێو مەمێڵە

خاڵت سێ چوار جار ولامی نارد وە
لەبەر پرکاریان هەر خۆم لێبواردوە

بابچم سەرێکیان زو لێ هەڵێنم
هەرزنیش چەندی لازمن بێ دێنم

پور خاتون دەڵێ عەلی بەیانی
زوێکی دەبێ بچی وخەبەرێ بزانی

مام عەلی دەچێ خۆ دەخافڵێنێ؟
بزانین توو هەرزنی دێنێ و دەچێنێ؟

بەیانی ڕۆیشت لە دێ دەرکەوت
چاوی بە سێ چوار خزمانی کەوت

پاش لێ پرسین و چەند چاکوخۆشی
ڕێ کەوتن وێکرابو سەرەوخۆشی

خزمێکی والە زۆر لێك نیزێك بون
مایەوەو هەرتا میوان خەلاس بون

ئەوکچەی خزمی زارای مامەڵلا
ڕەد واکەوت وبو بەکێشە هەڵلا

تا مەسلەت کرا هەر لەوێ ماوە
بۆ دەرمالانەش د یسان گیرساوە

ماڵە مام عەلی وماڵە و خەزوری
ڕیی دوڕۆژە ڕێ نیزێك و دوری

سبحەی پاش نوێژی هەستا کەوتەڕێ
بزانین مام عەلی کواچۆن دەڕوارێ

دێ بە دێ ڕۆیشت هەروا بە سەردان
پێیان داگەڕا بە دۆست و خزمان

د یێ ئەوبەرەوبەر یا سەر ڕێگایە — پرسەوئاژاوەوهەرچی لێی بایە
هەتا د وا پرسە یان پێك هاتنیان — لەوێ دەماوە هەروا لەکنیان
ئەو د یی لێی‌نەبا پرسە و ئاژاوە — د وسیێ شەوانی لێ هەردەماوە
ئاخری گەیشتێ چو وەزورکەوت — لەوێش چەن ڕۆژان بێ‌خەم لێی‌خەوت
کەروێشکەدەکردگەنم وجۆوشینکە — تۆو هەرزنی تازە بۆچێەو چلێبکە
بەوجورە چوبو چ کراو نەکراوە — بێ فکر و خەیاڵ هەرواش گەڕاوە
گەییەوە قەراغ ئاوایی خۆیان — دەیڕوانی هەروا لە هاتووچۆیان
ئەوە کوڕەکانن کوا دەبێ چبکەن — ئەی ئەی خۆو ئەوەدروینەی دەکەن
چوبوم تۆو هەرزنی بێنم بچێنم — دروێنەی دەکەن چۆنێان بدوێنم
بەنێو پەریزدا هەڵات بە لینگدان — هەڵەنگوت کەوت دەباقەوسندان
پێچ و کڵاوەکەی بە عەرزی دادان — دەیگوت وێ کەوێ پەلەوهەل سندان
مام عەلی هەتا گەییەوە ماڵێ — سەری سەلامەت خۆ کەس چە ناڵێ

## خورینج

ئەگەر ماوە یادی بەخێربێ و ئەگەر نەماوە خوا عافوی کاپێشم وانیەمابێ.

وابزانم مەلا ئەحمەدی پێنجوێنی لە ساڵەکانی هەزار وسێ سەد ونۆزدە وبیست وهەتائاخری هەزارو سێ سەد و بێست و پێنجی .هەتاوی لەئاوایی خورینجی سەروەشاری پیرانشاری کەئەوسەردەمەی خۆاڵێ خۆش بو،مام وەستامەلاسەیدقادر،مەلاوئیمامی جەماعەتێ وسەرپەرستی حوجرەکەی خورینجیش بووە.لەحوجرەی فەقێیان،لەلای ئەومەلا سەیدقادرەی موستەعیدێکی زاناولێ هاتوخەریکی خویندنێ بوە؟

ئەدەوچەندساڵانەدا بەتایبەتی دەئێرانێدا ئاڵ وگۆڕێکی بنەڕەتی وچاوەڕوان نەکراو ڕوی داوە؟

وەکوبێ لایەن بونی ڕەزاخانی ئەوڕەزاخانەی ئەگەرگوتبوی ئاسمان بڕوخێ بەسەر

نێزەی سەربازی ڕادەگرم؟·دەست بەسەرداگرتنی ئێرانیٚ لەلایەن قشونەکانی ئیگلیس ولەشکری سووری ڕوسی، دامەزرانی (فیرقەی)دیمۆکرات لەئازەربایجانی ڕۆژ هەلآت هەروەها دەئەوهەل ومەرجەی دا ئاشکرابونی (کۆمەڵەی ـ ژ ـ ك )لەکوردوستان وگۆڕینی بەنێوی حیزبی دیمۆکڕات کوردوستان ئێران وهەڵبژاردنی پیاوێکی ئازاو.وقارەمانێکی زانای وەکو(پێشەوا قازی محەمەد) نەمربەسەرکومار((کوردستان)) ئێران؟!

کاك مەلا ئەحمەدلاوێکی واشاعیروتێکۆشەرولەپێش چاوی خەڵکی جوان وشیرن بێجگەلەشێعرەجوان وبەسۆزەکانی ئەگەربۆدیمۆکڕات وهاندانی خەڵکی کوردبۆیەك گرتوئی وڕێنوێنی وگلاڵەی دیمۆکڕاسی دەئێرانێکی ئازاد.دا،وحەول دانیان لەڕێگای ئاوەدانی ولآت زەحمەتێکی زۆری کیشاوە جامام وەستامەلائەحمەد شێعرێکی زۆر جوان وڕێك وپێکی بەئەوجورەی کەدەیخوێننەوەبۆخورینجی دانابولەشێعرەکەیڕاوادەرکەوتوە ئەولاوەخوین شیرنە زۆر خۆشی گوزەراندووە، بەلآم؟دەگەلٚ قادری شوان چونکەئەویش پیاوی ماڵەئاغای بووە.؟نازانم چ ناکۆکێکیان هەبوە؟!لەسەرکوردایەتیٚ ؟لەسەرجحێلآیەتیٚ ؟!

دەشێعرەکەیداناواهێرشێکی توندی کردوتەسەرخۆالیٚخۆش بومام قادری شوان.؟

ئەوەش شێعرەکەی مام وەستامەلائەحمەدی پێنجوێنی لەکەم کورپیەی بمبورن؟

چاوی پیسی لیٚ بەدوربی قەسری لوبنانەخورنج؟
پارسی سەت جاربەقوربان باغی ریزوانەخورنج؟
خۆشەئەوزاعی مەناخی خاکەکەی دڵگیری عام؟
ئاوەدان بی ئەی ئیلاهی عەینی عەدنانەخورنج؟
حۆرەکانی ڕەزەنی ئایین ودین ومەزهەبن؟
بیٚ قوەی مەقناتیسی دڵکەشی ئینسانەخورنج؟
بۆمەلاوشێخ وفەقیٚ وکرمانج وئاغاونۆکەری؟
مەرکەزی بەزم وسروروەوجێگەی ژوانەخورنج؟
سەهلەبۆدەرویٚش وسۆفی تۆبەیان ڕاناگرن؟

وەك مرید یەکن لەرێگەی شیخی سەنعانەخورنج؟
سەت کەهێندەباسەفایەدیی خورنج ئەمماج سود؟
جێی هەزارشەیتانی میسلی قادری شوانەخورنج؟
ئەی بە: : : : ::: دەگە:: : : : ئەی : : : : ی : : : : : : ::ەر
واستەی تۆیەکەئیستاچۆل ویرانەخورنج؟
بەینی ئەمن وتۆبمێنێ شەرتەدەردێکت دەمێ؟
ئافەرینم کابلێ پێم تیغی بوڕڕانەخورنج؟
زەوقی ڕۆژی خۆی هەزار میسلی تۆی پێ وەك ڕیویە؟
خۆی وەکوشێری شکاروسەففی مەیدانەخورنج؟

ئەمن بەپیچەوانەی مام وەستامەلائەحمەدی،وجیالەوەێ چەخۆشی واشم لەخورینجی نەدیوەبەلأم چونکەلەئاوایی خورینجی لەدایك بومەوهەموئینسانیك،لەسەری پێویستە ئەوەندەی لەدەستی بێ بەزێدی خۆی هەلأبلێ،جائەمن هیناومە،شێعرێکم بۆخورینجی و بەردەکانی.وبەری پەلأساوێ،وئەوکێووجێگاکانەی سەروەخورینجین بەشی کردنەوە دامناوەیاهەرئەوەندەم لەدەست هاتوە،هیوادارم خوێنەرانی خۆشەویست کەلکی لێوەربگرن.لەداهاتودابۆجوانترکردن وبەرینکردنی ئەوشێعرەی وشێعری پیرانشاری ئەگەر بەپێویستی بزانم پێیاندادێمەوە،بەتایبەتی بۆکێووجێگابەناوبانگەکان سوپاستان دەکەم.

## شێعری خورینجی

هەمو خەلکی خورینجی خانەدانە — خورینج هەلکەوتوە خاکی نێرانە
مەلا دەروێش و کرمانج، سۆفی ئاغا — لەگەل ئێکن بەحەققەت وەك برانە
لە شایی و شین وناخۆشی لە خۆشی — شەریکی ێکترین زۆر موخلیسانە
تەماشای سەنعەتی ئەو کردگارە — کە ڕووی‌کردونە،بەردەوە رووەك نیشانە
دەخوێن هەنجیر و دودرك و بەلألوك — لە خەوخۆش، قۆدیلە و کانی گولانە

لەبەردی‌کورەی ولەقلەق کەبازدەی    خڕێ مێوانە و کانی میرزاخانە
لە بەرد ساباتی کە دانیشی و بنۆڕی    دەبینی ئەم ولاتە چەندە جوانە
لە بەردهۆڕهۆڕەتاکوبەردوەتاغی    پەرە سللێرکەکانی کەندەلانە
بەیادی کانێ سوینەی چاو شەمێنان    لەسەرسوێ تاتەبەردوبەفرە وانە
لەبەردلانك وەكوجوللانەڕاژام    لەبەردحوجرەی دەبینم سەربڕانە

بنۆڕە بەردەزەرد تاقەی ڕێواسان    بڵەی بۆ بەردحەسیر بێ وەك ئەوانە
لە ئاوی نۆزەڵەی تا گردی بێ‌بەرد    بەڵێ جینگ‌جینگەیە و هەندوڕەشانە
لە تاقەی پڕ کروسك و بەردەسوران    خڕێ هەنجیر و کانی کیسەلانە
لە بەردگامێش و کانی‌کوێر و سێ‌کێل    لە لای د یش بەرد مەلایە و بەردبەرانە
پەلاساوێ[1] کونە پیست و درۆزنە    هەوارگەی کانەبی ورِ یێ ئەحمەدخانە
لە سەرخۆشی وسەفای ئەو ناوچەویگرا    بە نوُر لێکیان دەدان گورزی گرانە
جێڕاوگەی شۆڕەسواران بوەکە مالێ[2]    بە دەنگ پیێ هەلگوتوە جوان، ماهیرانە
لە پیرسالێ[3] ڕواڵ، نیازت بخوازە    وەلی، پێغەمبەری ئاخیرزەمانە
لە ئەحمەددەوڵەت وجێ[4]چوك زریشکان    خڕێ نەعنە و،قەلاتێ شانیشانە[5]
لەسەرگۆڕوقەلاتکەوکانی سێوەك    دەخۆڵەونەوسپیلك سەیدئەحمەدانە[6]
غەلێ مام کانەبی وچێنکان ببینی    دەزانم تۆدەڵێی جیێ ڕەمکەوانە
برایم ڕە شك لە سەروی بەردی گوێزی[7]    کە جێی ڕازی سیامەندو خەجانە
لە چۆمی بارەڕەژیان، گردەخەزێنە[8]    نیشانەی مێژو بو نیە، لێم عەیانە
گەرمکی کانی کۆخەی[9] ئەحمەداویێ    هەتا سەرچۆم و کانی‌بەرد هەمانە
خورینج! جێی ئیفتیخاری بۆ ولاتم    بە بونی ئەوهەمو ڕەمزو نیشانە
پەرێشانم خورینج:نێوم بزانە    کوڕی تۆمە بە ئیسباتی زەمانە

**(شیکردنەوەی شێعری خورینجی)**

١ـ **پەلاساوێ**، وەکی باس دەکەن وگێڕاویانەتەوە زەمانێکی بەشی زۆری ئەولاجان وپیران ومنگوڕایەتیەی جستانان چۆل بوە تەنیا بە هاران لەگەرمێنێ ڕا هاتون بەرهەمیان کۆکردۆتەوە هەرچەند.بەشی زۆری بەرهەم و کەسب وکاری ئەوحێلا تیانە لەڕێگای ئاژەڵداری وبەخێوکردنی ڕەوەوگاو.وگۆل ومەڕومالاتی وەدەست هاتوە دیارەهەرکەسەش جێگای د یاری کراوی خۆی هەبوە بەهاران هاتون وپایزانیش گڕاونەتەوەگەرمێنێ.
**(کانەبی فەقێ وەیسی)** کەلەتایفەی ڕەمکان و سەرداری حێلی ئەوتایفەی بووە دەزەمانی خۆیێ دا .پیاوێکی ئازاوپاڵەوانێکی زەبربەدەست بوە هاوینەهەواری کانەبی لەلاجانێ مامەشان سەروەشاری پیرانشاری جێگایکی زۆرخۆش وبژوێن بوە،بەنێوی پەلاساوێ کە ئیستاش ئەوموچەبگرەلەئەوزەمانیش زۆرخۆشتروبژوێنترە..،

هەروابەهاران هاتوەوپایزانیش وێڕای خەڵکەکەی گەڕاوەتەوە بۆگەرمێنێ .

کانەبی لەکەس وکاری خۆی لەئەوهەوارگەی تەنیاخۆازی دایکی دەگەڵ بوە هەشی بن براوباب وکەس وکاری دەگەڵ نەبوەلەئەوهەوارگەیەی ژیانێکی خۆش وساحێبی مەڕوگاڕان ڕەوەویکی زۆربوەوبۆخۆشی بەشی زۆری ساڵێ دەگەڵ ڕاو وشکارێ خەریك بوە،

کانەبی عادەتیشی وابوەهەمیشەدەست وپەیوەندوکاردارشوان وگاوانی زیرەك وئازای بۆبەخێو کردنێ مەڕومالاتەکەی ڕاگرتوەکەچی ئەوساڵەی کارداری باشی بونەگیرابوو.،

کانەبی ڕۆژێکی بەبێ غایلە.لەکەڵ نۆکەرێکی دەچێتە ڕاوێ

ئەحمەدخانێکیش هەبوەئەو ئەحمەدخانە .وەکوکانەبی پاڵەوان وزەبربەدەست بوە ونەزاندراوەدەگەڵ کانەبی لەسەرئەوملکەی یاهەردوژمنایەتی عەشیرەی؟. کۆنیان هەبوە.، یاچی وبەخوو بەپیاوێکی لەدەروبەری پەلاساوێ خۆی حاشاردراوەوادەرکەوتوە چاوەڕێی هەلێکی وابوەولەهەموزەمانێکیش دا فسۆس وپیاوی خۆێڕی هەرهەبوەوئاگاداری چونەڕاوی کانەبی دەبێ ودەچی لەپشت کونەپێستێ ڕا.ڕەوەی کانەبی دێنێتەخواری وبی فڕێنێ دوکەس لەکارداروتۆکەری دەکانەبی لەوێ دەبن ئەوانەکەچاویان بەئەحمەدخانی

دەکەوێ ئەوەیەکەلەو..هیچیان ناوێرن قەرەلەقەرەی دەن بەلاّم خوازی دایەکانەبی دێتە پێش ڕوەی وبەئەحمەدخانی دەڵێ ڕەوەی بەجێ بێڵەورێی خۆت بگرەوبڕۆ ئەوە،ڕەوەی کانەبی فەقێ وەیسیە بەپیاوی وەکوتۆناخورێ ئەحمەدخان جاری،ئەوەڵێ دەجوابی خۆازێ دادەڵێ ڕەوەی زۆرپیاوی لەکانەبی پیاوتریشم خواردوەئەوەئاخیریەتی ؟

پورە خواز دەڵێ باشەئەتۆکیی واغللوربویە بەخۆت وبەپیاوێکت ،

ئەحمەدخان دەڵێ ئەمن ئەحمەدخانم وئەحمەدخنی باڵەکیم پێ دەڵێن پاڵەوانێکی وەکومن نۆکەروپیاوی زۆری بۆچیە ؟ئەوجارپورەخواز دەڵێ باشەئەگەرئەتۆ خانی خان نابی وەدوای کاری دزیو بکەوی وچۆن ڕەوەی دەفرینی؟ ئەوجارئەحمەدخان قسەی دەگۆڕی ودەڵێ ڕەوەڕفاندنی چی ئێرەهەموی هەرموڵکی خۆمەوکێ دەتوانی چەبڵێ ،

پورەخواز دەڵێ باوەڕیم بەئەوقسانەت نیەونەسیحەتی من دەگوێ گرە،ڕەوەی بەجێ بێڵەوبڕۆ.هەموکون بۆدەست تێ ڕۆکردنێ نابن ،

ئەحمەدخان بەتاڵوکەبەنۆکەرەکەی دەڵێ دەنگ دە، پورەخواز. دەچیتەپێشترو :باپرسیارێکی دیت لێ بکەم ئەحمەدخان دەڵێ پیرێژن ئەوپرسیارەشم لێ بکەوهیچی دیکەم مەخافڵێنە،پورەخواز :مارەیی دایکی تۆچەندبوە،ئەحمەدخان: ئەوەچەپرسیارێکە لێم دەکەی زێدەلەدایکان مارەیی داکی من پێنج کەتەدیناربوە،

پورەخوازدەڵێ مارەیی دایکی کانەبی چل لیرەبوە ،ڕەوەی کانەبی بەتۆناخورێ بەجیی بێڵە ولەڕیی خۆت برووخۆت بەهیلاك مەدە.

ئەحمەدخان چی دی جوابی پورەخوازێ ناداتەوەڕەوەی.ڕەپێچەك دەدا وپورەخوازیش دەزانی تازەبەقسەی ناکا وجوابی ناداتەوە.وەکوتۆکەرەکانیش بێکار ڕاناوەستێ ودەست بەخۆیدابرناداتەوەبەردو،وداروخۆڵێ دەبەرڕەوەی هەڵداوێ ونیوەی ڕەوەی بردەبی ودەگەڕێتەوەبازرەدەبی وهەڵدێتەوەودەڕوابۆسەرینچاوەی برایم ڕەشکی ویان پشتی بەردی گوێزێ ،ئەحمەدخانیش ناوێری چیدی ڕاوەستی باقی ڕەوەی دەباودەڕوا.

لەلای دیشەوەخەبەرێ بۆکانەبی دەبەن وئەویش زوێکی دەکەڕێتەوە پەلاّساوێ

وپرسیاریَ نێوونیشانەی ئەوکابرایەی لەدایکی دەکـات هـەتابزانی کێیـەڕەوەی فڕانـدوە٠،
دایکیشی پیی دەڵـیَ .گوتویـەتی نێوم ئەحمەدخانـە وئەحمـەدخانی باڵـەکیم پێدەڵێـن٠،
ئەوجارلەدایکی دەپرسی چی دەبن دابو،دایکی دەڵیَ سواری ئەسپێکی کوێـتی قـاپ ڕەش
ببوکەفەڵی ئەوەندەپان وبەرین بو،دەت کوت فیلەتەختی لەسەردابەستراوە ،

ئیدی کانەبی دەی نا سیت وەەربەخۆوبەتۆکەرێکی وەد وای ئەحمەدخانی دەکەویَ٠،

ئەحمەد خان لەزۆرجێگایان خەریك بوەشوێنەوەنکەی بـەڕەوەی بکـا بـەلاّم کانـەبی شوێنی ون نەکردون وکەوتوّتەدوی ڕەوەی هەتا دەدەشتی شنۆییەی کردون وگەیشتونەتە قرۆشاویَ و لەقرۆشاویَ شنویە کانەبی دەگاتەئەحمەدخانی بـەڕەوەوە،پێشـی لیَ دەگری ودەڵیَ ئەحمـەد خـان ئـەوە سـەرت لەچـەندی هیناوەهـاتوی ڕەوەی کانـەبی دەڕفێنی ،

ئەحمەد خان دەڵیَ ئەمن ڕوحمم پیَ کردوی خۆدەنا ماڵَ ومناڵەکەشـم بـەتالآن دەهێنـای هێندێك قسەوبەبەرێك هەلاّچون هەرەشە ئـەوجار ئەودوپاڵەوانانەبـەگورزان وەردەگەڕێنـە یەك تری،دەگەلَ تۆزی بەری پییَ ئەسپان هەورێك دێتە ڕوی ئاسمـانیَ،هەتاهـەردوك شـل وشەکەت دەبـن ئاخرەکـەی کانـەبی ڕمبێکـی لەئەحمـەدخانی دەدا وئەحمـەدخان لەسـەر ئەسپەکوێتی دەکەوێتەخواریَ وئەگەر ئەحمەدخان لەسەرئەسپی دەکەویَ ودەشزانی تازە لەکەلك بوەودەمریَ لێرەفێڵیَ لەکانەبی دەکـاوبۆغللوربونیَ برێـك تـەعریفی کانـەبی دەکـا وبۆجیَ بـەجیَ کردنـی گەلاّلـەی فێڵەکـەی خـۆی دەڵـیَ کانـەبی بەحەقـەت ئـەمن هەڵـەم کـردوە،دەنادەبـا،لانـی کـەم بەقسـەی دا یکتـم کردبـا کـەپێی گـوتم ڕەوەی کانــەبی بەتۆناخوریَ ڕاستی پیَ گوتبوم،ئێستاش ئەمن کـوژراوم بائـەوڕمب وشیروگورزانەبۆشـوان وگاوانان نەبن حەیفە وەرەلێم کەوە لێت حەلاّلَ بن٠ وقابیل بەتۆنە،

کانەبیش بیَ خەیالَ لـەوەی کـەبزانی ئەحمـەدخان فێڵـی لیَ دەکـا دەچـی ئەسـپابی شەڕێی لیَ بکاتەوەئەحمەدخان قەرەبینای پیَ دەبی ئەویش قەرەبینایـەکی لـەدم وچـاوی کانەبی دەدات ئەویش دەکوژریَ وکەلاکی بەسەرکلاکی ئەحمەدخانی دادەکەویَ هەریەکەیَ دەکەونەدەنێودێراویکی،تۆکـەرەکانی ئەگەرلەپەلاّساویَ ڕادەکەونـەدوی وئەوکارەساتەی

دەبینن ڕەوەی دەگێڕنەوەرومەیتی کانەبی وئەحمەدخانی دێننەوە پەلاساویٚ وکانەبی هەرلەپەلاساویٚ نێژراوەوغەلێ کانەبی ئێستاش هەروەکوخوی ماوەتەوە بەقەرارێکی دایکی ئەحمەدخانیش هاتۆتەپەلاساویٚ ومەیتی هەردوکانی دیوەوگوتویەتی کوڕی من وەکونەکوژرابی پێم وایەچونکەبەدەست پالەوانێکی لەخۆی پا لەوانتر کوژراوە،

دایکی ئەحمەدخانی چونکەهیچی نەزانیوە٠،هیچی نەگوتوەبەلام دایکی کانەبی چۆنی بە کوڕەکەی خۆی هەلاکوتوە، ئاواش بە ئەحمەدخانی هەلاکوتوە.،

دیارە پیٚ هەلاگوتنی خوازی دایەکانەبی لەبەر ئەوەی بوەگوتویەتی کوڕەکەم بەدەست خوێڕیەپیاوێکی نەکوژراوەوبەلکەبەدەست پالەوانێکی کوژراوە لەخۆی زۆرپالەوانتروبەکارترە،ئەوەش نەقلێك وداستانێکی دورو درێژ تری هەیە، دیرەدا ناگونجی ویا ئەمن چیدی لیٚ نازانم. ئەوەش دوچوارێنەو.دوبەیتی دایکی کانەبی:

کانەبی بو ئەحمەدخان ئەی سەلات لە من کانەبی
جوگەلێکیان بو نیوان، ئەی سەلات لە دایە ڕابی
ئەی گورزیان نۆربە نۆر لێلدان ئەی سەلات لەمن کانەبی
هەردوکێان بون مالوێران ئەی مەگەرقوچ عوسمان وابی
کانەبیم ئەگەرپیٚ دەزانیٚ ئەی سەلات لەمن کا نەبی
ئەسپی دێنێتەجولانیٚ ئەی کۆینت دەبەردایە بی
هات گرتی بەری مەیدانیٚ ئەی سەلات لەدایەڕابی
تۆزگرتی بەری حاسمانیٚ خۆمەگەرقوچ عوسمان وابی

---

١-بەژنی کانەبی بەمن بمێنی بەویٚ داریٚ بەویٚ خەلفەچناریٚ ئەگەرشین دەبون لەسەر کۆتەلی دەئاشی

لکێکم لیٚ داوێتەوەسەرئاویٚ وئەوی د یکەشم لیٚ داوێتەوە سەرداوێنی شۆڕەبیەکانی شاجۆکەوولێواری دەجۆیەئاشی٠،

لەپاش مەرگی کانەبی فەقیٚ وەیسی سەردارحێلی ڕەمکان تازە هیچ کە س خوازی

سەربەتاڵ وبابان وێران ڕاناگری ئەبەسەر شۆرو کڵفەت ئە.بە.لەلەو قەرەواشی٠،

٢- دەوەرن ئەسپی کانەبیم بۆبێننەوەدەرێ لەوێ خاوێ٠،

یالێ وبڕانی بشۆن بەمیشک وعەنبەران بەعەتروعتوری دە عەتاران ناوە لەلا

هەربەشوشەی دەگوڵاوێ٠،

خۆ لەپاش پیاوێکی وەکوکانەبی فەقێ وەیسی سەردارحیلی ڕەمکان تازە هیچ کەس ڕاناکری خوازی سەر بەهەش ومل بەدەوار ، بەلەلەووقەرەواش وسەرشۆریشیان پێ ناوێ٠

٢ ـ **گۆرانی** :خواڵیخۆشبو، کاک محەممەدی ماملێ، دەنگ خۆش و گۆرانیبێژی بەناوبانگی کورد گۆرانێکی بە پەلاساوی هەلاکوتوە، ئەوە ش چەند نمونەی شێعرەکانی، وەکی باس دەکەن ئەوشێعرانەکاك سێمانی شاوەلەی دایناون یان هەرکەسێکی دیکە.

ئەسپەکوێتم بۆ زینکەن، دەڕۆم دەچم بۆ ڕاوێ
میر دەستوری پێداوم ،بۆخۆم دەگرم سەر ڕاوێ
خۆی لێ مەلاس کردومە،لە بن پنجی ژاراوێ
شینکێت بۆ هەڵدەستێنم، لە موچەی پەلاساوێ
نەجیبە تۆم نەجیبی، بۆ گشت دەردم تەبیبی
نەجیب! بێنە ڕاموسا نێك، با نەمرم لە غەریبی
نەهاتی ڕوی تیکردوم، کەوتومە ئاشبەتاڵی
تەیری بەختی من ڕۆیی،دای لە تەقەی شاباڵی
بە قسەی بەکرە شوفاری، کەوتومە، سیاچاڵی
ڕەشمەلەسەرئەسپی کوێت،لەسەرچی دادەماڵی
نەجیبە تۆم نەجیبی،بۆ گشت دەردم تەبیبی
نەجیب بینە ماچت بکەم،با نەمرم لە غەریبی

٣- **پیرساڵ**: یەکێك لە ئەسحابەکان بوە لە سەرەوەی پەڵاساوێ لەبن ڕەوەزێ، بەخاکێ ئەسپێردراوە. دارەگوێزی لێن ودارە گوێزەکان مەوقوفەی پیر ساڵین واهەبوە سەیدقادری دێوانە یاکەسێکی دیکە ئەوگوێزانەیان پاوان کردون وبۆیەشیان پاوان کردون دەیان گوت با.بەناکاملێ لێ یان نەکەنەوەوبابەباشی بگەن دەنابۆفرۆشتنێ نبوە ئەوساڵەی پاوان کرابان دەنکەگوێزێکیان پێوەنەدەبو؟بەشامیدی هەموخەڵکی خورینج ودەوروبەری.ئەودارەگوێزانەش ،بۆیەتائیستاماونەتەوەکەس ناوێری دەستیان لێ بدات هەرکەس لکەدارێکی هینابێتەوەزەرەرێکی زۆرگەورەی لێ کەوتوە؟

٤- **پیرساڵ**: پێش شەهیدبونی لەبەرەوەی گڵکوکەی، لەبەردی وەسەرکەوتوە،چۆکی داداون، ئێستا جێ چۆکی زۆربەجوانی لەسەربەردەکەی دیارن پیێ دەڵێن جێ جۆکان.

٥ - **قەلات**،گویاشا یاحاکمی کاتی لەسەرقەلاتی ماوەتەوەبەقەولێکی لەسەرکانێ پەڵاساوێ شێویان لێ ناوە وچونکەلەسەرقەلاتێ ناوێکی وای لێ نەبودەنا؟ئێستاش ئاسەواری خان وبەرەو،جێ چاڵاوی هەرلێ ماون،دەست بەدەست مەجومعەیان بردۆتەسەرقەلاتێ کتکان چونکەئەودوندەشاخەی ڕوبەڕوی خورینجی قەلاتێ کتکانی پێ دەڵێن.

٦- **سەید ئەحمەدان**: کێوێکەوابزانم کەمێك لە قەلاتی کتکان نەویترە، کەوتۆتە باشوری گردەبنی و باکوری بابەکراوێ و قوبلەی خورینجی. خوالێ خۆش بو کاك محەممەدی ماملێ گۆرانیەکی بەئەوجورەی بە سەید ئەحمەدان هەلاگوتوە، نێوی بەردەسپیلکەی تێدایە کەبەردەسپیانە،کەوتۆتەڕۆژئاوای گردەبنی

دەچمە سەرسەید ئەحمەدان کانێ زەردم لێ دیارە
دەستت دە عومری گرێ، شێخی مال لە بیارە
بەردە سپیلکە چۆنە، جێ ڕاوگەی خۆم و یارە
زێنەبێ هەی زێنەبێ،زێنەب دوددانی زێڕە

ئومـــەتی محەممـــەدیم لـــە دینــم وەرمـــەگێڕە
دەرد ێکی و ا ی دا وەمەتیێ کا فـرحا لَم نـەبیــــــنیێ
گەلی دوست وبرادەران بـۆم بگێرن گەرمـەشیـــــنیێ
خۆدەڵێن لێرەنەماوە چۆتە چـین وما چیـــــنیێ
زێنەبیێ هەی زێنەبیێ لەزێنـەبەئەی قەلاَتــــان
دەری بابا نت شێـویێ نێوت کـەوتە و لاَتـــــان

٧ـ **ڕەوەزی کێوی بەردی گوێزیێ** ؟ بۆ لای دێی کێلـەسیپان هەڵدێرە.

لە پشتەوەی تا ئەندازەیەك گۆڕە، ئەو بەیت و باوانەی کە گوتویانە وادەردەکەویێ، خەج و سیامەند؛ ئەو دو عاشقە میژوییانە، کە ئاموزای یەکتریش بونە لەگورەپانی پشتی بەردی گوێزی،بۆ وچانـدان یاخۆشاردنەوەی ماونەتەوە.سیامەند لـەویێ دەگەڵ کەڵـەکێوی بەشەڕهاتوە، هەرچەندخەجی ئاموزای، بـانگی کردوەوگوتویـەتی ئـاموزا وەرەلـە شـەڕی کەڵـەکیویان گەڕیێ، شەڕ دەگەڵ ئەوانە باش‌نیە، ئاخیری بەقسـەی نەکردوەوخەنجـەرێکی لەکەلەکـەی کەڵـەکێویێ گچکەلانەکـەی دداو کەڵـــەکێوی دەکـوژریێ لەگـەڵ لینگەفرتـەی شەقونێکی دە سیامەندی هەڵدەداوبەسەرپەلی دارەبەنیێ دا،دەکەوێت و سیامەند.دەمـری، و خـەج شـینێکی زۆری بـۆ دەگـێڕیت وبەبـەندان زۆری پــیێ هــەلادەڵێت، کــە ئــەوەش، داستانێکی تایبەتی خوی هەیە.دوایەخەجیش بەسەرپەلی دارەبەنیێ دا بدوای سیا مـەندیدا خوی هەڵدەدێری ودەمری جابراکانی خەجێش دەگەنە سەریان.

٨ـ **گرد خەزێنە**:گرد ێکی میژوییەو هەربەئەونێوەش نێوی دەرکردوە لەسەر.ڕێگـای کێلەسیپان و خورینجیە.

٩ـ **کانیێ کۆخەی**:قەدیم دوکتور کەم بونە،ئەوەی کۆخەی دەگرت، دەچـون لـە کـانیێ کۆخەی ئاویان بۆ دێنـا، ئاوەکـەی دەخـۆاردەوەو چـاك دەبوونـەوە بـەلاَم ئاوهینانەکـەی ئاوابوەدەبابـەیانان زوچوبـان ولـەویێ ئاوریـان کردبـاوەو،ئاوەکـەیان هێناباتـاوی ویێ نەکەوتباو،هەتادەگەیشتەوە.نەدەباناوپیشیان داباوەدوایە،لەنیزێکی کانی ئەشکەوتییە.

### حەیارەی خوێیە

دەگێڕنەوەودەڵێن کابرایەك ژنێکی هەبوە.چونکەئەوژنە،مێردەکەی خۆش‌نەویستوە، جا مەعلوم نەبوە بەرخوێن بوە یان ژن بەژنەی پێ‌کرابو یان .. هەرچیشتێکی لێی نابا بێ‌خوێ بو؟یان لەبەرسوێریان نەدەخورا.جا بابزانین چەکلاوێکی لەسەری مێردەکەی دەنێ وچۆن وبۆکوێی بەرێ‌دەکا.

ڕۆژێکی کاك ڕەسولْ دەڵێ ئەری ئەستی ئەتوئەوشیوانەی لێ یان‌دەنێی زۆرخۆشن ؟ بوۆیان لەبەرسوێری ناخورێن یان ئەوەندەبێ‌خویەوهیچ تامێکی لێ نایە؟

ئەستی لەسەرەخۆ:چت لێ‌وەشێرم، حەیارەی خوێیەم لە ماڵە بابم لەبیرچوە، ئەوە بۆیە شێوەکان یان بێ‌خوێ یان دەناسوێرن. ژنە بۆخوێ بەخوێ گوت هەرنەبی سێ چوار ڕۆژان لەبەر چاوم ون‌دەبیت.

ڕەسولی بەدبەختیش باوەڕی پێ‌دەکاو:ئەدی ئەوەچۆن‌دەبیت؟

ئەستی دەزانی باویەتی خوێ لێ مۆن دەکاتەوەودەڵێ چۆن دەبیت چییە؟!

بەغارێکی بچۆماڵەبابم سەرێکییان لێ‌دەولەکن دایکم حەیارەکەشەم بۆبێنەو.وەرەوە!

بەڵێ ! ڕەسولْ لە مەکری ژنان حاڵی نەبوە،باوەڕی پێ‌دەکا، بەیانی زو پاروە نانێکی دەخواو وەچا خواردنەوەی ڕانەگەیشتوە.یا نەیان بوە،:بەڵکو زو بگەمێ، کاڵەو پێتاوی لێ هەڵکێشاو بگرە ماڵە خەزورم هاتم بەپێیان وهەربەغار.

سبەێنێ لای نویژی شێوان کە گەیشتە وێ پاش لێ پرسین وچاك وخۆشێ پورئامانێ خەسوی دەڵێ ئەری ئەستی چۆنە؟

ڕەسول:وەڵڵا زۆر باشە، سڵاوی لێ‌دەکردن.

پورئامان دەڵێ ئەدی ئەوە چۆنە هاتوی ئێرەت پێزانیوەڕەسولْ؟

ڕەسولْ:ئاموژن!ئەستی حەیارەێ خوییەی لێرەلەبیرچوەو ئەمنی ناردوە بۆ حەیارەی خوێ یە.پور ئامان دەڵێ هەی عەمری نەمێنی بەوەی لێ‌کاوبەوەی تێ کا.

ڕەسولْ: بەخودای ئاموژن هەتا دەگەمەوە لەبیرم دەچیتەوە،پساوم!

پور ئامان:جابۆ لەبیرتدەچیتەوە، هەربرو بڵێ بەوەی لێکەو بەوەی تێکە.

گوتی وەڵلا باشە هەردەڕۆم و وادەڵێم. شەوێ لەوێ ماوە بەیانی پاش نان و چا خواردنێ هەستا خەریك بو وەڕێکەویت ڕەسولێ:ئامۆژن! جاخۆ لەبیرم چۆتەوە.

پوورئامان وەبیری هێناوەوپاش خواحافیزی وەڕێ دەکەوی لەدی وەدەردەکەوێ و.کەم مابودیسان لەبیری بچیتەوەوبگەڕێتەوەبۆکن پورئامانێ،وەبیرەخۆی هیناوەو،بۆ ئەوەی تازەلەبیری نەچیتەوەدەستیپێدەکابەوەی لێکەبەوەی تێکە.جاروبارەش چون کەیفی زۆرسازبوکردبویەگۆرانی زۆرپۆیی گەیشتەکابرایەکی جانوئەسپێکی تۆڕیان بوگرت بو، سواری ببو.هەتاڕامبێت،ڕەسولێ بەدەنگی بەرزەوەدەیگوت بەوەی لێکەبەوەی تێکە.

هەرایان کردی وگوتیان کابرالەسەرەخۆ! کابرا بێدەنگ بە ئەوەچەهەڵلاهەڵلات داناوە!

نەخێر! بە کێ دەلیێ ئاخر لەبیریدەچیتەوە، گەیشتەلای کابرای سواروگوتی بە وەی لێکە، بەوەی تێکە. جانو ئەسپ ڕەویەوەو کابرای سواری لە سەرتەختی پشتێ لە عەرزێ ڕاکێشا، جانوئەسپ بەربوهەڵات و غاریاندا کاك ڕەسوڵی، هەتا توانێان کوتایان وگوتیان ئەوەبۆبێ دەنگ نابی بەکرێ گیراوی چەیە.

گوتی ئەدی بڵێم چی؟ وایزانی ئەوە حەیارەی خوییە نیە گوتیان هەر بڕۆ بڵێ پیرۆزوموبارەك بێت یاخوا لێت موبارەك بێت هەموڕۆژێ خێرێکی وات بەنسیب بی.

گوتی زۆرچاکە،چونکەئەوەندەیان لێ دابو تێکەو لێکەی هەرلەبیرچوبۆوە.

بەڵێ کاك ڕەسولێ وەڕێکەوت ودەستیپێکرد:پیرۆزوموبارەك بیت یاخواموبارەك بیت، گەییشتە قەراغ شارێکی تاقەکوڕەی پاشای مردبو،دەیانبردبۆقەبران،ڕەسوڵی بەدبەخت گەییشتەنێوعالەمی:پیرۆزوموبارەك بیت یاخوالێت موبارەك بیت هەموڕۆژێ خێرێکی وات بەنسیب بی؛ هەرچەندعالەم پییان دەگوت بێدەنگ بە کوڕە! بێدەنگبە! نەخێربەکێ دەلێی؟! سێ چوارکەس غاریاندایەوکوتەکێکی باشیان لێدا،گوتی ئەدی بلیم چی؟!

گوتیان دەڵەی چی هەربڕۆوبڵێ خوا عەفوی کا خوا لێی خۆش بیت دڵەی چی.

پاش برێك حەسانەوەی کە هەر دەشیگوت نەبادا لەبیریبچیتەوە، وەڕێکەوت

ودەستی پێ کرد:خوا عەفوی کا خوا لیێخۆش بێت، گەییشتە دییەکی لەقەراغ ئەو دێیەی شەڕەسەگ بو،سەگێکیان خینکاندبو خەڵك لە سەیری شەڕەسەیە ڕاوەستابون، گوێیان لەڕەسوڵی بودەیگوت خواعەفوی کات خوالێیخۆش بیت! وایان زانی بەئەوسەگەی دەڵێ خوا عەفوی کات؟

هەرایان کردێ کابرائەوەچ دەڵێ؟ بێدەنگ بە! خۆئەوە سەگە،حیسان نیە ئەتۆدەلیێ خواعافوی کاخوالێی خۆش بی؟
نەخێر،هەروای دەیگوت ولیێنەدەبڕیەوە، دو نەفەر غاریاندایە تێڕ و پڕیان کوتا و، دەخوڵێیان وەردا هەستاوە، بڕێکی خۆ تەکاندو گوتی ئاخر ئەدی بلێمچیی؟!
گوتیان دەڵیێ چی؟! هەر بڕوۆبڵێ ئەوچەقەچەقە چیە؟! ئەوحەچە حەچە چیە؟!
بەڵێ! کاك ڕەسوڵی تۆزاوی:زۆرباشەخوڵیمنادەن؟! ناناکەس لیێت نادا،ئەگەرهەروابڵێیێ؟
کاك ڕەسولێ وەڕیکەوت و دەستیپیکرد:ئەو چەقەچەقە چیە؟! ئەو حەچەحەچە چیە؟!
گەیشتەدێیەکی لەبەرەوەی ئەودێیەی حوجرەی فەقێیانی لێبوچاوی بەفەقێیان کەوت دیسان هەرلیێی نەدەبڕیوەودەیگوت ئەوچەقەچەقە چیە؟! ئەو حەچەحەچەچیە؟!

فەقێیەکان لەسەرسەکوی پێش حوجرەی دەوریان دەکردەوەودەهاتن ودەچون بەدیتنی ئەوانیش بێ دەنگ نەبو، فەقێ ئەگەر گوییانلێبو زۆریان پێ ناخۆش بوپێیان وابو بەوان دەڵێ هەرچەند: بێدەنگ بە کاکە بێدەنگ بە! بێدەنگ نەدەبو نەبادا حەیارەی خوێیەی لەبیربچێتەوە ئەوانیش غاریان دایەهەتا توانێان کوتایان کاك ڕەسوڵ لە لێدانی فەقێیانیش بێبەش نەبو، گوتی باشە! ئەدی ئەمن بلێم چی؟!
گوتیان کوڕە بێشعور! ملی خۆت بشکێنە،هەربڕۆ بڵێ ببنەمەلا، ببنەفەقێ جارجارە چەپڵێکیشی بۆلێدەو.وابڵێ لەبەر بێ عەقڵیانی نەیدەزانی لەسەرئەوکارەبێ جێیانەی لێ دەدەن.بەڵێ کاك ڕەسوڵ پاش ئەوهەموەکوتانەی وەڕیکەوت هەردەڕۆی ودەیگوت ببنە فەقێ،ببنەمەلا،ئەگەرچەپڵەکەی لێ دەدا هێندەی چەپڵە پێخۆشبو،ئێش وئازاری هەمو لێدانەکانی لەبیردەچۆوە،بەلام ئەویان زۆری دەوام نەبولە دیی وەدەرکەوت گەییشتە

سەرکانێەکی دو ڕاوچی چەندرۆژبو دە سیپەیدا دانیشتبون سیس ببون ؛هیچیان وەدەستنەکەوتبو.ئەودەمەی مراویان بۆهاتبوبەرلولەی تفەنگی،ئەگەرکاك ڕەسوڵی چەمبەری بەحیندرحوۆلەولای ڕامات گوتی ببنەفەقێ ببنەمەلا؛ ڕاوچیەکان هەرایان کرد :کابرا بێدەنگبە ؟کوڕە بگەڕێوە؛ لەگەڵ چەپڵەلێدانو ببنە فەقێ و ببنە مەلای ؛مراوی هەڵفڕین؛ ڕاوچیەکانیش لەتاومراویان؛غاریان‌دایە؛ ئەوانیش خوریشۆری چاکێان کوتا؛

ڕەسوڵی سەرلێشێواو:ئاخر ئەوە چەندجارو حەیارە پێ‌گۆڕیم؛ ئەدی بلێمچی؟!

کەگوتی حەیارەبڕێکی دیکەشیان لێدا زانیان زۆر بێ دەسەلات وخوێڕیە ؟

ئەوجار پێیان گوت ئاوا بە ماتەماتە بڕۆپشتت هەڵنەیەنێوە ها!

ڕەسوڵ بە ماتەماتە وەڕێکەوت؛ لەوان تێپەڕی زۆرڕۆیبو؛ڕێگای کەوتەقەراغ بێستانێکی؛بەکوڕەکوڕەدەڕویی؛تازەدزهاتبونەزگ بێستانی وڕێیان‌کەوتبون؛ئەگەرچاویان بە کاك ڕەسوڵی کەوت کەئەوەبەماتەماتەدێ؛گوتێان ئەوەتا دزێکی دیکەبەماتەماتەدێ.

بێستانچیەکان غاریان‌دایەلەبەریان هەڵ نە هات و هەر یەکەی دوسێ شەپ و زللەیان لێ دا؛هیندەی وێکەوتبوبەدەنیان خاراندبوو؛گوتی ئەدی بە قوربانوبم بلێم چی؟ بێستانچیەکان زانیان ئەوە دز نیەفێڵی لێ کراوە زگیان پێ سوتا وگوتیان کوڕە بەدبەخت ئاوا قیت و قنج بڕو بو بە ماتەماتە دەڕۆی؛هەر دامەیەوە.

کاك ڕەسوڵ وەڕێکەوت، هەروا قیت ؛دەتگوت بەرچیغی قوتداوە؛گەییشتەوە دەرکی ماڵێ بانگی خێزانی کرد:ئەستی! ئەستی دەڵێ ! دە وەرە ژوری!

ڕەسوڵ:ناتوانم، دەبی سەردەرانەم بۆ هەڵدڕی. ئەوجار خات ئەستی هاتەدەرێ لە پشتەوەڕا پێلاقەیەکی بە پشتێ دادا ڕەسوڵی گیان‌خاراو نیوچاوانی وە سەردەرانەکەی کەوت، پێلاقێکی د یکەی پێدادا، ڕەسوڵ کەوتە نێوەڕاستی ژوری و بێ هۆش بو ؛دوایە کە وەخۆهاتەوە هیچی لەبیرنەمابوکەبۆئەستی خانمێ بگێڕێتەوە؛ئەستیش لەکەم هەتا زۆری باسی ماڵەبابی یان حەیارەی خوێیە وهیچ شتێکی نەکردو شێوەکانیش چا بونەوە.



## قەل و کۆتر

لە زەمانەکانی قەدیم دەگێڕنەوەدەڵێن ساڵێکی دەپاییزێ دا،قەلێك لە ڕەفیقەکانی بەجێ‌مابو،وزۆرگەڕاکوترێکی دیتەوە؛چونکەقەل نێرەبووکوترەکەش مێیەبو،پاش وتو وێژێکی زۆرکوترڕازی بوو ڕێکەوتن و،مێردی بەقەلەکەی کردو بەزەحمەتێکی زۆرهێلانەیان دروست کرد وەختی هات دوهێلکەی تێ کردن دەوەختی خۆیداکورك بو جووجکەی هەڵێنان،پاش ماوەیەکی جوجکەکان پەرِوازەبون،هاتنە هەڵ فرِینی،لەسەر جوجکەکان قرِرەیان لێ‌پەیدابو،چونکە قەل دەیگوت ئەمن هەربۆخۆم تەواوی خواردەمەنیم بۆ هیناون ولەهەمو بارێکەوە، ئاگاداریم لێ‌کردون و جوجکەکان نادەم بە تۆ.

لەولامدا کوتردەیگوت ئەتوهەرخۆت بەخیوکردوەو.هەر قازانج بە گیان ولەشت گەیشتوە، تەنانەت لەبەر هەوەسێ دەگەڵ من تێکەڵ بویەو ئیستاش هیچ حەقی مندالانت نیەو نابی باسیان بکەی، چونکە تەواوی کوێرەوەری لە ئەستوی من بیت و جەنابیشت ئیستا هاتویە سەر حازری ودەڵەی جوجکان نادەم بەتۆ چۆن وایە.

بەڵێ! بەئەوجورە هیچیان بۆهیچیان نەدەسەلماند،ناعیلاج چونەلای قازی هەتاحاکمی مسوڵمانان ڕێگایەکیان بۆدانێت وکێشەیان خەلاس کات بەئەوجورەی لەحزورحاکمی هەر کەسەقسەی خۆی کردو قازی پیێ‌گوتن، هەرکەسێکی دەلیلی گەورەتری لە سەرمخالیفی خۆی بێنێتەوەجوجکەکان بۆوی دەبن،ئەبەئەوجورەی قەل دەستیپێ‌کرد وچەندکەسێك لەحزورقازی بون وگوێیان لەکێشەوەرای قەل وکۆترێ بوخستیاننە ژێرچاوەدێری خۆیان و،لەوێ مانەوە وگوتیان بابزانین ئەوانەچەدەکەن وجوجکەدەبنەئی کامەیان.

### وتاری قەل:

جەنابی قازی دەگێرنەوەدلێن؟پاشایەکی زۆردەوڵە مند.لەولاتێکی دەژیا هەرچەند ئەوپاشایە وەکوشایەکانی دی ماڵێکی زۆروبەلام بەبێنەوبەرەوو.زورئاوەدان نەبو تاقەکورێکی هەبو نیوی ئەحمەد بو، هەرچەند کورەکەی خەریکی خوێندنێ‌بو بەلام پاشاهەتابۆخۆی مابو، ژنی بۆ هینا زۆری پێ‌نەچو پاشای بابی ئەحمەدی مردو ئەحمەد

تەنیا مایەوە لەگەڵ ئەوەی ژنەکەی بەخواستی خۆی و بە د ڵی خۆی مێردی بە کوڕی پاشای کردبوو بەدڵی یەك بون؛ هەموڕۆژێ ئەو کوڕە وەکو شاگرد مەدرەسەیەك بەیانان دەچوو دەرس‌خوێندنێ، بۆ نیوڕۆژ وشەوانە،دەهاتەوەماڵێ؛زۆربە خۆشی ئەودو دڵدارە ڕاێان‌دەبواردو،هەرچەندجارێ ئەحمەد.دەهاتەوەماڵێ وچاوی بەبەژن وبالاوگفت ولفتی خانمێ و وەزعی ماڵەکەی دەکەوت ماڵێکی ئەوەندەخۆشیشیان هەبوگەزگەزێ بالادەبو. ومێشك ودڵی بۆخوێندنێ هانی دەدا،بێ‌خەبەرلەوەی ژنێ ئەحمەدی ڕۆژێکی لەسەرقەلاو بالاخانەی بەلەنجە ولاردەهات ودەچودیتی لاوێکی تازە پیی گەیشتونێوی سەعدون بوو، مەجومعەیەکی جغارە پێیە بۆفرۆشتنێ بەکوچەی‌دادەڕوات خێزانی ئەحمەدی جغارێکی لە سەرێڕا هاویشتە نێوجغارەی سەعدونی جغارەفرۆش.

سەعدون دیتی، جغارەیەك هاتەنیوجغارەکانی تەماشای کرد لە سەرەوە ژنەی دیت و گوتی ئەوەئەوجغارەت بۆ هاویشتەنێوجغارەکانی من؟!

خێزانی ئەحمەدی دەڵێ جغارەی من هەربۆ نێوجغارەی تۆباشە!

ژنێ ئەحمەدی لەسەرەوەوسەعدونی ڕەبەنیش لەخوارێ دەستیان بەقسان کردو بەکورتی،کاکەوبرالەیان کردوپێك هاتن ،وادیاربوەئەوەهەلەی زۆرپێ خۆش بوە هەرچەندجێی ترسێ بوەبەلام جحێلێ ڕۆژی واترس ومرسی نامێنی،بەڵێ سەعدونی جغارەفرۆشی بردە وەتاغەکەی خۆی وسندوقێکی گەورەی بۆدروست کردکەپێیان‌دەگوت یەغدان ئەگەر ئەحمەدی مێردی دەهاتەوە، دە یەغدانەکەی دەناو،دەنا دەهاتەدەرێ و خەریکی ڕابواردنێ دەبون، هەتا ڕۆژێکی ئەحمەد بەبێ ئەوەی فکروبیرێکی لەهیچ شتێکی کردبێتەوە وبەبێ‌وەختی هاتەوەماڵێ، یانی نەنیوڕۆژبونەشەو، هەرچەند،ئەوکۆشك وتالارە لەدەروازەیەوە تا دیوی دانیشتنێ سێ زەنگی هەبون بەلام خێزانی بەشەپرێوی دیت و هیچی نەگوت و هەروابەبێ دەنگی وەکو هیچ نەبوبی گەڕاوەبۆمەدرەسەی.

ئەحمەد ئەوماموستای لەکنی دەخوێند دەگەڵ یەك زۆرسەمیمی بون، هەرڕازێکی ئەحمەدهەیبابەماموستای دەگوت،بەتایبەتی وەزعیەتی خۆیێ و ماڵێ.

کەچۆرەلای ماموستای ئەوەی چاوی‌پی‌کەوتبوبۆی گێڕاوە،مام وەستا پێی گوت ئەحمەد بچو،زەنگی ئەوەڵێ بەلوکەی بئاخنە ودیسانیش هەربە بی‌وەختی بچۆوە ماڵێ، ئەحمەد.بەدەستوری ماموستای کارەکەی کرد،ئەوجارخێزانی شەپریوتر د یت هەتا زەنگەکەی دوهەمیشی بەست ئاوا، بوی مەعلوم بو کە شتێك دەگوڕێدا هەیەو خێرایەکی،چو ئەویشی بوماموستای گێراوە.

ماموستا،گوتی زەنگی ئاخریش ببەستەوەهەربەبی‌وەختی بچۆوەبزانەچ‌دەبیت وچ دە بینی بەلام هێدی ولەسەرەخۆو وشیاربە.ئەحمەد.

ئەحمەد.ئەوجاریش بەقسەی ماموستای کردوزەنگی ئاخریشی بەلوکەی ئاخنی وەژورکەوت خانم هەرئەوەندەی پی‌کرا.سەعدونی دەسندوقی هاویت وبوخوشی هەروابەروتی لەسەر سندوقێ دانیشیت

ئەحمەد.لیی‌پرسی ئەوەبوواخوت روت کردوتەوە،لەجوابدا،دەڵێ ئەحمەدشا،بەخوای هێندەگەرمایەوەختەبخنکێم هەرسوزەی باشی نایەئەوروماڵتە.

ئەحمەد ئەگەر ئاوای دیت لەبەرخوێریەتییێ؟دەست وپێ سپیلکەیی خۆشەویستێ ژنەکەی هیچی نەگوت بەلام هەمو هیوایی ژیانی دەگەڵ ئەوژنەی چۆوە فەنایە، وەك دەڵێن ریسەکەی لی‌بووەبەخوری،وەدەرکەوت وابەعاجزی،روی دەچواریاغی کردلەسەر کانیەلەبن دارێکی بەغەمناکی دانیشت،هەرفکری لەوەزعی خۆی وژنەکەی دەکردەوە،

ئەی ئەهلی مەجلیس جەنابی قازی ژن ئەوەتاعەمەلی ئاوایان هەیە،چ بەقابەژنان دەکەی.

دەروێشەکەی دی وەخو هاتەوەو؛ئیدی لەبیرچۆوەبچیت ئەومەوزوعەی بۆمەلای بگێرێتەوە ؟ئەودەروێشەکچێکی بەمنداڵی کری بوهەرلەمنداڵێش راروحی ئەوکچەی دەعەسای کردبو پێکەوەدەغارێدا.دەژیان هەمیشەوبۆهەموجێگایەکیش ئەوعەساییەی هەربەدەستی وەبو؟ دەورێش هات لە بن دارێکی دانیشت، جانتای داناعەرزی وعەسای لەسەر جانتای داناو پەشتەماڵێکی راخست، برێکی تەماشای ئەولاو ئەولایان کرد، کەسی

نەدیت. ئەحمەدیش چونکە وای خۆڵشاردبووە،ئەویشی نەدیت و، دەروێش عەسای دەستدایە هەڵی هاویشتە حەوای، تەماشای کرد بوبەژنێك هەتا دەست هەڵێنی کەڵەگەت و جوان و خوێنشیرین، هەرخۆش‌بو تیێ وەرامێنی.

دەگەڵ دەروێشی دەستیان دە ئەستوی یەکتر کردوپاش سوحبەت و عیشق‌بازی دەروێش دە هۆشەوەچو وبێ هەست لیێ کەوت.

ژنەش،هینای برێکی دەرمانی بێ هۆشێ بەدم ولوتی دەروێشی‌داهیناوبەتەواوی بێ هۆشێ کرد،ئەوجاردەستی دەباغەڵێ ڕاکرد؟سێوێکی سوروگەشی دەرهیناوهەڵی هاویشت بوبە کوڕەجحێڵەیەکی زۆرلەخوی جوانتر.ئەوجارئەودوانە؛دەستیان کردبەکەیف وسوحبەتێ، پاش ئەوەی لەهەموشتێکی خەلاس‌بون دەستی بەسەروچاوی کوڕەی داهینابۆوە بەسێودەباغەڵی نا هێنای بۆسۆی لەبەردەمی دەروێشی سازکردوئەویش وەخۆهاتەوە،

ئەوجاردەروێش دەستی بە سەروچاوی ژنەکەی داهینابۆوەبەعەسا؟بێخەبەر لەهەموشتێکی و چ ڕوی داوەو چ بوە دەستی‌داعەساو جانتای هەتابڕوات. ئەحمەد ئەوهەلەی پێ باش بوەبۆئاشکرابونی کاری،خۆی ڕێگای پێ دەگری ودەڵێ ناهێڵم بڕۆی، ئەوڕو بۆ نێوەڕۆیە میوانی منی.

هەرچەنددەروێش زۆری پیی سەیردەبی ئاخرکوڕەپاشایەك دەروێشێکی گەڕیدە بانگهێشتن کات هەرجورێك بولێی قەبوڵ کردو ئەحمەدچۆوە ماڵێ ،ڕوی دەخانمێ کردو :کارم بەنوکەرونێوماڵێ نیە سێ مەجومعان خواردەمەنی بۆخۆمان سازکە،میوانمان هەیە ؛ لێی پرسی:میوان کێیە؟ ئەحمەد:دەروێش سەعیدە!

خانم:باشە سێ جێگامان بۆچیە؟ ئەتودەگەڵ دەروێشی هەرمەجومعێکوبەسە! ئەمنیش کەمێکم خوارد یانەخوارد هیچ عەیبی نیە!

ئەحمەد دەڵێ نەخێر! ئەتۆ سێ مەجومعانن بۆ سازکەو کارت بەوەی نەبیت؛

بەڵێ ئەودوە چون لەدیوی تایبەتی دانیشتن.خانم هەرئەوددەمی مەخافەتی لێ پەیدابو.وزۆریشی پێ ناخۆش بودەروێشی بردەدیوەکەی خۆیان وخانم بەپەلەپەل سێ

مەجومعە خواردەمەنی حازرکردو هێنای لە پێشی دانان.

ئەحمەد مەجومعەیەکی لەپێشەخۆی ویەك لەپێش دەروێشی ویەکی لەپێش خێزانی دانا؛

ئەحمەد بە دەروێشی گوت:دەی مام دەروێش ڕەفیقت بێنە!

دەروێش وەك ڕاچەنینێ ڕانەچەنی ودەڵێ ڕەفیق ؟ئەمن ڕەفیقم نیە!

ئەحمەد.دەڵێ دەبێنە بێنە.، دەروێش:باوەڕکە ڕەفیقم نیە.

ئەحمەد:دە هەستە عەسایەکەت هەڵاوێ بابزانین چۆن دەبی!

دەروێش کەگویی لێبو گوتی عەسایەکەت هەڵاوێ زانی ئاگای لێ بوە! چاری نەبو هەستا عەسای هەڵاویشت بووەبەژنەکە!

ئەحمەد بەدەروێشی گوت ئەتووەرە دەگەڵ من لە سەر مەجومعەیەکی دانیشین، بەژنی دەروێشی گوت پچو لەسەر ئەومەجومعەی دانیشە٠؟

ژنەچولەکن مەجومعەکەی دانیشت وئەحمەد:دەی خوشکم ئەتۆش ڕەفیقەکەت بێنە. ژنەڕەنگ وڕوی گۆڕا ئەگەر.ئەحمەدلەکن دەروێشی پێی گوت ڕەفیقت بێنەژنە گوتی ڕەفیق چی ئەمن ڕەفیقم نیە!

ئەحمەد: دەی ڕەفیقت بێنە دەی دەزانم ڕەفیقت هەیە!

ئەوجاردەروێشیش دەگەڵ ژنەی سوێندی دەخواردودەیگوت ڕەفیقی نیە!

ژنی ئەحمەدی ئەگەرچاوی بەئەو عەساییەی کەوت وبوبە ئەوژنە ئەویش زۆر ترسا ئەحمەد بەژنێ دەروێشی گوت دە هەستە ئەتۆش سێوەکەت دەربێنەوهەڵێباوی!

ژنەئەگەر زانی ئاگای لێبوە هێندەی دیش تێك چوو هەروەك شێتانی لێ هات وپاش زۆرپرکێشی وبەزم هەڵلا ولای دەرکێشی لێ گیرابو هیچ عیلاجی نەبو سێوەکەی لەباغەلێ دەرهینا و هەڵێئاویشت و بۆوە بەکوڕەجحێڵەکە!

ئەگەردەروێش چاوی بەئەوەزعەی کەوت هەروەکوماخولیایان هەستا پێ وئەحمەد.گوتی دانیشەوەجێگای خۆت جارێ کارمان ماوەو.بەژنەش دەڵێ: ئێوەهەردوکو لەسەرئەو مەجومعەی دانیشن.

ئەوجار.ئەحمەد ڕوی دەدەروێشی کرد وگوتی بزانەڕەفیقم بۆخۆت پەیداکرد ڕەفیقم بۆڕەفیقیشت پەیدا کرد، ئەتۆش پیاوبە ڕەفیقیکی بۆئەوڕەفیقەی من پەیدا بکە؟

دەروێش هەم لەبەرغەرەزی خوی کەوەزعی وای لێ هات حالی بوو.پێشی خۆش بوکاری ئەوانیش ئاشکراکا.دەروێش ڕوی دەژنێ ئەحمەدی کردوگوتی دەی خانم ئەتۆش ئاواڵت بێنە خانمێ ئەحمەدی بەلەرزەلەرزو بەترسەوە دەڵێ ئەمن ئاواڵ وڕەفیقم هەر ئەحمەدشایە.دەروێش وای گوی لێ دەبی کەچە شیرێکی پێدەبی، هەڵیکێشا کەچە شیرەکەی وڕایکردە سەر یەغدانێ، شەپێکی لەیەغدانێ داو سەعدونی لەنیویەغدانێ بەمرخێش مرخێش هێنادەرێ.

ئەی ئەهلی مەجلیس:جەنابی قازی چ ئیعتیبار بە ژنان دەکەن ئەوەتا ژن عەمەلی ئاوایان هەیە.

ئەحمەد گوتی کابرای جغارەفرۆش ئەتوش دەگەڵ خانمی لە سەر ئەو مەجومعەی دانیشە! هەرچەند ناکریت نابیت و هاواریان کرد، فایدەی نەبو گوتی ئیوە دەبێ بە یەکەوە نانی بخۆن!

بەڵێ !ئەحمەد،دەگەڵ دەروێشی و،ژنی دەروێشی دەگەڵ حەریفی و،سەعدون دەگەڵ خێزانی ئەحمەدی،نانیان خواردیانەخوارد،ئەحمەد.ودەوریش هەردوکیان ژنەکانیان تەلاقدان و بەرهەڵلایان کردن.

چونکە زانیان خەتالەژنە کانیانەیاعادەتی ئەوزەمانەی وابوەیان لەبەرخوێڕێتیانیان چیان بە حەریف یاکەڵەگای ژنەکانیان نەگوتوە ٠

بەڵێ! ئەوانە ژنەکانیان دەگەڵ حەریفێان وەدەرکەوتن و ڕۆیشتن. ئەحمەدو دەروێش ئەگەرتەنیامانەوە، ؟ئەحمەد ڕودە دەروێشی دەکاودەڵێ ئەمن ماڵێکی زۆرم هەیە، هەرکەسێکی بلێی بۆت دەخوازم وبوت دێنم. دەوریش:ئەمن ئەوژنەم بەمنداڵی کڕیوە،وڕوحم دەئەوعەسایەی کردوەکەبیست وچوار سەعاتەبەدەستمەوەیە،دیسان حەریفی بۆخۆی پەیداکردوە؟چۆن وچەژنێکی پەیداکەم وبەقای پێ بکەم ؟ئەمن هەتاماوم

تازە ژنی ناهێنم،ئەتوش بۆخۆت کەیفی خۆتە !

ئەحمەد: هەرچەند ئەمن جحێڵم، هەڕەتی جحێڵێمە، بەلام هەروەکو بۆخۆت دیتت ئەمن کوڕەپاشایەکم وئەو ژنەم بەدڵی خۆم هێناوە،هەروەکوئەمن بەویستی خۆم هێناوە، ژنەکەش هەروابەویستی خۆی بوەوکەس زۆری لێ نەکردوە، لە سەرئەوحالەی بچێت ئاوا ئابڕوی من بەرێت،ئەوکارەناحەزەی بکات ئەمنیش، تازە هەتا ماوم ژنێ ناهێنم.

ئەی ئەهلی مەجلیس، جەنابی قازی! ئەوەتا ژن کاری ئاوا دەکەن چ ئیعتیبار بە ژنان دەکەن ؟

دەروێش دەگەڵ ئەحمەدی هەردوکیان بیژن مانەوەکوتر لەئەو هەمو وەختەیدا کە بێدەنگ دانیشتبو، ئەوجار وەجواب هات.

**وتاری کوتری مێیە:**

ڕوی دە قازی و مەجلیسی کرد وگوتی.

جەنابی قازی! بە لێ ژن هەیەژنوچکەش هەیە ! پیاو هەیە و پیاووچکەش هەیە !

دەگێڕنەوەدەلێن تاجرێك بەنیوی خواجە حەسەنی بەسرایە خەرێکی توجارەتێ بوە سالێ جارێك یابەدوسالان جارێکی دەچو بەغدایەبۆ توجارەتێ و حوجرەیەکیشی لەوێ هەبوەوزۆردەوڵەمەندو بەنێومالێ ومالداری،

هەرلەشاری بەسرایەلەگەڕەکێ ماڵەخواجە حەسەنی، لاوێك بە نیوی میرزا برایم بە خوی و حەبیبەی خێزانی وقەرەواشێکی،خەرێکی ژیانی ئاسایی خویان بون؛

ئەوجارەی خواجەحەسەن ئەگەرسازبو بڕوا بۆ توجارەتێ دەنگ دەگەڕەك وکۆلانان گەڕا کەئەوەخواجەحەسەن دچێتەبەغدایە، حەبیبەبەمیرزا برایمی گوت بۆ ئەتۆش ناچی بۆتوجارەتی دەپچو چیدی بەبێکاری لەماڵێ دامەنیشە ؟!

میرزا برایم: ئاخربەچی بچم خۆهیچم بەدەستەوە نیە بەبێ پولێ بۆکوێ بچم؟!

حەبیبەمارەیی خۆی سێ گەوهەری هەبون لەپاشئەستوی لەبن پرچی شاردبونیەوە.گوتی گەوهەرێکت دەدەمێ بەرە بیفرۆشە، ئەسباب وشتومەکی سەفەرێ سازکە۰

میرزا برایمیش قبوڵی کرد، گەوهەری لێوەرگرت و بردی فرۆشتی و هەمو ئەسبابی سەفەرێی کڕی وبەخێزانی گوت ئەمن ئەوەدەڕۆم ئەگەر هاتمەوەوگوتم خاڵێکی ڕەشت لە نێوانی سینگ ومەمکانە؛ئەمنم دەرکەم لێبکنەوەدەنا لەکە سی مەکەنەوەها،، خێزانیشی گوتی زۆرباشەبڕۆخوات لەگەڵ.

میرزابرایم ڕەگەڵ کاروانی کەوت و ڕۆیی.چەندمەنزڵ ڕۆییشتن،دانیشتبون بۆحەسا نەوەی، دەستیان کردبەقسان:ژنی فلاّن کەسی ژنی چاکە، فلانە ژنە وایە و ... خواجەحەسەن بەئانقەست باسی ژنی میرزا برایمی هێناگۆڕێ.

هەر؛ڕوی دەمیرزابرایمی کردوگوتی ئەڵحان ژنەکەت ڕۆییشتوەهەربوێەشی ئەتۆناردوتەکاروانی! میرزا برایم گوتی نەخێر؛ وانیە! پاش بڕێک قسەوبەبڕێك هەلاّچون وایەوا نیەقیرەو چەقەچەق گرێویان لەسەرکاروانەکەیان کردو گوتی ئەوەدەچم نیشانەشت بۆدێنمەوە.دەناباکاروانەکەی من بۆتۆبێ،چونکەمیرزابرایم هێندەی ئیمان بەژنەکەی بو ئەویش گرێوەکەی دەگەڵ کردولێی قبوڵ کرد.

خواجە حەسەن گەڕاوە بۆماڵێ. هەتا حیلەیەکی سازبکات،هەم ئابڕوی میرزابرایمی و حەبیبەی بەریت، هەم کاروانەکەشی لێبەریتەوە، ئەوەش بۆخۆی نەوعە کاسپیك بولەنێودەولەمەندەکاندا ؟

لێی سواری ئەسپێکی وێرغەبوو! هاتەوەخۆی گەیاندەماڵەجیرانێکی میرزا برایمی، بڕێکیشی پوڵ دانی و؛وبڕێکی دیکەشی وەزعی ماڵەمیرزابرایمی لێپرسین بەتایبەتی وەزعی حەبیبەی کەچۆن دەکرێ ببینم،هەرچەندی دەڵێن پولیشودەدەمێ! بەلاّم ژنی جیرانی میرزابرایمی پێی گوت کەبەهیچ جورێك ناکرێ ژنی میرزا برایمی ببینی،چونکەقەت لەماڵێ وەدەرناکەویت ئەگەرکاری بازاڕیشی هەبیت قەرەواشی هەیەدەینێریت بۆپێك هینانی کاری بازاڕی،بۆخۆشی هەموڕۆژێ بەینی شەووڕۆژان هەڵدەستیت هەتامەلابانگ دەدا هەرغوسڵی گوناحان دەکا،پاش مەلابانگ دانێ نوێژێ دەکات جانەوجاردەست دەکابەکاری ماڵێ .

وەختێك خواجە حەسەن گویی لەئەو قسانەبو ئەوجار پیێگوتن، باشەلەکوێ

غوسلێ دەکاو دەست نوێژێ هەڵدەگریت.

ماڵە کابرای گوتیان لەئەودوبانەکیەی حەمامی هەیەولەحەمامێ غوسلێ دەکاو دەستنوێژێ هەڵدەگری.خواجەحەسەن گوتی،ئەوەندەیارمەتێەم بدەن نێردیوانێکم وێدەن، هیچی دیکەم لەئێوەناوێ ولەبەرماڵەخۆشی نەیدەوێراخۆئاشکراکات،

بەڵێ ماڵەکابرای بەئەوپوڵەی کەلەخواجەحەسەنیان وەرگرتبو،یارمەتیان داونێردیوانێکیان وێدا،چونکەسەرچاوەی هەموکارێکی پوڵە،نامەرد.دەتوانێ خۆی پێڕاوەشێنێ.

خواجەحەسەن شەوێ بەنێردیوانێ داوەسەرکەوت و لەتاریکایی شەوێ کەڵکیوەرگرت بە قەرای جێچاوێکی لەدێواری حەمامەکەی کون کردو،چاوەڕوانی هاتنی حەبیبەی بۆ هەتابێت (بۆحەمامێ)

تازە شەودەزرینگاوە،دەنگی لاق وشەقەی ئافتاوەولەگەنی هات، حەبیبە بەچراوە هات لەحەمامێ خۆی ڕوت کردەوە، خەرێکی خۆشوتنی بو؟بێخەبەرلەوەی کاك حاجی حەمامی کون کردوەو تەماشای لەشی ڕوت وقوتی ژنێکی مسوڵمان ولەخواترس ونامەحرەم دەکات.

جەنابی قازی ئەی ئەهلی مەجلیس؛ ژن هەیە ژنۆچکەش هەیە !

پیاو هەیە و پیاوچکەش هەیە !

بەڵێ! ئاحاجی حەسەن تەماشای کرد،دیتی کەدو گەوهەری بە بن پرچیوەنە، خێرایەکی هاتەوەخوارێ وگەڕاوەبولای کاروانی.

کاروانەکەش هەرلەجێگای خۆی مابۆوەچاوەڕوانی هاتنەوەی خواجە حەسەنی بون، کەدورونیزێکی کاروانی بو؛رەفیقەکانی چاویان پێیکەوت چونکەپیاوی دەوڵەمەند.ڕیایی لەبەردەکەن و برێکی بەپیرەچون هەتا بشزانن خواجە چیکردوە؟!لەئەوسەفەرەیی قازانجی کرد وە یان زەرەر؟!

گەییشتەوەو سلاوی کردوبەخێرهاتنەوەیان کردو بێ ئەوەی موڵەتی بدەن لێیانپرسی:خواجە چت کردوە؟ شێری یان ڕێوی؟!

بەڵێ؛ خواجە وەقسە هات ئەڕێوەڵلاّ ئەمن نەمگوت، خۆبەخۆڕایی نیە، پێتانوایە ئەمن بەقەت میرزا برایمیش نازانم؛ خودا دەزانی، هەرکەس بچیت لە پشت دەرکێ بلێ خاڵێکی ڕەشت لە نیوانێ سینگ ومەمکانە دەست بەجێ دەرکەی لێدەکاتەوە، وکەیفی خوێ دەگەڵ بکە، ئەوە لە قاوەخانان باسکی لێ هەڵکردون و سەمای بۆ دەکات و چەرتەمەشی دەگەڵ لێ دەدا، کوا ژنت! بەرخم منداڵی. ؟

باشەخۆکەس نەبوبڵێ وانیە یاچۆن وایەکاروانچی هەمولایەك ومیرزابرایمیش لایەك بەڵێ! میرزا برایمیش بەتەنێ بێ قسەماوە ، کاروانەکەی دوڕاند، خەریکی گەڕانەوەی بو، بەلاّم نەیوێرا، لەلایەك لەبەرلۆمەی عەبدان ولەلای دیکەش لەحەبیبەی زۆر دەترسا.

نەی وێرابگەڕێتەوەو خواجە حەسەنیش پێیگوت، بۆ دەگەڕێیەوە، ببە پێاوی من حەقی خۆت دەدەمێ، هەتا دەچینە بەغدایە، لەوێش بۆخۆت کاری بکە، بەڵکو شتێکی پەیدا بکەی و بەدەستی بەتاڵ نەگەڕێیەوە؟

لەلا یەك ئەومەرەدەی بەسەرهێنا لەلای دیش ماڵداری بۆ دەکردوزگی پێ دەسەتا.

میرزا برایم بەناچاری قبوڵی کردوبوبەپیاوی خواجەحەسەنی بەسرایە.ئەوان وەڕێکەوتن، قولەیەکیان دەگەڵبو، تەماعی ڕێنیشت وبوکەیف وڕابۆاردنێ بۆماڵە میرزا برایمی گەڕواە، هەتا گەییشتە پشت دەروازەی چەندی کێشا،

بانگی کرد:دەرکەم لێبکەنەوە،خاڵێکی ڕەشت لەنێوانی سینگ ومەمکانەحەبیبەوقەرەواشە کەی عەجایب مان گوتیان میرزابرایم بۆوازوگەڕاوەتەوەچەبوە،شەوبو.بۆیان مەعلوم نەبو.

خولاسەی کەلام ئەگەرچون ودەرکەیان کردەوە،قولەهاتەژوری،حەبیبە پێیگوت لەچیدەگەڕیی چەکارەی؟!

قولە گوتی ئەمن بەئەونیوو نیشانەی هاتوم بۆ کەیف و ڕابواردنێ.

حەبیبەبەخۆی وبەقەرەواشەکەی بەفێڵ قولەیان گرت وبەچوارمیخەلەبەرێکیان کێشاوەبرێکێان بەداران لێ دا، قولە گوتی بۆ خاتری خودای! لێمەدەن حەبیبە گوتی باشە لێت نادەم،بەلاّم پێم بڵێ بزانم مەسەلەچیە بۆهاتویەکێ فێری کردوی،قولەگوتی

باشە لێم مەدەن هەمو شتێکو پێ‌دەڵێم!

دەستیان لەلێ دانێی هەڵگرت وقولـەش تـەواوی مـەوزوعی خواجـە حەسـەن و مـیرزا برایمی بەڕونی بۆ گێرانەوە.

حەبیبە قولـەی بەقەرەواش و جیرانی ئەسـپارد گوتـی بەری‌مـەدەن. ڕۆژێ جـارێکی دارکاری کەن هەتا بۆخۆم دەگەڕێمە، دەرکەش لە کەس مەکەنەوە!

بەڵێ! حەبیبە گەوهەرێکی دیکەشی لەبن پرچان دەرهیناوچوخوردی کردەوە شەش حەوت ئەسپی چاکی بە هەمو شت و مەکـەوە کڕیـن بـەرگی پیـاوانی دەبـەرکرد و شـەش حەوت نۆکەریشی گرتن، هینانی نۆکەرەکانی زۆربە جوانی تەیار کردن لە هەمو بارێکەوە.

بەرگی جوان و نایابی بۆ نوکەرەکانی کڕی، نیوی خۆی‌نا،ئەحمەد ئاغای کوێستانی؟

حەبیبە هەرسالێك دەبوو نەدەبو مێردی بە میرزا براییمی کردبو، زۆر جوان‌چاك بـوو بەهەیبەت و هەروانێرانە خولقابو، ئاوا خوێ ساز کرد بـۆ تۆڵـە ئەسـتاندنەوە ی لەخواجـە حەسـەنی بەسـرایی؟کەوتـە دوی.کـاروانی خواجـە حەسـەنی.کـاروانی خواجـە حەسـەنی گەییشتەبەغدایەوئەویش پاشی دوسێ ڕوژان بـەخۆی وبـە نۆکـەرانی گەییشـتنە بەغدایـە، مەنزلێکی خۆش و ئاراستەی بەکرێ گـرت لەجێگایـەکی خـۆش وباسـەفا.کـاری ڕۆژانـەی، گەڕان لـەنیو شاری وەکو قاوەخانە و کاروانسەراو ...بو؛چونکەزۆربەدڵ بو،جاروبار پوڵی قاوەخانەی بەعزەکەسێکی دەدا،بەدایمەش پینج شەش نۆکەری بۆشناغ و تەیاری دەگەڵ بون زۆریان خۆش دەویست، وردە وردەخەڵك ناسیان.خوێ بە میری بەغدایەش ناساند.

دەگەڵ ئەو گەڕان و هات و چویەی میرزا برایمی د یتـەوە ؟هەرگەییشـتبونە بەغدایـە خواجەحەسەن دەری‌کردبو، چوبو ببوبەشاگرد مزگەر.

ڕۆژیکی ئەحمەد ئاغا چۆ کن وەستای پیێ گوت مام وەستا برێکن قاپی پیس هەنـە ئەو شاگردەت بنێرە بێان هێنێ بۆن سپی‌کەوە.

وەستا هەرزۆیکی گوتی میرزا برایم دە خزمەت ئاغای‌ڕا بچـو، قـاپ و مسـەکان بێنـە هەتا سپییان‌کەینەوە.

میرزا برایم ڕەگەڵ ئەحمەد ئاغای کەوت. لە ڕێیە بە میرزا برایمی گوت بۆ نایە لای من چونکە ئەمن پێویستیم بەچەند نوکەرێکی دیش هەیەئەگەرمیرزابراییم چاوی بەنۆکەرەکانی ئەحمەدئاغی کەوت لەشایان بەقای نەدەکرد قبوڵی کردوقاپەکانی لێ وەرگرتن وبردنی بۆکن وەستای سپێیانکەنەوەو.بەوەستای گوت دەبی ئیجازەم بدەی ئەمن دەڕۆم چیدی کارێ ناکەم، وەستا دەڵێ باشەخۆئەتۆدوڕۆژەکارێ دەکەی :نەخێر دەڕۆم خولاسە وەستا ئیجازەی دا وڕۆ یشت.

بەڵێ! میرزا برایم هات بۆ کن ئەحمەدئاغای بەنۆکەرێ.

ئەحمەدئاغادەستێکی بەرگی جوان وەکونوکەرەکانی دیکەی یابرێك جوانتربەئەسپ و هەمونەسبابێکەوەبۆکڕی و کردیەنۆکەری خوێ نۆکەرەکانی ئەحمەدئاغای میرزابرایمیان دەشوپاند وبۆیان مەعلوم نەبوچۆن وبەچە،جوریك گەیوەتەبەغدایە،بەرگی شاگرد مسگەریەکەشی لێوەرگرت و دەبوخچیکی ناوهەڵیگرتن بۆرۆژی پی ویست وبەڵگە.

جەنابی قازی! ئەی ئەهلی مەجلیس! بەڵێ پیاو هەیە پیاوۆچکەش هەیە،

ئەگەرژن هەیە ژنۆچکەش هەیە!

دەگەڵ هات وچوۆیە شارەزای هەموجێگایەکی ببو،دوکانی خواجە حەسەنیشی دیتبوۆە.

لەزۆرجێگایانیش باسیان دەکردچونەفلأنەدوکانەی وفلأنەقاوەخانەی ودەگەڵ خەڵکی کەدەدواو،ئیحتڕامی عالەمێی ڕادەگرت.خەڵك زۆریان خۆش دەویست وای خۆرێك وپێك کردبو بەنیقاب وشتومەکان کەس نەیدەزانی ئەوەژنە.

ڕۆژێکی دەستەبەرگێکی جوانی ژنانەی کڕی وبێ ئەوەی نوکەرەکانی بزانن زۆر بە بێدەنگی بەرگەجوانەکەی دەبەرکردوچارشێوی بەسەرسەری داداو،دەپێشدامۆرێکیشی بە نێوی ئەحمەد ئاغای کوێستانی کەهەڵی قەندبو، دە باغەڵی ناو برێکی مێوژو گوێزهەڵگرتن ودەرمانی بێهۆشی پێوەرکردن، لەگەڵ تابڵەمەو چەندکەڵپەڕەژی و برێکیشی دەرمانی بێهۆشیی زیادی هەڵگرت و،بەرەودوکانی خواجە حەسەنی وەڕیکەوت.

لەئەولاولای دوکانیٚ برێك ڕاوەستاەەتادوکانی خواجەی چۆل بو، ئەوجار وەژورکەوت گوتی، خواجە زانیومە ئەتۆ گەوهەرێکت هەیە، ئەمنیش گەوهەرێکم هەیە، هاتوم گەوهەری خوٚتم پیٚبفروٚشە یان گەوهەری من بکرە.

خواجەبرێك دل دنیائی بەتەمەنیش بو،ئەگەرچاوی بەحەبیبەی کەوت وەختابوشیت بیٚ لەسوێیانی. وگوتی ئەمن لە خودام دەوێت ئەو گەوهەرەی دیکەم وەدەستکەویت.

هەر خێرایەکی دوکانەکەی داخست وحەبیبەی وەدوای خوٚیدا.بوٚمەنزلیٚ خوی وهەر دەرکەی پیٚداچونەژوری قفلێکی لیٚ دەداهەتاحەوت دەرکەی لەحەبیبەی داخستن؛ بردیەئەومزلەچۆلەی ئەگەرمەریوٚئەوکاروفێلانەی سەروبەرکردبون وئەوجار.ڕوی دە حەبیبەی کرد:وەرە دانیشە.حەبیبە دەلیٚ کوا گەوهەرەکەت؟

خواجەدەلیٚ خوات لیٚ ڕازی بیت گەوهەری چی ئەمن بوٚخوٚم گەوهەرم بوٚ توٚ!

حەبیبە: ئەمنیش هەر ئەوەم دەوێت ئێدی دەوەرەئەتوٚش دەمێکی لەکنم دانیشەوبرێکیش قسەی دەخوٚش خوٚشم بوٚبکەوباهێندێك پێبکەنین قاقایەکی کێشاو.

خواجەهات لەکنی دانیشت ماچ وموچێکی کرد یانا،حەبیبەمێوژ وگوێزی هینانەدەریٚ وگوتی وەرەدوسیٚ دەنك میوژوگویزان بخوین وقسەخوٚشەکانیش بکەین.خواجەبەئەو قسەی وبەمێوژوگوێزان زوٚرکەیفخوٚش بولەبەرپیسییانی هیچ بیرێکی لیٚ نەکردەوەو چولەکن حەبیبەی دانیشت وهەردودەنکی مێوژوگوێزخواردوبیٚ هوٚش بو،ولێی کەوت بروکێکی دیکەشی دەرمانی بیٚ هوٚشیٚ بەدم ولوتی وەرکردهەتاوەهوٚشنەیەتەوە.

ئەوجار هینای ڕەژیەکەی دە نیو تابلەمەی ناو.ئاوری پیٚوەنا، تابلەمەی هەلسوڕاند ئاور گەشاوە. خواجە حەسەنی ڕوت کردەوەوموٚرەکەی بەئاوری سور کردەوەوبەسمتی خواجەیەوەنا؛بەجورێك ئەگەربە ئاشکرایی د یاربو« ئەحمەدئاغای کوێستانی»

شت و مەکی کوٚکردنەوەودەرکەکانی یەك لە دوای یەکی هەلگرتن وگەڕاوەبوٚ لای مەنزلیٚ خوٚی، بێدەنگەی لیکرد هەتا هەشت نوٚدەڕوٚژان.

دوایە ڕوٚژێکی، دوسیٚ نوٚکەری وەدوی خوی دان و چو لە دوکانی خواجەحەسەنی

وەژورکەوت.

:خواجە ! فلأنە پارچەت هەیە بۆڕانك وجۆغەی پیاوەکان؟

خواجە حەسەن کە زورکزولاواز ببو زۆر بەنارەحەتی توانی ئاوڕبداتەوە، ئەحمەدئاغا لیێ پرسی:ئەوەبۆ وای؟ خواجە.

خواجە: ئەحمەدئاغا گیان کەمێك نەخۆشم!

ئەحمەدئاغا:ئەگەر وایەجارێ لیێ گەڕێ دوایە د ێمەوە.

چۆڕە؛ پاش حەوتوێکی دیکە هاتەوە دوکانێ خواجەی چاوی لێکرد چاك ببوۆوە :خواجە ! فلأنە پارچەن بۆ بێنە.

خۆاجە زوێکی هەستاو: ئەوەی دەفەرموی جەنابی ئەحمەدئاغای!

بەڵێ! بڕێکی پارچە کڕی و چۆڕە مەنزڵێ خویێ.

ئەی ئەهلی مەجلیس! جەنابی قازی! ژن هەیە ژنۆچکەش هەیە

پیاو هەیە پیاۆوچکەش هەیە!

ئەحمەدئاغا، کاری گەییشتبو جێگای خویێ ودەبا دەست بەکاربا، بەیانی زو نۆکەرەکانی حازر کردن بەبەرگی جوان ومورەتتەبی، وەدوای خۆیدان، بۆ دێوانی میری بەغدایە، کە گەیشتنە دەرکێ، بە دەرکەوانی گوت عەرزی میری بکەن، ئەحمەدئاغای کوێستانی کاری لەخزمەتت هەیە.داخوا ئیجازەیە.

دەرکەوان کەچونە ژوری پاش چەند دەققەیەکی ئێکێك لە ئەمینداراني میری هاتەدەرێ و گوتی ئەحمەدئاغا ؟فەرمو.

ئەحمەدئاغاکەچۆ ژورێ بەئیحتیرامەوە سلأوو ئەحوالپرسی میری کرد ئەویش ئیجازەی دانیشتنی پیێدا. پاش سەرف قاوەوقەلیانێ ئاوای عەرزی میری کرد

:ئەمن ماوەیەك لەوەپێش،یەکێك لەپیاوەکانم بیێشوین ببو؟ئەوڕۆژانەهەرلێرەدیتومەتەوە هەربۆیەش هاتبومەئێرە ؟وجائەوەهاتومەتەخزمەت جەنابت هەتا بزانم چ دەفەرموی؟!

چونکە بەبیێئیجازەی میری بەبیێئەدەبی دەزانم هەرجورەحەرەکەیێکی بکەم!

میر:پیاوت هەرکەس بێت،ئیجازەت هەیەدەگەڵەخۆتی بەرێوە.بەڵام پێم خۆشەبزانم کێیە؟
ئەحمەدئاغا عەرزی میری کرد:قوربان!خواجەحەسەنی بەسرایە هەیەلێرەیەئەوەپیاوی من!
میر تەعەجوبی کرد:جا چۆن خواجە حەسەنی بەسرایە، پیاوی تۆیە؟! لەوەتی ئەمن خواجە حەسەنی دەناسم، ساڵێ جارێك یان بەدوساڵان جارێك هاتوتە ئەوبەغدایەی بۆدادوستەدێ،نەمزانیوە پیاوی کەس بیت.
دیاربومیرباوەڕی بەقسەی ئەحمەدئاغای نەبوحەقیشی بوباوڕێ نەبێ خواجەحەسەن کەبەدایمی هات وچوی بەغدایەی دەکردوئێستاش لاوێکی ئاواکەم تەمەن بڵێ پیای منە.
ئەحمەدئاغا عەرزی میری کرد:قوربان! ئەمن نیشانەم هەیە میر:نیشانە ت چیە.
ئەحمەدئاغا:ئەمن هەمونۆکەرەکانم مورکردون؟
لێیپرسی چۆنت مۆر کردون؟!
گوتی قوربان! پاشەڵی هەمو نۆکەرەکانم مورکردون بەنێوی ئەحمەدئاغای کوێستانی! ئێستاش خواجە حەسەن بابێت ئەگەر وەکی ئەمن دەڵێم وابێت ئەوە چاکە دەنا ئەوداوایە هیچ!حازرم تەنبێش بکرێم.
بەڵێ! میر لەدوای خواجە حەسەنی نارد ، وەختێکی خواجە حەسەن هات و لەوێ حازربو، ئەو قسەو باسەیان پێگوت بەهیچ جورێکی، قبوڵی نە دەکرد.
چونکەبۆخۆی لەوانەی لەوێ بون باشترحاڵی بوودەیزانی چ باسە؟
ئەحمەئاغا چۆنی دەپێشدا بە میری ڕاگەیاندبو دوپاتی کردەوە.
: ئەگەر لە پاشەڵی نەنوسرابو،ئەحمەدئاغای کوێستانی، دیسان حازرم تەنبێش بکرێم،پاش کێشە وهەرایەکی زۆر میریش هەرپێی وابو داخوا چەمەوزوعێکە دەنا وانیە.
ئەگەر خواجە حەسەنیان ڕوت کردەوەبەئاشکرایی دەخویندراوە ئەحمەدئاغای کوێستانی.
میربەخواجەحەسەنی دەڵێ هیچ قسەت نیە،ڕەگەڵ ئەحمەدئاغای کەوە.
بەڵێ !زۆربەناعیلاجی ومرخێش مرخێش ڕەگەڵ ئەحمەدئاغایان ئیخست هەرنۆکەرەی پیلێکیان گرت ونیوەزۆری ونیوەناخۆشی خواجە حەسەنی بردەوەمەنزڵی و بەرگی

نوکەریەی دەبەر خواجە حەسەنی کرد و ئەسپێکی بۆ کڕی و ڕەگەڵ نۆکەرانیدا.

بەڵێ! ئەحمەدئاغا؛کاری خەلاس ببو کەل وپەلی کۆکردنەوە وبەخۆوبەنۆکەرەکانی و خواجە حەسەنی بەرەو ماڵ بونەوە. شەوو ڕۆژان ڕێگایان بڕی هەتا گەییشتنەوە. لە قەراغ شاری خویان‌ڕاگرت هەتا لای نوێژی شێوان. لە وەختی بێدەنگیدا، بانگی نۆکەرەکانی کرد، یەك یەك هەموی ئیجازەدان کە بچنەوە ماڵە خۆیان هەر لەبەرئەوەوی لەمێژە لە ماڵێ وەدەرکەوتونەو ماندووبونە، بچنەوەسەرێکی لە ماڵێ بدەن، جێگایەکی بۆ د یاری‌کردن پاش حەوتوێکی لەئەو جێگایەی یەکتری ببیننەوە.

مانەوە ئەحمەدئاغاو خواجە حەسەن و میرزا برایم.

ئەوجار ڕوی دە میرزا برایمی کرد:ئەدی ئەتۆ ماڵت لێرە نیە؟!

میرزا برایم لە ترسی خواجەحەسەنی نەی وێرابڵێ ماڵیشتم هەیە،چونکەخواجە حەسەن وای ئابڕو بردبو، لەنێو خەڵکی ژنەکەی بە خەراپ حیساب کردبو ئەگەر لە قاوەخانان ئەوە چەرتەمەی لێدەدا و سەمایە دەکا و ...

ئەوجار ڕوی دە خواجە حەسەنی کرد:ئەدی ئەتۆ ماڵت لێرەیە؟!

خواجە حەسەن: بەڵێ ماڵم لێرەیە، ئەگەر ئیجازە بفەرموی دەچمەوە ماڵێ هەروەختێکی بۆم دانیی لە خزمەتتدا هەمە.

ئەحمەد ئاغا: باشە ئاخر میرزا برایم ئەتۆش ماڵت لێرەیە، بچووە ماڵێ وسەرێکی لە ماڵ ومنداڵەکەت بدەووەرەوە.

میرزا برایم دیسان نەی وێرا بڵی ماڵم لێرەیە لە ترسی خواجە حەسەنی.

ئەوجار ئەحمەدئاغا بانگی خواجە حەسەنی کرد: خواجەوەرە؟ کاغەزێکی بنوسە و ئیمزای‌کە ئەگەر ئەمن پیاوی ئەحمەدئاغام.

خواجە حەسەن کاغەزێکی نوسی، ئەمن هەتا بمینم پیاوی ئەحمەدئاغای کوێستانیم و هەرکات و ساتێکی هەر کارێکی بە منی هەبیت بە بێ هینانەوەی عوزر و بەهانە، بە ئەنجامی بگەیەنم.

کاغەزەکەی مۆر و ئیمزا کردو تەحویلی ئەحمەدئاغای‌دا.

جەنابی قازی؛ ئەی ئەهلی مە جلیس بەڵێ ژن هەیە ژنۆچکە هەیە.

ئەگەر پیاو هەیە پیاۆچکەش هەیە.

جا ئەحمەدئاغامیرزابرایمی ناردە دەرێ و ڕوی دە خواجە حەسەنی کرد: خواجە حەسەن! نامەرد، نائینسان! ئەتۆ کەنگی ژنی میرزا برایمیت لە قاوەخانان دیت سەمایە بکات؟! و چەرتەمەی لێدات وچەبکاو،چی وچی!؛

خواجە حەسەن مچورکێکی لەبەری پیێ هاتەدەرێ و چۆدەتۆقی سەری زانی ئەو درو زەلامەی لێ ئاشکرا بوەوتوشی بەلا یەکی گەورەبوە، قوستێوە و گوتی ئەمن غەڵەتم کردوە دەنا وانەبوە بم بورن، ئەگەر.دەمبورن تەواوی کارەساتەکەی لە ئەوەڵ ڕا هەتا ئاخیر بە بێ درووێ هەموتان بۆدەگێرمەوە.ئەحمەدئاغا:بۆم بگێرەوە،

هەموی بەوردی بۆ گێڕاوە چۆن چۆتە ماڵە جیرانی وبە نێردیوانیێدا وەسەرکەوتوە وڕاستی شۆرکەی کونکردوەوتەماشای کردوەوهاتۆتەوە بە کەڵەك کاروانی لە میرزا برایمی بردۆتەوە وڕەمزەکەشی لەجیرانەکەی گوێ لێ ببو.

بەڵێ ٠،دوای ئەوەی هەرچی لەمیرزا برایمی ئەستاندبو لێئەستاندەوە،کاغەزێکی دیکەشی پێ ئیمزا کرد کە دوایش هیچ حەڕەکەتێکی نەتوانیت دەگەڵ ماڵە میرزا برایمی بکات؛

چو.وەسایل و شتەکەی لە میرزا برایمی ئەستاندبون، بە ئەندازەی وی پولی دایە، تەحویلی ئەحمەدئاغای دا، جا خواجە حەسەنی مەرەخەس کرد چۆوە ماڵە خۆی.

ئەوجار دەگەڵ میرزا برایمی چونەوە ماڵە خۆیان بێئەوەی میرزا برایم بیناسێتەوە، ئەگەر لە دەرکەیان‌دا، قەرەواشەکەی هەرای‌کرد:کێیە؟

میرزا برایم:خاڵێکی ڕەشت لە نیوان سینگ ومەمکانە، ئەمنم. میرزا برایم دەرکەی بکەنەوە.ئەگەرقەرەواشەکە؛دەرکەی کردەوەوچونە ژورێ میرزا برایم چاوی بە قولەیکەووت گوتی ئەوە چیەچ باسە؟حەبیبەلەکوییەئەوقولەبۆ لێرەیە.

قەرەواشەکەش ئاوای بۆ گێڕاوە:چەندڕۆژ پاش ئەوەی ئەتو ڕۆیشتی ئەو قولە هات

باسی کردوگوتی خواجە حەسەن کاروانی لە میرزا برایمی بردۆتەوە، ئیدی هەر ئەودەمی حەبیبە لە ماڵێ وەدەرکەوتوەو نەهاتۆتەوە، جالەئەودەمیڕا نازانم بۆکوێ چوەو چیکردوە و چی بەسەرهاتوە هیچ ئاگادارێکی دیکەم لێی نیەونازانم.

میرزا برایم بەکوتنێ قەرەواشەکەی وەنیگەرانی کەوەت وگوتی ڕەنگ بی قسەی خواجەحەسەنی ڕاست بێ هێندەی دیکە ش ناڕەحەت بوبەئەوخەبەرەی لەلا یەك کاروانی بدۆڕێنی ولەلای دیش ئەوژنەی هێندەخۆش دەویست وئەویش نەمێنێ.

ئەوجار حەبیبە خوی لێ ئاشکرا کردو بەرگی لەبەرە خوێ داکەند و پێك شادو شوکر بون و قولەشی بەرەڵلاّ کردو درێژەیان بەژیانی ئاسایی خۆیان دا؛

دوایەپیاوەکانی دیتنەوەئازادی کردن ولەدوی خواجەحەسەنیشی ناردخوێ لەویش ئاشکراکردگوتی ئەوەئەمنبوم ئەومەرەدەم بەسەر هینای،هەتابۆ جارێکی دیکە ئاقلّ بی وبوختانێ بەکەس نەکەێ. هەتابەینێکی زۆر خۆشیان ڕابوارد، هیچ ناڕەحەتیکیان دە بەینێدا نەبو بەلاّم ئەگەر میرزابرایم وایکردبا حەبیبە دلّی بێشێ بەرگەمسگەریەکەی دەهینا لەپێشی دادەنا وپێیدەگوت ئاخر ئەتوهەرئەوپیاوەنەبوی.

جەنابی قازی! ئەی ئەهلی مەجلیس! پیاو هەیە، پیاوۆچکەش هەیە.

و ژن هەیە ژنۆچکەش هەیە

چونکە قەیات هەردوکان زورجوان بووهیچ ئیراد ێکیان لێ نەدەگیرا جاهەربۆیە جوجکە کان نەبون بەکۆتر ونەبون بەقەل بەڵکوبونەقەلەسابونەهەڵفڕین ودایك وبابیان بە جی هێشت ولێیانداڕۆیشتن.

خواجەحەسەن لەبەعزەجێگایەکی بەحاجی حەسەن بەسرائی نێوی هاتوە حەجیشی کردبو هیچ ئیشکالێکی نیە؟

## (شێعری) قەل وكۆتری

کوترێک و قەلێك بێجێ مانەوە      هەردو تەنیابون پێك گیرسانەوە
پێك هاتن كارو جوجكە هەڵێنان      وەكێك بەخەم بن بۆمان و نەمان
هێلانەیكی جوانیان، دروست كرد      كوترەشین زۆیكی دو هێلكەی تێ كرد
جوجكەی هەڵێنان، پەروازەی كردن      لە هەڵو و خەرتەل، نەخۆشی و مردن
قەل د یتی جوجكە، پەروازە بونە      جوی لەوەی لە خوێ هەڵاوردونە
بە فیزو دەعیە و ژێست و خۆ ڕانان      لە كوتری فەقیر، كەوتە بەهانان
دەتوانی بڕۆی هەركوێ پێتخۆشە      بو جێگای خۆشتر، زیاتر تێكۆشە
ژن بۆ كارو ماڵ،چارەی وا ڕەشە      لەوبەر بویەش هەروا بێبەشە
من ناچمەدەرێ قەت لەو هێلانە      هەتیویان ناكەم، ئەو جوجەڵانە
تا ماڵ و جوجكەم، ڕەنێو هیناوە      زۆر لە تۆ زیا تر، ڕەنجمكێشاوە
لێیانبو بە شەڕ لە سەر جوجكەو ماڵ      ژیانیان لێ شێوا بە قسەی سوك و كاڵ
بە باشیان زانی، بچنە لای قازی      بە شەرع وقانون، هەرد و بن ڕازی
لای قازی سلاوێان داكوتا بە جوت      هەركەس دەردی خوی بەمام مەلا گوت
قازی بڕیاری بۆ دامەزراندن      بۆی شیكردنەوە، جوان تێیگەیاندن
لە سەرمودەعی هەركەس قەیاتێك      بێ بگێڕێتەوە، یان كارەساتێك
كێ هە زاڵ تربێ جوجكە هی ئەوە      شاهید و ئیسبات بە گشت كردەوە



## وتاری قەل

قەل دەستی پیَکرد بە زەممی ژنان　　دەیگوت بیَدەلیل غەیبەت وبوختان
جەنابی قازی، ئەی ئەهلی مەجلیس　　نابی دلگیربن، یا بمکەن موفلیس
عەمەلی ژنان ئەوەتا وایە　　کیَ بی نەیدیبیَ لە سەر د ونیایە
لە شاریَکی خوَش، پاك و ئاوەدان　　کورەپاشایك، هەبو ئەحمەدخان
باوکی دەولَەمندو چونکە پاشابوو　　زو ژنی بوَ هینا تا بوَخوَی مابوو
یەکتریان دەویست ژن و میرد هەردو　　لە پیَش گواستنەوەوچونەنیو پەردو
باوکی ئەحمەدیش،وەك ئەوخەلَکەی مرد　　حەسرەت وداخی، چی لەگەلَ خوَی برد
پاش مردنی باوکی و زوَر بیرکردنەوە　　پەندی گەورەکان وەبیرخستنەوە
خەریکبو دەیخویَندلە لای مەلایەك　　وەکو شاگرد یَك، نەکو وەك شا یەك
هەر بوَ خویَندن و تیژکردنی هوَشی　　لەگەلَ ماموستا بە کەیف و خوَشی
ئەحمەدو مەلا، وەك دو دوَستی چاك　　بوَ یکتر بەخەم هەردو داوینپاك
لە نیو مالَ و شار هەرچی رویدابا　　وەزع، چەندوچوَن لە کوَی قەومابا
بە مەلای دەگوت بە بیَ زوَرو کەم　　بە بیَ دواکەوتن، هەر ئەوکات و دەم
جغارەفروشیَك هەبو سەعدوناو　　جوان و لاوچاك و، لە عەقلَیش بەرچاو
رِوَژی چەندجاران بوَجغارەفروَشتن　　بەردەرکی مالَی شایداروَیشتن
روَژیَك شابانو، وەختی ئیَوارێ　　جغاریَکی خوَی، بەرداوە خوارێ
هاویشتی بوَ نیَو جغارەی سەعدون　　ئەوە بو بە هوی ئیکی و تیَکەلَبون
دیتیَ گوتی قەزات لەخوَم نازدارێ　　بوَچ ئەوجغارەت هاویشتەخوارێ
:ئەوە پیَتبلَیَم هوَشت لەخوَبی　　دەبیَ جغارەی من، هەرلەکنە توَبی
پیَك هاتن زوَر زو، قەراریان دانا　　سەعدون بچتەلای، لە دیوەخانا

خانم سندوقێ، زۆر زلی سازکرد / لەنیو سندوقا، جێگەی پێ ڕازکرد
هەرکەسێ، هاتبا بۆ هەرئیش و کار / سەعدونی دەخستەنێوسندوق بەغار
بۆ دەروژوران سێ زەنگ دانرابون / بۆ هاتوچۆیەو بۆ خەبەرداربون
یەکیان دەروازەوسالۆن دوهەم زەنگ / سێ هەم پاشخانە بکاجنگ ودەنگ
ڕۆژێك بێ ئەوەی یا فکرێك بکا / کاری چیەو لە کوێ یا سۆزێك بکا
ئەحمەد بە بێوەخت هاتەوە بۆ ماڵ / سەر لە خانمدا و بیپرسێ ئەحواڵ
شروشەپرێوی کە بە چاوکەوت / خرپەی لەدڵی هات غەمزەی ڕێ کەوت
بو لای ماموستای ئەحمەد گەڕاوە / ئەوجورەی دیبوی چو بۆیگێڕاوە
:بیبەستە زەنگی دەروازەی دەرێ / بێ ئاگاکردن، زو بچوێ سەرێ
زەنگەکەی ئاخنی، وەختی چێشتانێ / خێرا سەرکەوت چوّ حەرەمخانێ
بە دو زەنگەکەی، دی خانم بزوت / شروشەپرێوو سەرو سینگی ڕوت
خانم! بۆڕوتی؟چ بوە،چەقەوما / نازانی هیرشی، هیناوە گەرما
زەنگی دوهەمت کە بەجوانی بەست / بچوبۆسەرێ بێ خشپە وبێ هەست
چۆ سەرێ پاشی بەستنی زەنگی دو / شەپرێوتری دی لە جاری پێشو
ئەی ئەهلی مەجلیس، جەنابی قازی / ورد لێی بروانن ڕازی و ناڕازی
عەمەلی ژنان ئەوەتا وایە / کێ بی نەی دیبێ ئە لە ودونیایە
خۆت ڕوتکردەوە هەی دیسان خانم / عەیبە شورەییە، قەزات لە گیانم
بە خوای ئەحمەدشا، هێندە گەرمایە / پشوم لێبڕاوە، وسۆزەی بای نایە
چووە مەدرەسەی، مەلای حاڵی بکا / بو ئاخری و د وایی جا ئەوجار چی بکا
زەنگی سیەهمیش کپ بکەو بێدەنگ / بابەینێك وابێ نەدەنگ بێ ونەزەنگ
ئاخری بەست و چو سەر وەك بزوت / لە سەر سندوقێ خانم دانیشت، ڕوت

زانی چی هەیە لە سندوقدایە — چۆن ئاشکرای کا، نەدۆزێ کایە
هێند پەرێشان بو بەو وەزع و حاڵە — لێی بوە جەهەننەم ئەو ژین و ماڵە
وا دەورەیان دابو، غەم و پەژارە — چۆن دەبێ داخوا ئاخری ئەوکارە
چۆ نێو چوارباغی بە تێك چڕژاوی — سپی هەلگەراو ڕەنگی گۆڕاوی
دەروێشێك هەبو دەژیا لە نیو غار — کەمتر واهەبو بێتەوە نێوشار
ڕوحی کچێکی لەبار و جوانچاك — لە عەسای کردبوو، بە منداڵی و پاك
کەنگی پێی خۆش با عەسای هەڵداویشت — بوێ دەبوبەژنێك، لە لای دادەنیشت
بەینێك وا ڕایئەبوارد بە کەیف و خۆشی — بۆ وەزعی خۆشتر زۆر تێدەکوشی
وا،حالی ئەبو، ژن، سەربزێوە — خوی لە عەساداو هی ویش لە سێوە
سەری سوڕمابو، چ بیرکاتەوە — دەروێشەکەی دیو وەخۆهاتەوە
لە بن دارێکی، گەلاگەش و جوان — ئاوا هات دانیشت بە بێ سێو دوان
عەسای هەڵاویشت، بو بە ژنی جاران — ماچ و موچ باری وەك ڕێژنە باران
پاش سەیرو سوحبەت لەگەڵ نیگاری — مامدەروێش، خەوی بە سەردا باری
ژنە دەرمانی بێ هۆشی هینا — بە بەردەم و لوت و سەریدا هینا
بێ هۆش بو، زوێکی، سێوی هینادەر — هەڵیاویشت لە سێو لاوێك هاتەدەر
لەگەڵ ئەولاوە، دو دڵ دو دڵدار — ڕایانبوارد تاوێك ژیانی ڕۆژگار
دەستی بە سەری دڵداردا هینا — بوی بوەوە بە سیو، لە گیرفانینا
بە بونی بوسو، وەهۆش هاتەوە — خەریك بو، کەل و پەل، کۆکاتەوە
دەستی ڕەسەری ژنەی سو بێ هەست — بوێ بوەعەساوهەستاگرتیە دەست
هەستا، خەریك بو دەرکەوێ بڕوا — ئەحمەدشا، نەیهێشت، گێڕایەوە دوا

دەبێ نیوڕۆژێ،میوانی من بێ          ڕەنگین و جوانیت، لە خوانی من بێ
دەروێش ڕازی بولای ئەحمەدماوە          ئەحمەدیش خێرابۆماڵ گەڕا وە
جوی لە کارگەرو دەستو پەیوەندە          قەرەواش، بێکار یا چەند ئەوەندە
میوانمان هەیە، خانم بۆ نەهار          شێوی شەشکەسان سازکەبەئەژمار
کێ یە میوانمان؟ دەروێش سەعیدە          وشیار و ئاگاە، زۆرزان، گەڕیدە
میوان یەك، ئەمەش،دو هەر سێکەسین          سێکەسی دیشن،کوانێ ئەوان کێن؟
سێ مەجومعانم بۆ بنەخشێنە          مەجمەیی بۆ دوکەس حازرکەو بێنە
نەهارێ سازکردزوێکی بۆێ هێنان          سێ مەجمەی جوانی هات لەپێش دانان
خانم مەجومعێك بۆ تۆ وەرە پێش          ڕەفیقت بێنە ئەتو مام دەروێش
خو من هەر تەنیام، بێ ژن وبێ ماڵم          هەروا سەییاحم، بێوەزع و حاڵم
ناچارم بابڵێم، بیانوی پێناوێ          دە ی هەستە خاڵۆ، عەسات هەلاوێ
لێی ئاشکرابو سیڕی تێگەییشت          ناچار هەڵستا، عەسای هەلاویشت
لەناکاو گوڕا، بو بە ژن عەسا          خانم ئەوەی دی ولە وێ عەبەسا
دەڵێ خوشکم، تۆش، بێنە ئاواڵت          دەروێش دەی بەستۆم،سەدجاروەباڵت
ڕەفیقی ئەبوە لە من بەولاتر          ئەمن دەزانم زۆر لە تۆ چاتر
ئەو بەزم و ڕەزمە، هێندەی پێناوێ          دەی هەستە ئەتۆش،سێوت هەلاوێ
بەوقسەی تێك چوڕنگی بزرکا          ناچاربو ئاخر، یان دەبو چ بکا
هێنایەدەرێ سێوێك، گەش و سور          هەروەکو،کوڵمەی دەدرەوشا لە دور
سێوی هەلاویشت، بو بە کوڕەجحێڵە          مامدەروێش کەماشێتبێ لەو فێڵە
ئەحمەد تێیڕاخوڕی، دانیشە لە وێ          جا بزانە ئەوجار ئەمن چمدەوێ؟
بۆ ئێوە چۆنم ڕەفیق پەیدا کرد          بە بێ مەعتەلبون،وا بە دەستوبرد

دەی هەستە چیدی خوت مەخافلێنە بو ئەو ئاوالەی منیش، ئاوالێك بێنە
لە قسەی ئەحمەدشادەرویش زوو زانی فێلی‌لی‌کردوە، وەك خوی خێزانی
دە خانم فکری، ئەویش لێی‌روانی زانی نورەی ویەوپاش سێ ودوانی
خانم! مەرگی خوت، تو سەری خالت ئەتوش زو هەستە و بێنە ئاوالت
زور ترسا خانم بە لەرزو تاوە دەستەونەزەربو، ولامی داوە
باوەڕم پێبکەن ئە لەو دونیایە رەفیق و هاورێم، هەر ئەحمەدشایە
ئەی ئەهلی مەجلیس، جەنابی قازی ورد، لی بروانن، رازی و ناڕازی
عەمەلی ژنان لە گشتلا قاوە لەو فروفێلە، چیمان بو ماوە
دەرویش چو ژوری زور بێ حەوسەلە شەقێکی هەلدا لە سندوقەزلە
سەعدونی لەنیو سندوق هینادەر ئەحمەدشا دەلێ کارمان بو، یکسەر
خانمی دەرویش و ئەو لاوە مەجمێك ژنکەکەی من و ئەو کورەش وەکێك
مەجمەی سێهەمیش ئەمن ومام دەرویش فەرمون بسم‌اللەلەخوان وەرنەپێش
ژنیان تەلاقدان، بێ هەراو کێشە هەردو،ئەحمەدشاوئەو مام دەرویشە
لەو وەزعەی خەراپ کەبوی هاتەپێش بەجارێك تێکچو، گوڕا مام دەرویش
بەینێك پێکەوە، ژیان؛بە بێ ژن و مال بو هینانی ژن، نەیانبو خەیال
ئەحمەد.دەرویشی رۆژی دەدوێنی فکر وبیری خوی پی‌ڕابگەیێنی
پێم خوشەباشترلەمن حال بێ خوانەکایاخو لێم نا رازی بێ
:بو هیچ کارو مال خودانا مێنم هەرژنی تو بلەی حازرم بوت بێنم
:روحی ئەو ژنەم هەر بە مندالی کردبومە عەسا، بە شلکی و کالی
کەمتر وامەبو خەلکی ناسیبا تەنیا کەراباو هەموجیێ د یبا
لەنیو غاری چول، پێکەوە ژیابوین بو یەکتر وەکو، فریشتێك وابوین

ئاواش فرسەتێ وەدەست خوێ بێنی　　خەیانەتێ بکا و خوێ بدۆڕێنی
شەرت و عەهدبێ هەتا بمێنم　　ئە لەو دنیایەی قەت ژنناهێنم
ئەحمەدشا دەڵێ هێشتا من لاوم　　زۆر ماوە، ماوەو ڕێگەی نەبڕاوم
تا حیکایەتی، قەلێ دوایی هات　　دانیشتوان هەمو بێدەنگ، کڕو مات

## وتاری کۆتر

ڕوی‌کردنێ ئەوەی لە مەجلیس‌دابون　　وەکو بەڕپرسێك، تێیان‌ڕامابون
لە قەل حاڵی‌بون چی کرابی ونەکراو　　ئی دەدڵی‌دابی هەڵی‌ڕشت تەواو
هەرچی بوی‌گوتراو هاتە سەر زاری　　بێ ئینسافانە، یان بە زۆرداری
لەخۆبایی نیم خۆ من وەکو قەل　　دەزانم وەك قەل بۆم نارەخسێ هەل
ئەی ئەهلی مەجلیس! جەنابی مەلا　　زانای، تێدەگەی ئەلحەمدولیللا
بەڵێ، ژن هەیە، ژنۆچکەش هەیە　　پیاو هەیەو،ئاخرپیاوۆچکەش هەیە
خواجە حەسەنێك لە شاری بەسرا　　هەبو باش تاجر، دەوڵەمەند، دارا
بۆ تۆجارەتێ گرتی تەدارەك　　کاروانێك ئەسب و وشتری مەبارەك
هەر لەو گەڕەکە، ژنێك لەگەڵ شوو　　دەژیان بە بێکار، بەلام بەئابڕو
دەژیان بە هیوای، چیمان نسیبە　　میرزا براییم بو، لەگەڵ حەبیبە
پیێ‌گوت میرزاتۆش بۆناچیەسەفەر　　:بە چی بچم کوا پوڵ کوانی بارەبەر
ئەو سێ گەوهەرەی ژێر پرچم‌دایە　　یەکێیان بۆ تۆ بێ، بیکە، دەسمایە
:ئەسب و ئەسبابی، سەفەرێت سازکە　　ئە لەوبێکاریەی دەخۆت دەربازکە
گەوهەری فرۆشت زوکردی بە پوڵ　　بو بە هاوشانی، پیاوی زۆر ماقوڵ
حەبیبەوکارگەربەجێ مان لە ماڵ　　بە تەگبیرو ڕاو نیشانە و ئەحواڵ
لەگەڵ کاروانی، ڕۆیین چەند مەنزڵ　　خواجە،میرزای دی وەهەروا لیێ‌بوسڵ

دانیشتبون قسەومەجلیس عاموخاس | هەرکەس لەلایەك لەشتێ دەکرا باس

خواجە حەسەنی دلڕەشی نەزان | ڕوی کردە میرزاودەستی کردبەقسان

لای خۆت تۆهاتوی دەوڵەتت زیادبێ | ژنت، توێ دەرکرد تا خوێ ئازادبێ

میرزا تێی ڕاخوڕی، بەس بوختان بکە | بەس قسەی بێجێی ناو خێزان بکە

خۆتۆ ژنەکەی خۆت وەك من ناناسی: | خۆت هەڵدە کێشی مشتی کراسی

دەبا گرێوێ بکەین، هەر بۆ موتمانە | لە سەر کاروان و هەرچی پێمانە

میرزا پشتئەستوربو، زۆر بە خێزانی | گریوەکەی کرد لە سەر کاروانی

خواجە بە بێ هەست بۆ شار گەڕاوە | باسی گرێوی چوو، بۆ هێن گێڕاوە

وابکە بی بینم، با لە حزوربێ | چونی بۆت پێك بێ یان با لەدوربێ

هەی هاتە خواجە بۆت ناچێتە سەر | ئەوژنە لە ومالەی قەت نایێتەدەر

چەنگێکی پڕی، پول کردە کۆشی | چۆن چاکە، دەبی ئاوا تێبکۆشی

ساڵێ هەمیشە پاشی نیوەشەو | بۆغوسل ونوێژی هەڵدەستێ لە خەو

وەرە پێمبڵێ، ڕێگام بۆ خۆشکە | لە کامەلایە پلوسك و شۆرکە

ئەوە لەوبەرزە! سەرت هەڵێنە! | نێردیوانێکی درێژم بۆ بێنە

شەو هەمو شەوێ تاوێك تا تاوێك | کونێکی تێکرد بە قەد جێی چاوێك

هاتە سەر شورکە لەو کون و دەرزە | د یتی، ئەك ئاوا بەو تۆوتەرزە

دو گەوهەر لە بن پرچی دەتروسکان | زو هاتەخوارێ ولە دارو پلوسکان

زۆر زو گەڕاوەوبولای کاروانی | هەرگەییشتەوەو، لە میرزای ڕوانی

هەرڕۆژی ئەوەل ئەمگوت ئەوباسە؟ | کوا ژنت هەتیوە؟ بۆتە ڕەققاسە

چەپلەی لێدەدا لە قاوەخانان | هەرشەو لەشوێنێك لای پیرو جوانان

نیشانەش ئەوە، دو گەوهەری گەش | دایناوە پاش سەرلە بن پرچی ڕەش

قاقا پێکەنی؛ میرزا چی لێ هات؟ — باڵەلای خۆم بێت بۆهیچکوێ نەڕوات
ئەو قسەی کەبیست میرزای ماڵ وێران — خوێ دێیرودەوێ دەکوتاوەک کوێران
هەرچیکی پیێبو لیێئەستاند حاجی — کردیە وەرگێڕکەش بە ناعیلاجی
هەرکات، چومەوە، ڕەمزو نیشانە — خاڵێکت لەنیو سینگو مەمکانە
قسەی دەدرکاند وا بزرکابو — قولە ڕەشێکیش لە کاروان‌دابو
گوێی بو قسەکانی هەردوکان ڕاگرت — نیشانەو وتەی بە دڵ جوان ڕاگرت
قولەش گەڕاوە بە بۆنی کەباب — تا گەییە ماڵێان، کردی دق‌الباب
پرسیان ئەتۆ کیی پیی‌گوتن نیشان — دەرکیان کردەوەو قول خۆی دانیشان
بە خوو کارگەری، کوتایان بە دار — چی لەدەستنەهات جویی دادو هاوار
:دەبێ پێم‌بڵەی زۆر ڕێک، بە جوانی — بۆی‌گێڕانەوەو، باسی کاروانی
حەبیبەی جوان‌چاک، کوڵمەی گلۆکی — تازە، ئەوساڵەی هاتبو بە بوکی
ڕێکو لەبار وئەو قەلافەتەی — چاوجوان، بەدیمەن، ئە بە وهەیبەتەی
بالابەرز، قەدی وەک داری چنار — ئاوا خولقابو،نێرانەو بەکار
قۆڵی لێ هەڵکرد، بستێنی تۆڵە — بشکێنی ژیست و پیستی، ئەو زۆڵە
گەوهەرێکی دی بردخوردکردەوە — خۆی تەواو گۆڕی بە گشت کردەوە
بەرگێکی جوانی، پیاوانەی پۆشی — بۆ ڕێکوپێکی، وجوانی تیکۆشی
چەند نۆکەری گرت، زیرەک و چالاک — بۆ تەقڵەبازی و لە شەڕیش بێ‌باک
ئەسب و ئەسبابی خۆی‌و پیاوانی — کرینی وەکێک هەموی بەجوانی
پێ ڕاگەیاندن، بە نۆکەرانی — من ئەحمەدئاغام، ئەحمەد کوێستانی
کەوتنەڕێ، بەرەو شاری بەغدایە — چەند شەوو ڕۆژان، ئە بەو گەرمایە
ئەی ئەهلی مەجلیس جەنابی مەلای! — ئەلحەمدولیللا، تیدەگەی زانای

بەڵێ ژن هەیە و ژنۆچکەش هەیە    پیاوی پیاو هەیە و پیاۆچکەش هەیە
وەختێ گەیشتنە، ئەوشارە گەورە    خوی پێناساندن، بە چوك و گەورە
خۆشترین جێگا، جوانترین خانوو    بە ئیجارەی گرت بۆ بڕو بیانوو
بەحاکم ودەستەش خوێ پێناساندن    ڕەوت و هەیبەتی، هەموی تاساندن
من ئەحمەدئاغام، کارێ هەتانە    ئەحمەد کوێستانیم، پێم کەن مەتمانە
ئەوجارە ڕۆیی کەوتەدوی حاجی    چۆنی تەنبی بکاو بستێنی باجی
دەریشی کردبو، میرزای خالبەسەر    ناچاربو، ببو بە شاگرد مسگەر
گەڕا، دوکانی وەستای دیتەوە    قاپی پیسمان هەن، بۆن سپیکەوە
هەر ئەو شاگردەم، لەگەڵ بنێرە    قاپ و قاچاغان، بێنێتە ئێرە
میرزا برایمی نارد تا قاپان بێنی    لە ڕێی تێیگەیاند زۆر بە نەێنی
میرزا لە غەم و فکر و پەرۆشی    هەر نەیناسیوە، ژنەکەی خۆشی
ئەتوبۆنایەی، وەك ئەو پیاوانە    پاك و خاوێن بی، بڕژی وشاهانە
وتی پێمخۆشە، ئەو هاتەلات    ئەسپێکی بۆکڕیو دەستێکیش خەلات
چووە لای وەستا بۆ مالاوایی    هەرچوو هاتەوە زۆر بەخێرایی
بەرگە کۆنەکەی مسگەری وەرگرت    بۆ قسەو باسی،دواڕۆژی ڕایگرت
گەڕاوچو، حوجرەی خواجەی دیتەوە    نیشانەی کردچۆن بیناسیتەوە
پێویستی و مۆر و ڕەژی دەستدانێ    بە بەرگی ژنانەی تا کەس نەزانێ
پڕژاندی دەرمان لە میژو گوێزان    هێنای گورجێکی لە بوخچێکی نان
مەنزڵ و حوجرەیوا، پێدەزانی    لێی وەژورکەوت، خواجە لێی ڕوانی
بێدەنگ بو، هەتا چولبو دوکانی    ئەوجار ڕایگەیاند، وەختەکەی زانی
وائێژن، ئەتۆش، گەوهەرێکت هەس    ئێکیش لای منە، تۆ بیزانە و بەس

هاتوم لێمبکڕە، یان پێمبفرۆشە    بۆ هەردو ڕازیم، کامەی پێتخۆشە
:مزگێنیت کەوت، من لە خودام دەوێ    ئەو گەوهەرەی دیش، وەدستمکەوێ
هەستە، ڕێککەوین، بۆ ماڵێ با بڕۆین    تەماشایانکەین خواردنێکی بخوین
هەر ڕۆیین دەرکەی داخست تا حەوت    پێیوابو مەلەو دەئەوداوەیکەوت
تا درەنگ نەبوە، زو بۆم بێنەدەر    دەڵەیچی بۆ تۆ هەر خۆمم گەوهەر
دەی باشەخو منیش بوئەوکارە سازم    شەرتیە نەشکێنی، ناموس و ڕازم
دانیشتن بە قسەی خۆشو گوفت وگۆ    مێوژوگوێزم پێن،داهابڕێکان بخۆ
خواجە زروقاوە، زۆری پێخۆشبو    هەر دودەنکی خواردزویەکی بێ هۆشبو
بێ هۆشتری کرد بە بۆنی دەرمان    تابڵەمە و ڕەژێو مۆری دەرینان
پاش بێ هۆشبونی بەرگی لەبەرکرد    سوربوە مۆرو سمتی پێ مۆر کرد
دەخویندرایەوە، هەر زۆر بەجوانی    لە دورڕا ئاغا، ئەحمەد کوێستانی
دەرکەی هەڵگرتن، گەڕاوە بۆ ماڵ    پاش چەند ڕۆژان چو تا بزانێ ئەحواڵ
چەند پیاوی بردن، بەرگیان بۆ بکڕی    دوستایەتیشی دەگەڵ دەرببڕی
قوماشم، دەوی،گەش وجوان وڕەش    بەرگی مەحمودو قادر، بۆ حەمەش
هەمانە، نەیتوانی، وا خۆڕاکێشی    زانی، جی موری هێشتا زۆر دیشی
:خوانەکا چبوە، بۆت بە پەرۆشم    :ئەحمەدئاغا گیان کەمێك نەخۆشم
جارێ لێیگەڕێ، زەحمەت مەکێشە    کاری دیکانەم، هێشتا لەپێشە
چەندڕۆژی دیکەش خوێ لێبواردجارێ    ڕۆژێك چوو دوکان، وەختی ئێوارێ
کوا، ئەو قوماشەی ئەوڕۆژە دامنان    بو ڕانك وچوغەی خۆم و پیاوەکان
گورجێك دای هاتێ و هێنایە پێشی    جا ئەوجارزانی هێچ جیێ نایێشی
چەند دەستی لێکڕی، هەتا نەزانی    خوشیێ حازر کرد سبحەی بەیانی

به ڕێك وپێکی، بۆخوی و چەند پیاو
هەمویان ڕێك ولەبارو زۆرشیاو
کوتێ دەرکەوان بڵێ بەپەلەیه
عەرزێکی چوکم لای حاکمی هەیە
وا ئەحمەدئاغای کوێستانی لێرە
با بێ تا بزانین چی دەوێ خێرە
عەرزی حاکمی کردگەورەم سەروەرم
لە جێی گشت کەسم ئەی تاجی سەرم
بۆ دیداری خۆم دەگەڕێمەوە
بۆ پێی جەنابت ڕەنگ بێ، بێمەوە
لە پیاوە کانم ئیکێیان تۆراوە
لێرە، بازاڕ و حوجرەی داناوە
ئەمریفەرموی، بێتەوە لای خۆم
بۆ خواحافیزی، پێش، ئەوەی بڕۆم
ساحیب ئیختیاری، وتەت بەجێیە
پێمخۆشە بزانم، پیاوەکەت کێیە ؟
ڕەنگ بی بیناسی،خواجە حەسەن‌ناو
خواجەی بەسرایی ئەی دەمخۆش تەواو
وەکو من بەشی، ئەتۆ لەو ماڵە
بەلام ئەو حاجیە زۆر لەمێژساڵە
هات وچو دەکا، ئەو قسە با بەس‌بی
نەمزانیوە قەت پیاوی هیچکەس بی
:بی‌ئەدەبییەوزۆریش بی‌جی یە
بەلام بووکارەی، من بەلگەم پێ یە
چی پیاوەکانمن، هەموم هیناون
مۆری ئیوی خۆم لە سمتی داون
بی‌لایەنێك بێت با لێی‌بڕوانی
کێشەن خەلاس‌کا، خێری ئیمانی
حاکم، زۆر تێكچو، بەو قاڵ و باسە
بە ناعیلاجی فەرموی دەی خاسە
ئێمە هەمومان بەوە بوێن ڕازی
مەجکەمەیی ناوێ و چونە لای قازی
خواجە حەسەن بێ، ڕوت بکرێتەوە
ڕاست بێ یان درۆ سور بکرێتەوە
حاکم ئەمری کردخواجەحەسەن هات
تێی فکرین کوتێیان، ئاغا ڕاست‌دەکات
خواجە حەولیدا ئەو کارە گەورەی
هەر بیسوڕێنی ئەو باس و دەورەی
شاش ویستی بگۆڕێ بەنەفعی حاجی
یا تەحویلی بدات بە ناعیلاجی
بەبێ ترسی گوتی وا ئەحمەدئاغا
زۆر بە ڕاشکاوی لە نیو وەتاغا

من ئەو پیاوەی خۆم نادەم بەوشارە    یاساو قانون کوا، بەوەبڵێن کارە
حاکم ناچاربو، خواجەی دا دەستی    هینایە مزلیٚ زۆربە تەڕد ەستی
بەرگی نوکەری لەبەر خواجەی کرد    سایری نوکەران، ئەسپی خوی زین کرد
سواری ئەسپانبون هەمویان ویٚگرا    ڕیٚکەوتن بەرەو ،ماڵیان بۆ بەسرا
پاش چەندشەوورۆژ گەینەوەماڵیان    یەك یەك لیٚیپرسین لە ژین و حاڵیان
شوین و ڕۆژیٚکی بوی دیاریکردن    لیٚك کوببنەوە بوی مەعلوم کردن
ئیجازەی پیٚدان هەمو بچنەوە    هەر خواجەومیرزای لابمیٚننەوە
میرزائاخرتۆش دەبچۆوەماڵیٚ    لەترسی خواجەی زانی چ ناڵیٚ
ماڵتان لەکویٚ یەخواجەبابزانم    تۆش ئیجازەبدەم وەك پیاوەکانم
کاغەزیٚ بنوسەدەبڵیٚ پیاوی تۆم    مۆری کەوتەواو،زویٚکی بیٚنەبۆم
کاغەزی مۆرکردتاهەرکات وسات    چی ئەحمەدئاغا لیٚمان داواکات
چی لەمنی بویٚ هەرتابمیٚنم    بەبیٚ دواکەوتن بۆی بەجیٚ بیٚنم
ئیقراریٚ دەکەم،حازربەئیمزام    تاهەم نۆکەریٚك،بۆئەحمەدئاغام
جائەوجارئاغابانگی خواجەی کرد    ولاٚ می لیٚ ویست ئەوپرسیارەی کرد
ڕاستیم پیٚبڵەیٚ بە خوا ئازادی    دەنا قازی خۆی دەپرسیٚ دادی
تۆ ژنی میرزات لە چەند چاخانان    دیتت سەما بکا لە پیٚش بیٚگانان
لە کام ماڵتدی؟ لەگەڵ کام لاویٚك    لە کامە جیٚگا، لە کام کەلاویٚك
خواجە هیٚند ترسا، هاتەوە بیری    زۆر تاوانبارەو چیٚیە تەگبیری
ناچاربو بیڵیٚ و خۆشی بشکیٚنی    ئەگەر لە دونیا چی بۆ نەمیٚنی
:گەورەم من بە خوا بوختانم پیٚکرد    بە پاکی و چاکی، حەسودیم پیٚ برد
دەنا خۆ ئەوژنە لە دونیا تاکە    لە ڕاست هەموشتیٚك وەك شیری پاکە
:پیٚم خۆشبو بۆخۆت وا ئیقرارت کرد    بوختان و درۆت لە سەر خۆت لابرد

بو ئەو گریوەی چت ئەستاندووە بە بێ کەم و زۆر بێنە بیدەووە
شەرتیە پێمنەڵێی قسەی سوك و کاڵ چی ئەستاندومە وشتر و ئەسپ و ماڵ
بو ئیمە ئیمرۆ تۆ لە جێی قازی هەرچی تۆ داینێی، پێی دەبم ڕازی
چەندی داینابو، چو بوێ هێناوە لای ئەحمەدئاغا تەحویلی داوە
ئەی ئەهلی مەجلیس، جەنابی مەلا تیدەگەی، زانای ئەلحەمدلیللا
بەڵێ ژن هەیە، ژنوۆچکەش هەیە پیاوی پیاو هەیە پیاوۆچکەش هەیە
جا ئەوجار میرزا دەگەڵ خێزانی چونەوە ماڵێش دیسان نەیزانی
لە دەرکەیاندا گوتیان ئەتۆ کێی بەو درەنگوەختەی لەدەرکەیێ دەدەیێ؟
:من میرزا برایمم دەرگا بکەوە لێم نیشانەکەشمت، ئەوە پێدەڵێم
قەرەواشەکە دەرکی کردەوە میرزا لەو وەزعەی واقی بردەوە
حەبیبە کوانی؟ ئەو قولە کێیە؟ چ بووە؟ چ باسە؟ قول بۆ لێرەیە؟
:پاشی چەندڕۆژ ان کەدەرچوی لەماڵ ئەم قولەیە هات، پێیگوتین ئەحواڵ
حەبیبە لە ماڵ دەرکەوت ئەوکات چیدی نازانم چبووە کارەسات
ئەو میرزا برایمەی وا لێیقەوٚمابو بە درۆو بوختانان کوڵەی کوترابو
ئەوەشی کەبیست کەمابێ هۆش بێ حەبیبە وای د واند ئەوجار دڵخۆش بێ
بێ پەردە و پایە خۆی ئاشکرا کرد ئەو دڵەخورپەو دودڵیەی لابرد
کەم مابو گیانی دەرچی ونەزانی لە ئازایەتی و مەردی خێزانی
پێك شادبونەوە ئەو ژن و مەردە پەندیان هاتەدەست، لەو هەمو دەردە
زۆرخۆشیان ڕابوارد خولاسەی کەلام تێروپڕ، بێخەم دانیشتن، بەلام
میرزا وایکردبا دڵی لێیبێشی بەرگی مزگەریەی دادەنا پێشی
دیسان وەڕەزی گرێوت کردووە؟ ئەوکات و دەمەی تازە ڕابدووە

قەیاتی کوتریش، دوایی کە پێ هات
دانیشتوان هەمو، مات لە کارەسات
قەیاتی هەردوان، چون زۆر بەهێزبو
پوخت و پاراوو خوش و بەپێزبو
جوجکەش ماندوبون لەو هاتوچونە
هەڵفڕین بونە وقەلەی سابونە
ئەی ئەهلی مەجلیس، جەنابی مەلا
تێدەگەی؛ زانای ئەلحەمدولیللا
بەڵێ ژن هەیە، ژنۆچکەش هەیە
پیاوی هەیەوئاخر پیاوۆچکەش هەیە

## نامەی دۆستێك ولاّمی بە شێعرێك

کاك فەقێ ئەحمەدی شیوەمێرێ نامەیەکی لە مانگی ڕەمەزانی جستانی ساڵی هەزارو سێسەدوحەفتاو هەشتی هەتاوی بۆناردبوم و بانگ هێشتنی کردبوم نامەکەم درەنگ پێگەیی و پێشم خۆشنەبو دە ڕەمەزانیدا سەفەرێ بکەم بەئەو چەند شێعرانە ولاّمم داوەتەوە.

کاکەفەقێ گیان برای دێرینم
ڕەفیق وهاودەم تاڵی و شیرینم
ها و بیری ڕێگا ی بە رزو پیرۆزم
هانەدەر بۆ ورەی پاك و دڵسۆزم
دادەی پێم بڵێ ئەحواڵت چۆنە
چۆنی چۆن لەگەڵ ئەو دنیا کۆنە
ئەحواڵی خوۆت وبراو بەڕێزان
دەپرسم دەگەڵ گشت ماڵ وخێزان
پێتوابوهەرتۆی ئارەزوت کردوم
خو ئەمنیش لەسویی یارانم مردوم
پێمخۆش بولەگەڵ کۆی دۆست ویاران
دانیشتباین بێخەم وەك جاری جاران
هەرنەبێ جارێ،یەکتر ببینین
لای خۆیی شەریك بۆ،زۆرشای و شینین
نامەکە لە وەخت درەنگتر گەیی
شاهیدم هەیە نەیکەی بە گلەیی
با ئەوەش بڵێم هێندە پرکارم
لە چەنگ ئەم ژینە نابێ ڕەزگارم
بەخێر با بڕوا مانگی ڕەمەزان
خۆشی وناخۆشی دەستێ نێن قەرزان
چێدی نانوسم بەو زگی برسی
پێمخۆشە وەزعی مەلام بۆ بپرسی

## قەیاتی ئاڵی جوجە

سێ کەس لەبەربێکاری و.وەڕەزیان لە بن دیوارێکی دانیشتبوون، کابرایەك بەوێداهات بەبێ غایلەسەلامی لێکردن و ڕۆیشت ئەو سێکەسە لێیان بوە کێشە، ئێکێیان دەیگوت سڵاوی لە من کرد ئەوی دیکەی دەیگوت سڵاوی لە من کرد. سێهەمیش دەیگوت ناوەڵڵــە، سڵاوی لە من کردوە، گوتیان باکابرای بانگ کەینەوەولیی بپرسین؟

بەڵێ کابرایان بانگ کردەوە و لێیانپرسی:ئەرێ برادەر ئەتۆ لــەئەو سێکەسەمان سڵاوت لە کێ هەمان کرد؟کابرا کە ئەوەی گوێلێبوو لــەبەرەخۆیەوە گوتی ئەوە شتێکی تێدایە با بێ سەیر نەبین ولامیداوەوگوتی ئەوەی لە هەموان ئاڵیتر بیت، سڵاوم لــەوی کردوە. جا ئەوە هەرکەسە نەقلی خۆی دەگێرێتەوە:٠

ئێکێیان گوتی ئەمن ڕۆژێکی لە ماڵێ دانیشتبوم قەت وابە غیرەت نەبوم، بە خێزانم گوت برسیمەنانم بۆبێە؟ خێزانم گوتی نانت بەچی بۆ بێنم؟!

ئەمنیش بەزمان سوتاوگوتم بزانە دۆیەك، ماستاوێك دەنالەئەوەی بەرەژێرترچم گوتبا!

خێزانم بە تورەیی.گوتی چی؟! چی؟! چی؟!

ئەمنیش حاڵی بوم ئەگەرلێم لەبەهانەیەگوتم، هیچ، بڕێکم نانی ویشکی خواردو چوومە سەر کولانەی هەرامکردو گوتم وەڵڵاهی دەنا ماستیش و ماستاویش!

خێزانم دەستیدا کوڵەوەژێ و کەوتەسەرم، هەلأتم، نەمگەیشتی؛ کابرا زۆر جوان گوێی بۆڕاگرتبو، گوتی ئێ ئەتو ئاڵی ماستاوی!

دووهەمی دەستی پێکرد گوتی ئەمن زۆرم ئیشتیاله پیوازیبو لە ترسی ژنەکەم نەمدەوێرا پیوازی بخۆم. ڕۆژێکی خێزانم دەستیدا گۆزەی بچێتە ئاوێ،کانیەکەش بڕێك لەئاوەدانیەدوربو، ئەمنیش غارمدا پیوازێکم سپی کردو دەزارمناگوتم هەتادەگەڕێتەوە دەیخۆم ،لەبەرتڕەتاڵوکەی فکرم نەکردەوە ئاخردوایەش بۆنم لەزاری دێ، نازانم لەبەر بەدبەختێ من یابۆچی خێزانم گەڕاوەلەنێودەرکێ تێم هەڵــەنگوت.چاوی لێ کردم، گوتی ئەولاگوپت بۆوائەستوربوە؟ کە پیوازەکەم دە لاگوپیدابو، گوتم نازانم. :بۆنازانی؟!

برێکی دەست لێداوگوتی خوڕەقڕەقە.چۆوسەراوی،ئاوی هیناوهاتەوەلە ترسان نەموێراپیوازەکەی بخۆم یان فڕیێدەم.دیسان برێکی دەستلێدا،گوتی،بێنەبا شلتەی لێنێم.برێکی شلتەلەلاگوپمناهەتاسبحەینێ کەدەستی لێداگوتی هەروەکوخوێ ڕەقە؟

بەلێ! لەئەوزەمانیدا لەهێندێك دییان ئیوا هەبون، برێکیان لە برین و ... دەزانین، پێیاندەگوتن دوکتور یاحەکیم لەئەودییەش پیاوێکی زۆر ڕوح سوك و باشی لێبو، دەگەڵ خێزانم چوینە ماڵە مام حەکیمی، خۆ ئەمن نەم دەوێرا قسان بکەم نەبادا لێم ئاشکرابێ فکرم نەدەکردئاخری ئاشکراهەردەبێ؛

خێزانم پێیگوت، مام حەکیمگیان بزانە ئەوە چیە لە ڕومەتی ئەو پیاوەی هاتوە،

حەکیم هینای برێکی تەماشا کردو دەستی لێدا ڕێکیگوشی گوتی نایەشی؟

گوتم نەخێر گوتی دەبێ شلتەی لێنێم.خێزانم گوتی بەلێ شلتەم لێناوە هەر وەکو خوێەتی.مام حەکیم گوتی نائەمن بۆخۆم دەبێ شلتەی لێنێم ئەوشلتەی ئەمن بۆخۆم ڕێکێ دەخەم لەگەڵ شلتەی ئێوە جیاوازە .

بەلێ دوبارە شلتەیان لە گوپمناو شەوو ڕۆژێکی دیکەش شلتەم بە لاگوپی وەبو. سبحەینێ چوینەوە لای حەکیمی. مام حەکیم دەستی لێداو گوتی هەروەکو خوێەتی دەبێ نشتەری لێدەم خێزانم گوتی بۆخۆت دەزانی! دەستیدا نشتەری و دەگەڵ نشتەری دە گوپی ڕاکردم، تەماشای کرد، پێلکە پیوازی پێوە هاتبوو، زاری لێكکردمەوەو پیوازەکەی دەرهێناو فڕێیدا چەپۆکێکی پێداداو وگوتی ئەدی ئەگەر پیوازت دە گوپی دابو، بۆ دەنگت نەدەکرد، خێزانیشم دو شەقی تەڕو تازەی تێ هەڵدام، هەڵاتمەوە ماڵێ، تازە هەتا هەم پیوازی دەگەڵ چێشتێش هەرناخۆم ونیشتیاشم بۆی ناچی ؟

کابراش گوتی دەی ئەتۆش ئالی سۆغانی!

کابرای سێ هەمیش ئاوای دەست پێکرد:مانگ و نیوێك لە بەهارێ چوبو، ڕۆژێکی خێزانم گوتی دەچمەوە ماڵە بابم، هەتا دێمەوە ئاگات لە ماڵێ بیت دەپێشداپێم خۆش بو؛ گوتم زۆرچاکە، مریشکێکن تازە جوجکەی هەڵێنابون، دە دوازدە جوجکەی لەبەربون،

گوتی، زۆر بەجوانی ئاگات لە جوجکەکانیش بێت هەڵۆ نەیانبات!

گوتم نەخێر ناهێڵم.خێزانم ڕۆییشت وگەڕاوە،دیسان ڕوی‌تێ‌کردم، گوتی، ئێدی ئاگات لێبن،جوجکێك چی لێ‌بێت چاوت‌دەردێنم،جائەوجار خێزانم ڕۆییشت،ئەمنیش کەوتمە فکران:خودایە چ بکەم؟چۆن ئاگام لێبن،دوایەگوتم ئەوەی ناهێنی،بەنێکم پەیداکرد،دەلاقی هەموجوجکەکانم ئێخست،سەری دیکەی بەنەکەم لەلاقی مریشکێ گرێ داوگوتم خۆ ئەوجار هەڵۆ ناتوانێ هەموان بەریت؛جابەخاترجەمی مریشك وجوجکەم بەرهەلاکردن،ئاگام لێ نەبوخەرتەلێك هات،ڕۆبۆمریشکێ وبەجوجکەوەهەموی هەلێ گرتن وبردنی ڕۆیی.

ئەمنیش دەستەوئەژنومامەوە،جائەوجار چ جوابی خێزانم بدەمەوە،دەیگوت جوجکێك هەڵۆ بیبات چاوت دەردێنم، خۆئێستا.نەمریشك ماوەو نەجوجکە!

گوتم، فایدەی نیە، هەستام پێداهاتم هەرماڵەی هێلکێك و دو هێلکەم لێ‌وەرگرتن، ڕۆژی پێش هاتنەوەی خێزانم،چوم لەبن پێرکی جێگام چاك کرد، هێلکەکانم دانان ولە سەریان مات بوم، خێزانم هاتەوە، دەرکە ئاوەلابو، هاتە ژورێ برێکی بوڵەبوڵ کردو:ئەوە دەبی لەکوێ بێت؟! ئەو ماڵە چەند خاوێنە! چمنەگوت، چولە جیرانانی پرسی:ئەرێ ئەو پیاوەی مەو نەدیوە؟!

جیرانەکان گوتیان، هاتوە هێلکەی لە مە وەرگرتوە و هیچی دیکەن ئاگا لێ نیە، خێزانم هاتەوە دیسان گەسکی دەستدایە ماڵێ بماڵی، ڕۆبۆ قولینچکی بەرەی پێرکی هەڵیداوە قیرێکم لێ هات، گوتی ئەوە بۆ لیرەی؟! ئەوە چ دەکەی لێرە؟! گوتم حافرەت مریشك و جوجکە هەمو خەرتەل بردونی، هێندەم نەماوە جوجکان هەڵبێنم لێم‌گەڕێ بۆمریشکەکەش دوایە فکرێکی دەکەمەوە! خێزانم پیلی‌گرتم و لە بن پێرکی هینامەدەرێ و دوسێ کوڵەگەسکی لەسەروگوێلاکان دام و بە شەقان وەدیوی دەرێ‌نام، گوتی ئەوە جوجکە بوبەتوهەڵدێن!ئەمنیش بەئەوجورەی نەجاتیم بو. بەینێکی خۆم لەخێزانم شاردەوە٠ونەمدەوێرابچمەوەماڵێ،

کابرا گوتی وەڵلاهی سەلامم لە تۆ کردوە ئالی جوجە.

## قەیات (ئالی ماستا و) (ئالی سۆغان ) (ئالی جوجە )

### (ئالی ماستاو)

سێ‌کەس دانیشتبون لە بن دیوارێك     بە کنێیان‌دا ڕابرد هێدی ڕێبوارێك
سەلامێکی کرد نەیزانی وڵلا     دەبیت بەبەزم و بەکێشە و هەڵلا
یەك دەیگوت سلاوی لە من کرد بابم     دوهەمی دەیگوت بۆت تەسلیم نابم
سێ هەمیش هەردو وەدروخستنەوە     جا ئەمنیان بانگ کردبۆڕن کردنەوە
هەرسێکیان وێکڕا ڕویان لە من کرد     تۆ ئەو سلاوەت لە کێیەمان کرد
:سلاوی تایبەتیم تەنیا بوو کەسە     ئالێتر لە نێو هەر ئەو سێ کەسە
هەرکەس نەقلی خوێ چی بەسەرهاتوە     سەریان شکاندبێ یا زوهەلاٚ توە
بوم بگێڕنەوە ئەمنیش گوێم لێیە     جا مەعلوم دەبێ ئالێتر کێ یە
یەك دەستی پێکرد وەختی نیوڕۆیە     گوتم برسیمە و ئیشتیام لە دوێیە
هاتە پیش گوتی پێم بلێ گویم لێبی     وات بەسەر بێنم زۆر چاك تەنبێ بی
زۆر ترسام گوتم کواخۆچم‌ناوێ     من پێم‌خۆشە بخۆم هەر نان و ئاوێ
هینامە پێش خوم بڕێکەم ورکە خوارد     بە ماتەوماتە خۆم لە ژنەکە بوارد
لە سەر کولانەی گوڕڕاندم ئەمنیش     دە وەڵلاٚ دەنا ماست و ماستاویش
کولەوەژ بەدەست دیم بە دوامدا هات     بانگی دەکردم من خۆمدا نەجات
مەگەر نەیەوە؟! هەر ڕوم لە توێیە     دەناپێت‌دەلێم پوت چەند کیلۆیێە
پێم‌گوت بەلێ تۆ ئالی ماستاوی     وا لە حاستی ژنت ڕانەوەستاوی



## (ئاڵی سۆغان)

بوێ گێڕاینەوە زۆر بە بێوازی     ئەوەندەم ئیشتیا چۆبۆ پیوازی
بەڵام چ فایدە لە ترسی ژنەکەم     کوا خۆبەتوتوش بوێرم ڕوی تێکەم
ڕۆژێکی دیتم لای چێشتنگاوێ     گۆزەی هەڵگرتن ڕۆیشت بۆ ئاوێ
زو پیوازێکی چوکەڵەم چاکرد     هەروا گورجێکی دە زارم ڕاکرد
چی لە بیرچوبو بۆ چی گەڕاوە     منیش کە دیتم کشامە دواوە
دیتمی گوتی ئەیرۆکوپت بۆ وایە؟!     با بچم بۆ ئاوێ و دێمەوە دوایە
چۆ کانیە و هەروا زو گەڕایەوە     ئەموێرا بیخۆم پیواز مایەوە
دەستێکی لێدا و بۆ دەبی وابی     هێن ڕەقە دەبێ بەردی تێدابی
شلتەی گرتەوە و لە لاگوپی نام     سبحەی کردیەوە و هەروا بێ‌ئاکام
نابی پێت وابێ وەك ئەو زەمانە     دوکتور و دەرمان یا نەخۆشخانە
لە مەنتیقیك و هەمو دەورو بەر     تاقە کەسێك بو ئاوا وەك دوکتەر
پیاوێکی ڕوخۆش، دڵپاك و سەلیم     ناچاربوین چوینە ماڵی مام حەکیم
پێی‌گوت دوڕۆژەگوپی ئەوپیاوە     تێ ناگەم بۆچی وا هەڵموساوە
دەستێکی لێدا و برێکی لێ‌ڕوانی     با شلتەی لێ‌نێم، تا سبەی بەیانی
خۆ دوێنی شلتەم لێ نابو بۆخۆم:     نا تا لێی‌نەنێم مەعلوم نابێ بۆم
هەڵموسا دیسان گوپم بە شلتە     قسەکردنیشم لێ‌بو بە فلتە
بەیانی هەرچوین دەرکەن کردەوە     دیتمی و شلتەی گرت لێی کردەوە
دەستێکی لێداو هەروەك خوێ وایە     بە نشتەر نەبێ عیلاجی نایە
نشتەری هێناو دە گوپمی ڕاکرد     هێنایە دەرێ و کاری یەکلا کرد
پێلکە پیوازێك چوکی بەخووە     هێنا و لێی ڕوانی و لێشی بەربووە

قــامکی نــا زارم پیــوازی فــڕیّدا          مام حەکیم جادەی جنێـوم پـیّ دا
دوکتورجـوت چەپوّك غـاریدا سـەرم          هـەتا هـێزی بـو وا کوتایـە سـەرم
ژنــەش دو شــەق و زللێکــی لێــدام          ئەوەش نەقلّی من خولاسەی کـەلام
هاتمــەوە مــالیّ زوّر بــە نــاڕازی          تـازە قـەت ئیشتیام ناشـتە پیـوازی
دەی کاکـە ئـەتوش ئـالّی سـوّغانی          تـو مـەکرت لـەوی دی چـاتر زانـی

## (ئالّی جوجە)

کـابرای سـیّ هـەمیش وەك پیـاوێکی ورد          تـا خـەلاس نـەبون هیـچ قسـەی نـەکرد
وتـی نوّرەمــە بــە ڕەسمــی ئـەوجار          لـە نیـوەی ڕوّژی مـانگی دوی بـەهار
لە مانگی گولاّندا، ئەو فەسلّی وا خوّش          کێوودەرودەشــت هەموســەوزەپوّش
تــەواوی خــەلّکی ڕوی لــە ســەیرانە          خـانوی بەختی منیش تێك چوە وێرانـە
ڕوّژێـك چێشـتانی ژنەکـەم هاتـە ژوّر          ڕاوەسـتا و ڕوانـی کـەمێك لـە مـن دور
دەمێکـە هیـچ بـاس لای مـالّی بـابم          یـان خەبـەرێك بـیّ تـا دلّنیـا بم
بـا بچـم سـەرێکیان لیّبـدەم بیمـەوە          دەبـیّ ووشـیاربی تـا بگەڕێمـەوە
خـوّ بـە تایبـەتی مریشـك و جوجکەکـەم          دەنکێـك نـەمێنی خـوا بزانـی چبکـەم
پێـم گـوت ئەرخـەیان؛ بـە دلّنیـایی          مالّـی بـابت یـا ن بچیـە سـەر شـایی
کـەمێك ڕوّییشـت و دیسـان هاتـەوە          هـەتا ئەوباسـەی دوپـات کاتـەوە
پێـم گـوت بیّخەمبـە هـەتا مـن مـابم          لـە مـالّ و جوجکـان هـەر غـافلّ نـابم
ژنەکـەم ڕوّییشـت وەونبـو لـە مـالآن          عـەقلّ و هوّشـی منیش ڕوّیـین بـە تـالآن
جـا مـن مریشـکە و ئـەو جوجەلآنـە          چیـان لیّبکـەم چـون بـیّ لیّـیبم متمانـە
کـەم مـابو شـێت بم کەوتمـە فکرەکـان          چـوّن ئاگـام لیّبـن لەمریشـك و جوجکـان
بـیرم کـردەوە خـوّم زوّر مـاندو کـرد          لـەو فکـرەی زیـاتر ڕیـم بـوّ دەرنـەبرد

بەنێکم هێنا و هەموم تێک خستن
لاقی هەموانم ئێکئێک لێکبەستن

هەڵۆ ناتوانی هەموان هەڵبگری
بەخۆم گوت عەقڵە دەکا بەرگری

لە بیر و هۆش و لە زانایی خۆم
تەحسینم دەناردخۆم بۆعەقڵی خۆم

دە ئەو فکرانەدا وا غەرق ببوم
تا خەرتەل نەهات ئاگادار نەبوم

جەلەی مریشک و جوجکانی ڕفاند
بەنی مەحکەمی بیری منی پساند

ژنەکە، دەیگوت جوجکێک نەمێنی
چ بۆخوی بمری، هەڵۆ بیڕفێنی

هەڕەشەی دەکرد چاوم دەربێنی
ئێستاکە بزانی چم بەسەردێنی

دە گوتم ئەو حاڵە ناشێ بەوحاڵە
نەجوڵێمەوە وەزعم زۆر تاڵە

چوم پێداگەڕام هەر لە سەر لاقێک
هێلکەم پەیدا کرد نۆجوت و تاقێک

هێلکەکەم دانان جێ مریشکە کورکی
لەسەریان مات بوم چوم لەبن پێڕکی

تەشریفی خانمیم وەختێک هاتەوە
جوجکە و ماڵ و حاڵ بە سەر کاتەوە

هاتەوە کەچی ماڵێک چول و هول
جوجکە نەمابون کردیە بوڵەبوڵ

ڕۆییشت لێیپرسین لە ژنی جیرانی
داخوا کابراکەم کەس پێی دەزانی

یەک گوتی هێلکێک یەکیش گوتی دوان
هات لیێ وەرگرتین تێکڕا لە هەموان

گوتیان دوای ئەوە هیچکەس نەیدیوە
بچو بگەڕێ، بزانە لێرە لەو دیوە

هاتەوە زوری هەروا بە بوڵە
ماڵ دەڵەی چوڵە، پڕ تۆز و خوڵە

دەی هەویست ماڵێ خاوێن کاتەوە
قاپ و مەنجەڵان پاک بشواتەوە

گەسک بە دەستێک بەرەی گرت و هات
ئەمنیش زۆر هێدی قیرێکم لێ هات

هەرگوتی ئەیڕۆ بۆ لێرەی چ دەکەی؟!
:زو هەڵیاندێنم پەلەم لێنەکەی

هەر پیلیگرتم دو شەقی لێدام
بە کوڵەگەسک و مست وەدەرینام

وەرە دەبڕۆ هەی عەمرت نەمێنی
تۆ چۆن دەتوانی جوجکان هەڵبێنی

بە گەسکەکوڵە و زلّلە و شەق لێی‌دام | هەتا پاش دەرکەی توند وەدەری‌نام
هەتا چەند ڕۆژان خۆ نەچومەوە | شەوشەوە بە دزی بەردەبومەوە
:ئاڵی جوجە من سلاّوم لە تۆ کرد | چون ئابڕوی خۆت و هاوالآنت برد
تا قسە نەکا و تا رنەڵیٚ پیاو | عەیب و زانینی نایەنە بەر چاو



## حەکایەتی سیٚ بزنی مام قەرەنی

لە دێیەکی دە پازدە ماڵیٚدا، مام قەرەنی بەخۆیبەژنێی وکچوڵێکیشی هەبو. دەماڵێکی زۆر شپرزەدادەژیان ،هیچیان دەماڵیٚ دانەبو ئەوەی بەچوار لاقان ڕۆی با پشیلێکیان هەبو ئەویش زۆریان جواب کردبو، بەلآم چونکە ئەو پشیلەش تائەندازەیەك وەکو پشیلەی مینە قوڵەی بیٚشەرم بو نەدەڕۆیشت.

## بەسەرهاتی پشیلەی مینە قوڵەی

ڕۆژێك لە ڕۆژان دانیشتبوم لە ماڵ | سەر پرلەسەودا،دەرون پڕخەیاڵ
سەر پڕ لە سەودادەرون پڕ لە ئێش | دایکم،نان ودوێی بۆهێنامە پێش
نانەکەت بخو نە وشی گیانت بی | بچیٚ کویٚش خودا پشتیوانت بی
کەهات پشیلێکی ڕەقی دمباریك | هەر دیتم دنیام وا لیٚبو تاریك
ختەخت، لە من جەم و دو نانە | ئەتو کە بیخۆی لێت بە سندانە
پشیلێکی سەگ بو دمچەوت نەبو | چەند ی دەنگمدا ئەوزەوت نەبو
:ختە ! گەر بتدەم لە قەدی دیوار | بلآوت دەکەم وەك دەنکی هەنار
پشیلێکی وا ،هێند دم بەردوکە | هەرمن دەنگمداو،دمی نالەدۆکە
تەندور داییسا وا نیلٚدرابو | چۆن سورببووە کەمرەش سوتابو
گرتم فرێم دا کەوتەنێو تەندور | بۆکرپوز پڕی کرد هەموماڵٚ وژور
دایکم کە زانی هات وەژورکەووت | دەست بەکوڵەوەژوەهارێم کەوت

هەتیوە ! سەرت وەك سەری فیلە ئەو بەستەزبانە بۆ وا زەلیلە

پشیلەی سوتاند و لەکۆڵەخۆی کردەوە. بەلأم نەپشیلەی مام قەرەنی ئاواهێندە بێ شەرم بوو.نەمام قەرەنیش دەیتوانی ئاوابیسۆتێنی ولەکۆڵە خۆی کاتەوە

مام قەرەنی بەچەنگ وچرێکی زۆرتەنانەت بەرگ وپێلاوی بۆخۆی وژن ومنداڵەکەشی پێنەکرابو،بەقەرزوقۆڵ نیوەقەرزونیوەنەغد بەئەوهیوایەهیچی دیکەچاولەدەستی عالەمێ نەبین. هەرچەند جیرانەکان، ماڵیان ئاوەدان بیت زۆریان مەمنونم و هەتا مردنێ لە بیرم ناچی، چونکە قەتیان بێ پێخۆرنەکردوین،ئەوە وایە !بەلأم دیسان پیاو ئی خوێ بێ چاکترە. جا ئەبەئەوجورەی دەیخوێننەوە سێ بزنی بە ئەو نیوو نیشانەی خوارەوە کڕین.

## باسی کڕینی ئەو سێ بزنەی

چی هەمبو نەمبو شەش قۆشە دامن بەو بزنە ماست خۆشە

یەکیکێان بزنێ گورد و ڕەش هی دو هەمیش بزنێ پۆشە

سێ هەمیان بزنێ سور خەزاڵ بەهاری زۆر جوان بیاندۆشە

نازانم کوا قەتت خواردوە ماستی بزنان چەندە خۆشە

مام قەرەنی پاش کڕینی بزنان بیری کردەوەوگوتی خۆتفاقمان نیەو؛ وەحەولان کەوت. بەلأم وەبیری هاتەوە لەدییەکی نیزێکی دێی خۆیان برادەرێکی هەبو بە دوسەد سێسەد سەرێکی مەڕ هەبو مام قەرەنی گوتی سبەینی بەیانی دەیانبەم بۆ ماڵە مام سەعیدی قاتی ئینشاللە ئەو سێ بزنەم بۆ بەخیو هەر دەکا، وەختی خوێ زۆر دۆست بوێنە جارێ هەر دە فکری پەیدا کردنی جێگای بزنەکاندابو. بەلێ؛ بەیانی بزنی وەپێشە خوێ دان بردینە ماڵە مام سەعیدی دۆستی خۆشەویستی وجەەڕەیانەکەی بۆ گێراوە؛

یاخوا بەخێربێ میوانی عازیز بەهار چو ڕۆییشت بە شەوی پاییز.

مام سەعید : کوڕە جا ئەوە خۆ پرسپێکردنی نەدەویست بریا بیست بزنت کڕیبا ؟جابابۆن بەخیونەکرابا سێ بزن چیە ؟ !مام قەرنی:ماڵت سەدجار ئاوەدان بی ماڵت بە خانەی خودای بی؛ خودا هەر بتداتی. مام سەعید بانگی منداڵێکی کرد:دادەی ڕۆڵە !

خدرۆکە؛ ئەو بزنانەی مام قەرەنی وەپێشە خوّت دە، بیّانبە نێو مێشەی هەتا ئێواریّ مەڕ دێتەوە ئاگاو لیّ بن، جا ئێواریّ ڕەگەلّ مەڕیان‌خەن.

مام قەرەنی پاش نان و چاخواردنیّ بەخاترجەمی بوّ مالّیّ گەڕاوّە و قسەکانی مام سەعیدی بوّ خێزانی گێرانەوەوخێزانیشی:حەك ڕەببی خودا، سەد هێندەی داتیّ؛ کابرا پیاوی چاکە، بەدلّەو ئاگای لە فەقیروفوقەڕایانە بوّیە خودا هەر بوی تیّدەکا خێزانی مام قەرەنی ئەودەمی زمانی ئاواگەڕا جابابزانین دوایەچونی توك ودوعا یان لیّ دەکا،

مام قەرەنی جارجارەبوّخوی وجاری واش هەبوخێزانیشی بوّپەرەپێدان وپان وبەرین کردنی تەونەکەی چونکەهێندەی ولاّت داگرت بو،دەکردە هاوبیری ویارمەتی لیّ وەردەگرت،گوریس وکوێن وتێڕوجەوالّ وهەموشتێکی لەموی ئەوبزنانەدروست دەکردن وچادروچیغی حازرکردبون،دەفکری پەیداکردنی بێری وشوانیدابو،جارجارەش دەیگوت دەگەلّ مالّەمام بایزی دەبمەئاومالّ ویەك شوانی دەگرین ویەکیشمان بەرخەوانی دەگرین، بزنەکانی هیندزوّرببون هەرسالّی ئەوەلّیّ دوی دوانەو ئەوی دیکەبزنیّ گوردوڕەش زوّر ئاوەدان بو،بەقەت گوێلپارێکی دەبو،ئەوی دانابوسیّ کاران بێنی؛ئەو زستانەی سەدفکری لەئەوبزنانە دەکرد وای حیساب کردبو بە هەشت نوّ دە سالآن دەگەییشتەوەمەڕی مام سەعیدی، چونکەپاش چوار سالآن بزنەکانی هەموبەمەڕدان لەبەرچونەکوێستانیّ. ئاوا بە بیری خوّی وبەخاترجەمی خوّی دەولّەمەند کردبو،ئەبەئەوخەیالآنەلەپایزێڕاخویّ گەیاندە بەهاریّ. ئەگەر زانی مەڕلەزەنیّ پا بوّتەوە ڕوّژێکی یاغریاغر بەرەومالّەمام سەعیدی بوّ هێنانەوەی بزنەکان کەوتەڕیّ.جابابزانین مام قەرەنی بزنەگەل وکارەگەلی پیّ دێتەوە یان هەرلەئیستاوەدەبی شوانیان بوّ بگری لەڕێگایە کەدەڕوێی:

دەچوو بوّ بزن بردنەوە — هێندی بیر لیّ دەکردنەوە
دەڕوێی بەو فکر و بیرە — چەند کاریلەچەند کوێشتیرە
بەڕاستی خوّماستی بزنان — شایانە بوّ میر و مەزنان

بەلّیّ:جەنگەی کە مەڕ بەدان دەهاتەوە، دانەمەڕی بەیانی گەییشتە دەرکیّ مالّە مام

سەعیدی، کارەی مەڕو بەرغەل و هەراو هوریای شوان و بێری ساحیبماڵ، ژن و ژاڵ و منداڵ و چەق ولوری سەگەل و هاش و هوشی بای بەهاری دەنکەدەنکە بارانیشی پێوەبوئەوەل مانگی بەهاری مام قەرەنی کەئەو هەرا وبەزم وهەڵلایەی گوی لێبووئەو بزنەگەل ومەڕەی کەدیت چاوی بەئەودیمەنەجوانەی کەوت شاگەشکەبو،کەم مالەخۆشیان بێ هۆش بێ، هاوێریان کردومەڕوبەرغەل جوی بەجوی بەرەولەوەڕچونەوەکێوی؛مام قەرەنی بۆیەباسی هیچی نەکرد دەیزانی مەڕدانی ئێواری دێتەوە،دەگەل دوستە شیرنەکەی چونکەجاری هەرشیرن بو.چونەژوری دانیشتن ودەپێشداشانسی وی بڕە ژەکێك مابوکردیانەفرۆ،بۆیان هێنا وپاش فرۆخواردنی نانیشیان لەپێش دانان دەگەل ئەۆەل پاروی لەماستی مەڕی دەزاری نا ؟دیمەنەجوانەکەی حەسارێی هاتەوەبەر چاو لەئەو دەمەدیرا.بڕیاری دا ئەوفکرەی کردبوی کەپاشی چەند ساڵان بزنەکانی بەمەڕبدا، هاتەوەبیری حەتمەن ئەوکارەی بکاولەبیری نەچی بەڵکەزوتریش پاش نان وچاخواردنی بەکاۆەخۆ دەڵێ ئەوە هاتوم بزنەکان بەرمەوە. دەباڵەخۆیدا دەیگوت قاتی ئیشاڵلاە دوبزنی خوشێم وی‌دەدا ئەوساڵ بابینەپینج بزنی‌دۆشینی.مام سەعید: یاخوا بەخێر بێی.خۆخەبەرم بۆ ناردبوی،بۆچماپییان نەگوتبوی!خۆ مام قەرەنی فکری مردنی خۆی کردبا فکری ئەوەی نەدەکرد:دەی جا چ قەیدیەئەۆەبۆخوم هاتۆم ئیدی.

میوان بەخێریی یارەبی سەدجار بە دریژی ڕۆژی دوامانگی بەهار
پێم سەیرە دەلێی پییان نەگوتمە خەبەرم داویەی خۆ من دو سێ جار

مام قەرەنی دیسان هەرپیی وابو خەبەری ناردوە بێ بزنەکانی خوی بەرێتەوە یەك دو بزنی زاویشیان ڕەگەل دەخات چونکە ئەو زەمانی عادە ت وابو،کەسێك حەیوانی نەبا، دەوڵەمەندەکان بزنە دۆغەیان وی‌دەدا هەتا دوی بخوات، پیاوی وابو پاییزی بێچوەکەشی نەدەویستەوەو دەیدا بەکابرای فەقیر بۆخۆی بیفرۆشیت یا ...:جا بۆخۆت هاتوی زۆر بەخێربیی؛ بەسەرهاتی بزنەکانت بەئەوجورەی خوارەوەیە کەعەرزت دەکەم:

نەنزانیبو بزنی گوردی هەلات ڕۆییشت بۆ هەلگوردی

بە پەرۆشم بۆ بزنی پۆش — بە خوای ئەویشیان ئەتۆ خۆش
بۆ خەزاڵێش زۆر غەمگینی — کەولی لە بنە خۆت دەبینی
ئێ مەش ئەگەر میوان پێیە — ئەو سێ چوار کلکە گرویێە
ماڵی دنیا چلکی دەستە — تا هەی دڵی پێ مەبەستە

وایان داناوە بزن و مێش — پێیاوی زۆر زو دەهێننە پێش
لە دوایی وەکی گوتراوە — ئاواش زودەیکەن بەدەرویش

مام قەرەنی بە بیستنی ئەو خەبەرە ناخۆشەی کەم مابەندی جەرگ ودڵی بپسێ و تەواوی ئەوهەمو تەونەی دایمەزراندبون وڕایەڵی کردبون بێ تێوەدان مانەوەو هەودای خەیاڵی پساندو گوتی دەك ڕەببی ماڵت وێران بی چون لە سەر ئەو هەمو مەڕەی تۆڕا ئەو سێ بزنەی من ئاوا بەئەودەردانە گرفتاربون و هەر سێ لەبەینچون. بەخوای مام قەرەنی بە سەڵتی وبە سلامەتی گەڕاوەو ئەگەرگەیشتەوە، خێزانی:ئەدی بزنەکانت بۆ نەهێناونەوە؟! مام قەرەنی بە ووردی بەسەرهاتی بزنەکانی بۆ خێزانی گێڕاوە ئەوجار.ژنەش دەستی کردبە توك ودوعاو سینگ کوتانی؛ دەك ڕەببی خودا لیێ تێكدا، ماڵی ویران بی، ؟جاچون لەسەر ئەوهەمومەڕەی وی‌ڕا، ئەو تەقە سێ بزنەی مە مردن و چیان بە سەرهاتوە ڕەببی، لە سەید زەنبیلی تەڵەب دەکەم مەڕەکەی وانیش قڕی تێکەوی و تاقی لێ نەمینی. مام قەرەنی و خێزانی لەباتی ماست خواردنێ خەم و پەژارەیێکی زۆریان بۆ لەبەینچونی بزنەکانیان خوارد ولەباتی دەوڵەمەندبونێ قەرزدار بون و بەرگ و پێلاو و شت ومەکیان پێنەکرا، هەربویە ئاوا گوتراوە:

ماڵت کە هەیەبابڵێین دەچاڵێ دا — ئەگەردەتەوی ساحیب دەباڵدا
بەدەستی خۆت بێ کەمیش بێ زۆرە — بە بێگانەی بێ زۆریش بێ بۆرە
ئەو نەسیحەتەی بە دڵ بسپێرە — کاروباری خۆت بەکەس مەسپێرە

* * *

## هەیاس و تاقیکردنەوەی دۆستەکانیان

کوڕەکەی هەیاسی هەروەکوباوبوە،بابی هەمەکارەی سولتان مەحمودی بوە بۆخۆشی دۆست ورەفیقێکی یەك جارزۆری هەبونە،ڕۆژێکی هەیاس دەڵێ،ڕۆڵەئەوهەمو ڕەفیقانەی تۆ کەهێندەیان دەخەمێ دای و.وەوەکی بۆخۆشت دەبینی چۆنەوچۆنیشیان بۆخەرجدەکەی ماڵەمە ؟هەموڕۆژی دەڵەی مەولودنامەیە،پڕەلەعالەم، ئەوەئەگەر کارێکت لێبقەوەمێ، ئەو برادەرانت یارمەتیت دەدەن، یاهەر یاری نانینەوبەس؟

کوڕەجحێڵەی مام هەیاسی دەڵی بابەئەوانە هەمویان دۆستی گیانی منن نانی چی کێ وەدوای نانی دەکەوێ،هەیاس دەڵێ ئەمن بڕواناکەم،ئەتۆئەوەزیاترلەدوسەت دۆست و ڕەفیقت هەیە، ئەمنیش نیوەڕەفیقێکم هەیە،بابێنین ئەودۆستانەمان تاقیکەینەوە.

هەتابزانین چۆنیان حیساب لەسەردەکەین وبابۆڕۆژی پێویست دانەمێنین وپەکو، پەکوبەکارنایەو بڕیاوامان کردبا ؟بڕیاوامان نەکردبا دەردی مەدەرمان ناکا ؟

کوڕی مام هەیاسی دەڵێ زۆریشم پێخۆشە ؟هەیاس هێنای شەکێکی گوشتەوەبەخوێن وخوڕەوە دەنیو جەواڵێکی ناو لەقولیچکێکی حەساریێ حاشاری داو؟

ئەوجار بەکوڕەکەی گوت جا بچوئەو دوستانەی بە تەواوی باوەڕیت پێیان هەیەو بەدۆستی گیانی خۆشیان دەزانی، هەرئەوشو، بچو بلێ، قەزا و قەدەر ئاوا هاتوە، پیاوێکمان لەدەست زایەبوەو،وەرن کومەگێکم بکەن، بچین بیشارینەوە،خۆئەگەر یارمەتیمان نەکەن .بەتەواوی تێدادەچین وماڵ وێران دەبین؟

کوڕی هەیاسی بەهیوایەکی زۆرەوە چوّ لای دوستەکانی، هەرچی ئەو قسەی پێدەگوت،بەجورێکی خوی لێدەشاردەوە ؟ودەیگوت بە گوڕی بابی خێویەوە، دودەنکە برینجی داومەتێ دەچم کەلاکی بودەشارمەوەخۆم دەکەمەشەریکەقەتڵ و،ئەوی دی شتێکی دی،کارێکی دی دەهیناپێشێ ئی واش هەبو،بۆنی کردبو،یا پێیان گوتبو،چ باسەخولاسە بەجورێکی دیکەخۆی لێ دەشاردەوە،ئاخرەکەی کەس دەگەڵی نەهات؛ وبەتەنێ هاتەوەو هەموی بۆبابی گێڕاوە، بابی گوتی وەمزانی ئەوانەدۆستی گیانی تۆنە

وەکی بۆخۆت دەتگوت جا،نیوە ڕەفیقەکەی منیش فلانە کەسەیە،چت بەڕەفیقەکانی خۆت گوتوە ئەوشۆبچو،هەرئەوەش بە وی بڵێ زیاد یا کەمتری مەڵێ،

بەڵێ، کوڕە.چو بەکابرای گوت؛ کابرا،دەگەڵ ئەوقسەی گوێ لێ بو، بەغار دەگەڵ کوڕی هەیاسی هات، پرسی چبووە؟!

هەیاس دەڵێ چت لێوەشێرم، کارە هاتوە، دەگەڵمان بشێرەوە؛

کابراگوتی،کواکەلاکەکە؟هەیاس کابرای برادەری بردەسەرێ وجەواڵی کەلاکی تێدا بو لەدورڕا.نیشانی دا،کابراش چاوی پێی کەوت و؛

بەڵێ ،کابرای برادەری هەیاسی بێ ئەوەی فکرێکی کردبێ ویالەشتەکەی حاڵی بوبێت ویان چی؟گوتی براله ئەتۆ کەلاکەکەی وەمندەو کارت پیی‌نەبیت، کەس فکرێ من ناکات، ئەمن بۆخۆم دەچم دەیشارمەوە،خەڵك ئەتۆ یاکوڕەکەت دەگەڵە مـن ببینن باش نیەلەوانەیە ئاشکراش بێ، کەلاکم لێ هەڵێنن و ئەنگۆ بچونەوە ژوری.

هەیاس ئەگەر ئاوای گوی لەنیوە برادەرەکەی خۆی بو، ڕوی دە کوڕەکەی کردو گوتی برادەر ئەوەیە؟؟ یان ئی تۆیە؟!

کوڕەگوتی بابە.بەحەققەت ئەمن برادەرم نینە هەتا ئەوڕۆش ئاوایان لێ حاڵی نەبوم ئەوتاقی کردنەوە بەقازانجی من تەواوبۆ وزۆریشت سوپاس دەکەم توشی هەڵەی گەورەتر نەبوم؟ هەیاس؛ زاری جەواڵی کردەوەو کابرا چاوی بەکەلاکی شەکێ کەوت، لیی‌پرسی :ئەوەچیەچەبەزمێکت سازکردوە هەیاس هەردەپیتۆڵێت کردوە؟!

هەیاس:تاقیکردنەوەی دۆستەکانی خۆم و کوڕەکەمە بزانین دوستی کێ هەمان دۆستی ڕاستیە هەیاس دەڵێ وەرە لەباتی کەلاك شاردنەوەی باکەبابی بخۆین کوڕەکەی هەیاسیش تازەڕوی نەدائەودۆستەبەڕێزونانی نانیانەی و تەرکی کردن.



## میوان و هەڵوا

دەڵێن چەندکەس میوانی ماڵێکی دەبن وبەینێکی لەوێ دەمێن ئەوە دیارەئەوجورە سەردان وهات چۆیەجستان وپایزان زۆربوەوبەساحیب ماڵیان دەڵێن پێن خۆشە ئەتۆش جارێکی سەرێکن لێ بدەی ولێن میوان بی.خانەخوی قەولی پێ دان وپاش چەند ڕۆژان چو لەیەکێك لەئەومالانەوەژورکەوت،چەندڕۆژان لەوێبۆ هیچ خۆی نەبزاوت جیێ خۆش بو حەسیروبەڕەلبادو جادوایەدۆشەگیان بۆڕادەخست،ئەوساحیب ماڵە،کەتێی فکری زانی میوان ناڕواوبەتەمانیەهەرلەجێگای خۆی ببزوێ،لەگەل ژنەکەی کەوتنەتەکبیران؛چبکەین؟ چ نەکەین؟!کابرابەژنەکەی گوت ئەوشۆدۆشەگی بۆڕامەیەخە،لەخۆی حالی دەبی وبەیانی دەڕوا،هەرچەندی عەیبیشە.ئەممانازانم چبکەم خۆبەتەمای ڕۆیشتنێ نیە،

شەوێ وەختی نوستنێ،میوان ئەگەرچاوی لەجێگای خوێ کردودیتس دۆشەگی بۆڕانەیەخرابوحالی بوئەگەربۆچی دۆشەگیان بۆڕانەخستوەبەلام خۆێ نەهێنا سەرئەوحالەی،وگوتی ئۆخەیش ئەوشوتێردەنوم،ئەودۆشەگەزەلامەولەکوڵ کردمەوە. خۆ،وەك مەرە لەغەرەی نەمدەتوانی بسوڕێم،دەباهەتاڕۆژ لەسەرتەنیشتێکی بنوم، ساحیب ماڵ لەبەرەخۆیەوەدەلێ بەخوای بابەزەریفە!ئەمەدوشەگن بۆڕانەیەخستوە، جوابن کردوەولەخۆی حالی بی وبڕوا،ئەوبەچاکەی دەزانی،سبحەی شەوێ،بەخێزانی گوت، ئەوشولبادیشی بۆ ڕامەیەخە،وەختی نوستنێ،میوان ئەگەردیتی لباد ڕانەیەخراوە، وەکوشەوی پێشو،ئەوجارکێچی کردنەبێانو،گوتی ئۆخەیش!کانگای کێچانولەکوڵ کردمەوە،ئەوشۆ تێر دەنوم ؟

کابرا بەژنەکەی گوت سبەی شەوێ بەڕەشی بۆڕامەیەخە باهەرحەسیربێ،

وەسبحەیشەوێ وەختی نوستنێ، ئەگەر دیتی هەر حەسیر ڕایەخراوەو چیدی لێ نیە، میوان گوتی ئۆخەی ئەوە هاتمەوە سەرقاعیدەی ماڵەخۆمان،چونکە ئەمەش لە حەسیری ڕوت زیاتر نیمانە. ئەوشو تێردەنوم، سبحەیشەوێ گوتی هیچ ڕامەیەخەو چیشی پێدامەدە.بابڕوالەکۆڵمان بێتەوەپێاو،خۆبوتەچەل ومل،

میوان شەوێ ئەگەردیتی هیچ ڕانەیەخراوەوهیچیشیان بۆنەهیناوەبەخۆی‌دادات،گوتی ئۆخەیش عەرزی خودای چەندبێ منەتی.چی کەس ڕانایەخم وچی کەسیش بەخۆ دانادەم،ئەوشوتێردەنوم بەناعیلاجی کۆنەحەسیریکیان بۆڕاخست وکەچەلێفەیێکی پڕلە ئەسپێشیان بۆهیناوپێیان دادا،بەیانی لەسەرنان وچای، ژن ومێرد هەربیانویان ئەوەبو لەخۆڕابەشەڕهاتن.ژنەڕوی دەمیوانی کرد:ئەری میوان! ئەتۆ ئەونانەی دەیخوێ و دەڕوێ حەق بەمنەیابەوپیاوەیە؟میوان پاروی دەکردن زۆرهێدی ولامی‌داوە:بەئەونانەی لەپێشمە ودەیخۆم حەق بەتۆیەبەلام من ناڕۆم بەئەوسەرمابیەی ئەگەربەهاریش هەوای خۆش بوو دەڕۆم!کابرابەخوی وبەژنێ گوییان لەقسەکانی بوگوتیان نەخێربەتەمای ڕۆئینێ نیەمیوان ناڕوا،ئەمەدەڕوین.مالیان بەجێ هێشت ولێیانداڕویشتن،میوانیش لاقی دەتەندورێ کێشان ولێی‌دانیشت.لەماڵەجیرانی‌ڕامندالێکیان دەناردەتابزانن،میوان هەرلەوییەیان ڕۆیشتوە؟ میوان چاوی بەمندالەکەی کەوت،زانی ئەوهات وچوێەلەبەرەویە.لەسەرەخۆچۆلەپشت کەندوی خوێ لێشاردنەوەوگوتی جارێ بالێرەخۆمات کەم بزانم چیە.منداڵەکە،دیسان هات سەری دەژوری نا،ئەگەر کەسی نەدیت،بەغار گەڕاوەبۆلای کابرای وژنەی، زۆری پێ‌نەچوکابرابەخوێ وبەژنێ هاتنەوەماڵێ، ڕوانیان کەسیان نەدیت، گوتیان ئۆخەیش شوکر ڕۆیشتوە، لەکوڵمان بوتەوە!

کابرابەژنەی گوت ڕۆژی لەئەوڕۆخۆشترن نابی،بابیکەینەجێژنە!بێنەهەلوایەکی لێنێ؛

بێجگە لەوەی میوان هەرمانعیش بو.بۆهەمو شتێکی وشەوکاری ژنەلەشایان هەرلاقی وەعەرزێ نەدەکەوت زوێکی هەلوای لێناوکابرابە ژنەی گوت هەلوای لەپشت کەندوی دانی باکەمێك ساردبێتەوە، ئەمەش بەرگی دەبەرکەین، ئەمن بەپێشەتودادیم ودەچم دەلەم ئەمن وەك کێ دەچم،جائەتۆش چۆنت پێ‌چاکەوابلێ. ئەوجارئەتۆ بەرگی دەبەرکە، بەپیشە منداوەرەو،لێم‌بپرسەبلی ئەمن وەکو کێ دەچم؟! جا ئەمن دەزانم بلێم وەکو کێ دەچی ژنەبەتالێ تالۆکەنەگەبیەپشتەوەوهەلوای لەکن کەندوی دانا؟!

بەلێ :کابرا بەرگێکی هەرەجوانی دەبەرکردو بەپیش ژنەکەی‌داهات وچوو،بەژنەکەی

گوت ئەمن وەك کێ دەچم؟ژنە گوتی ئەتووەك خانی لای بانەی دەچی!

ئەوجار ژنەبەرگی دەبەر کردوبەجوانی،خوێ ڕازاندەوەو،بەپێش مێردەکەیدا بەناز هات وڕابردو گوتی ئەمن وەکو کێ دەچم؟

کابرا؟بەپێکەنینەوە گوتی بەخۆای ئەتۆوەکو ئەسمەرێ کابایزان دەچی!

هەردوك بەقسەکەی خۆیان ولەشایەهەڵوای ڕوێنێ میوانی کەوەکوجلوکەی خۆی داسەپاندبو.تێرتێر پێکەنین.پیکەنینیان خەلاس نەببو،میوان لەپشت کەندوی هەڵوایەکەی خەلاس کردبو،تاوەێ بەبەتاڵی لەسەرسەری داناوهات لەپێش هەردوکان ڕاوەستاو دەستی دەبەر کەلەکەی ناو گوتی، ئەدی ئەمن وەك کێ دەچم جوانم لێ بڕوانن؟!

ژن ومێرد.کەچاویان بەکابرای کەوت،لەپێکەنین کەوتن وبەئەوجورەی هەردوکیان وەك عەبەسانێعەبەسان!چونکەئەوهەڵلاّ وبەزم و ڕەزمەوجێژنەوهەڵوابوڕویشتنی میوانی سازکرابو. دەئەودەمەش دا، میوان بەئەوتەرحەی هات ولەپێشیان ڕاوەستا،کابراهەروابە سەرسوڕمانەوەگوتی ئەتۆ وەك میوانەبێشەرمەکەی مەدەچی! ئەتۆ وەك ئەو کەسەی دەچی ماڵە مەت خەراکرد چۆن وەکێ دەچی. دیمەنی ئاخیرکاتی میوانیم پێ لەئەو هەڵوایەی شیرن تربوکە ساحیب ماڵ و ژنەکەی، دەزاریان نەنا!



## میوان و هەڵوا(شێعرەکەی)

قسەی قەدیمەو لە دێیەکی دور — میوانی هاتن پیاوێکی مەشهور

چەند شەوو ڕۆژان لە وێ مانەوە — هەر فکریان نەبو بۆ ڕۆییشتنەوە

خاڵۆ تۆش سەرێك لە مە هەڵێنی — زۆر خۆشحاڵ دەبین، پێی دان بەلێنی

ڕۆژێك لەماڵێك چووەژورکەوت — بە بێدەنگ و باس، چەند شەو لێیخەوت

ماڵێك چەندی بلەی وا پاك و خاوێن — بە ڕە و لبادی نوی،جا دۆشەگ و نوێن

خۆمیوان ناڕوا،خانەخوێ زانی — کەوتنە تەگبیران، خوێ و خێزانی

بوێ ڕامەیەیخە، دۆشەگی توك قو — تێدەگا و دەڕوا،هەر بەیانی زو

وەختی نوستن هات کە دیتی لبادە     تێغزا بێدەعیە و زۆر بێ ئیفادە
خەوم خۆشدەبی با بنوم بە پەلە     لەکوڵم بووە دۆشەگە خەپلە
هەر نەدەسوڕام وەك مەڕی لەغەر     لە سەر تەنیشتێك نوستبام یەکسەر
پێی وابو دەڵێ جواب کرام بڕۆم     نەك بڵێ جێگا، خۆشترکرا بۆم
بە ژنەی گوت ئەوشو ڕامەخە لبادی     میوان، بەڕەی دی بە کەیف و شادی
کانگای کێچانو، لەکوڵ کردمەوە     دەردی شەوی دیو لەبیر بردمەوە
گوتی حافرەتێ، با هەر حەسیربێ     چیدی ڕامەخە زۆریش دلگیر بێ
وەختی شەو میوان زانی حەسیرە     ئەوە بەڕاستی ماڵی فەقیرە
ئەوە قاعیدەی ماڵی خۆمانە     لە حەسیری ڕوت زیاتر نیمانە
ئەوجار هاتمەوە سەر دەقی پێشوم     لێمگەڕێن ئەوشو تێرتێر با بنوم
بە ژنەی گوت ئەرێ قەت کەس نەماوێ     هیچ ڕامەیخە و لێفەشی ناوێ
کاتی ماڵ نوستنان دیتی عەرزی ڕوت     دانیشت بە ئیشتیا و غیرەتیشی بزوت
ئەوشۆ تێر دەنوم بەو توو تەرزە     عاسمانە لێفەم ڕایەخیش عەرزە
چی کەس ڕاناخەم، بە خۆشدانادەم     عەرزێ خودایە و،خۆم نەسلی ئادەم
ژن و مێرد، سبەی، وەختی چێشتانێ     نان و چا دەخورا لەنێوکۆڵانێ
هەر لە خۆڕایی بێبەلگە و نامە     کردیانە کێشە و شەڕو هەنگامە
ویستیان لەوڕێیەی،ئەوفێڵەی لێبکەن     بیکەن بە مەلا و دوایەش دەریبکەن
میوان! تو ونانەی لە پێشتە دەیخۆی     نان وچای دەخوی هەڵدەستی دەڕۆی
کامەمان حەقین لە من و لەوپیاوە     میوان زۆر هێدی ولامی داوە
بەو نانەی ئەوە لە پێشمە دەیخۆم     حەق بە دەست تۆیە بەلام من ناڕۆم
میوانمان ناڕوا،بۆخۆمان با بڕۆین     دەبێ بڵەێن ئیمەین خۆمیوانی تۆین

هەردوکیان ڕۆیین، لە ماڵ چونەدەر          کوڕی جیرانیان دەنارد بۆ خەبەر
چەندجاری سەردا و دەچوۆە لای وان          لە قون تەندوری، دانیشتبو میوان
لەبەر منە هێندە، هاتن و ناردنەوە          لە پشتی کەندوی ، خۆی لێشاردنەوە
کوڕە دیسان هات بۆ سێ همینجار          هیچکەسی نەدی، چۆوە هەر بەغار
ماڵ چۆڵ و هۆڵە، کەسی لێنەبو          هاتنەوە ماڵێ، گورجێکی هەردو
ئۆخەی ڕۆیشتوە، لەکوڵبۆتەوە          بۆ ویرانبۆەکەی خۆیان چۆتەوە
بە ژنەی گوت دنیا،هێندەی ناهێ نێ          بیکەینە جێژنە و هەڵوایێ لێنێ
باساردبێتەوداێنێ پاش کەندو          بەرگی دەبەرکەین خۆبنوێنین هەردو
هەڵوای کەوتەدەست،بەبێ ڕێ پێوان          هێند چەوروشێرن دەخۆرابەلێوان
کابرا بەرگێکی جوانی دەبەرکرد          بە پێش ژنەیدا بە قەدەم ڕابرد
وەکو کێ دەچم دا لێمبڕوانە          :وەك بەگزادەکە و خانی لای بانە
نۆرەی ژنەی هات، خۆی ڕازاندەوە          پرپرە و بازنەی بۆ لەرزاندەوە
ئەرێ کەس هەیە وەکومن جوان بێ؟!          ڕێك و لەبار وا خانمان بێ؟!
کابراش زۆر بە دڵ لە ژنەکەی ڕوانی          :وەکو ئەسمەرێ کابایزان جوانی
تاکو ژن و مێرد، جوان خۆیان ڕانا          هەڵوای خوارد؛تاوەی لەسەرسەردانا
خۆ بە نۆرەشبێ ئەوجار نۆرەمە          من وەك کێم لە نێو هۆزو تۆرەمە
هەردو تێیفکرین، واقیان ورمابو          خۆ ئەو بەلایە هەر لێرەمابو
:وەکو میوانە بێشەرمەکەی مەی          ماڵ و جێگامان بۆ پێ چۆڵدەکەی
هێندە هاتم و چوم، خۆکاڵەم دڕا          هەڵوا، نە چەوری هێچم پێنەبڕا

❋ ❋ ❋

**کوڕو باب**

کوڕو باب لە ماڵێ دانیشتبون ؟بابزانین ئەوکوڕوبابە باس وخواسیان چیە ؟ بابەکە؟چەدەڵێ وکوڕەکەی؟ چە وڵامێکی دەداتەوە،

بابەکە هەرایکردوگوتی ڕۆڵە !

کوڕەکە گوتی نەێ! بابەکە :خۆ چ کارم پێت نیە کوڕە دەڵێ جا خۆ کاریشت پێمبی بەقسەتناکەم .

بابەکە :حەك ڕەببی ڕۆڵە نەگەیەی

کوڕە : بۆ ناگەمێ بابە ! بەیانی زو بڕۆم هەر جێگایەکی بم هەوێ دەگەمێ، ئەگەر نوێژیش دەلاکەوت وەڕێ ناکەوم خۆشێت. نەبومە.

بابەکە گوتی نانمان نەماوە، بچۆ ئاشی ئەو باراشەی لێکەوبی هێنەوە

کوڕە دەڵێ کڵاوم دەگەڵ کەپولەی ئاشی حەیارەیە ! بی هێنمەوە دەیپێومەوە دەنکێکی کەم بێ ؟ ئاشەوانی بەگۆڕی بابی دادەڕێنم.

بابەکەگوتی ڕەببی عومرت درێژنەبی ڕۆڵە .،

کوڕەکە دەڵێ. بابە ئەگەر عومرم درێژبی بە قسەی تۆ قوڵە نابێ، ئەگەر قوڵەش بێ بە قسەی تۆ درێژ نابێ

بابەکەگوتی دە هەستە بچۆ دەرێ بزانە هەوای چۆنە دەبارێ. سەگێکیان هەبو نێوی بەڵەك ،بەڵەك بو. هەر هەستاپێ ویەك بەخوێ هەرایکرد:بەڵەك !بەڵەك! بەڵەك .

بابەکەگوتی بەڵەك، بەڵەکت ،بۆ چێە ؟

کوڕەکەدەڵێ بابێتەژورێ،ئەگەرتەڕبێ ئەوەدەبارێ،ئەگەرئیشکیش بێ دیارە نابارێ

بابەکەگوتی یاڕەبی ڕۆڵە خودا لە منت بستێنی ؟

کورەکەش دەڵێ فکرێ مەکەبابە، خودا،یان ئەمن لەتۆدەستێنی یان ئەتۆلەمن دەستێنێ.

بابەکە گوتی هەستە بڕۆ دەرکەی پێوەدە سەرمامە،

کوڕەکە دەڵێ هەموم پێك هێنان، ئەوجار نۆبەی تۆیە بڕۆ بۆخۆت دەرکەی

پێوەدە،

بابی هەستاندبەلەقەلەق و دەرکی پێ پێوەدا. ئەگەر کوڕ هاتە بێئەمرێ بابی ئاوایە ((هیوادارم ئەوەبەبێتە پەندوکوڕەکان عیبرەتی لێ وەربگرن باب بۆبێ ئیحتیرامێ نابی یابەڵکوهەروایان دا نابی ودەناوانەبێ بەهەرحالّ))!!!

## شێعری کوڕو بابی

دانیشتبون لە ماڵ کوڕ لەگەڵ باوە
وەك چاوەڕوانی لێدەکرێ و باوە

باب گوتی ڕۆڵە، کوڕ گوتی نەخێر
:هیچ کارم پێتنیە دەزانم، نەخێر

کارت لە لای من نابێ جێبەجێ
حەك ڕەببی ڕۆڵە قەت نەگەییە جێ

هەرکوێ بم هەوێ بەیانی زو بڕۆم
دە ی گەمەیێ وخۆمن پاش نوێژی ناڕۆم

پیی‌گوت دە هەستە بڕۆ بۆ ئاشی
نانمان نەماوە، لێکە باراشی

کەپولەی ئاشیە و کلام ڕیەن
هەردوکیان وەکێك خۆ گەنمی دەبەن

دەنکێکی کەمبێ من دەپێومەوە
لە ئاشەوان شەش دەستێنمەوە

حەمە درێژ نەبی، یارەببی ڕۆڵە
پێویست نیە چی‌دی ئەو بۆڵەبۆڵە

عومرم درێژبێ بە تۆ کورت ناکرێ
ئەجەل بێتە ڕێم بە کەس چ ناکرێ

دەبزانە هەوای چۆنە؟ دەباری؟
بانگی چوارپێ کەی کرد پڕ بە زاری

بەڵەكبەڵەکی بۆ چی قاودەکەی
بەردەرك و ژورمان لێ گلاو دەکەی

با بێتە ژورێ، فێڵی جارانە
ئیشك بێ،خۆشە، تەڕبێ بارانە

یارەببی خودا،لە منت بستێنێ
یان ئەمن، یان تو، لێکمان دەستێنێ

هەستە پێوەدە،دەرگا،سەرمامە
ئەمنیش پێت،بڵێم ئاخیرکەلامە

هەموم پێك هینا ئەوجار تۆ هەستە
نۆرەی تۆیە بڕۆ، دەرگای ببەستە



**مام ڕەمەزان**

**لە دێیەکی سەروە لێرەواری، ڕێگایەکی گەوەگەوە وناخۆش، نیزێك کوێستانەکانی چۆلی کوردستانەکەی خۆمان، وسوو بەخۆی و فاتیّ ژنی، لەئەوئاواییەدەپازدەماڵیەیدا دەژیان. مانگایەك و دو سێ سەریان حەیوان هەبو، باش بون، بەشی خۆیان دمەدۆیکیان هەبو.نەمەرنەژی پیّ برێ دەچون ،وسوڕۆژێکی دەلّیّ ئەرێ فاتیّ ئەودوکوپە ڕۆنەی هەمانە،یەکیان بەدەست کە بۆبەرخواردێ و ئەوی دیش دانێبۆڕەمەزانانێ .،**

**بەلّێ؛ فات ژنێکی فەقیرو چنەزان وبێ فێلّ بوە، کوپێکی بە دەستەوەکرد، خواردیان. ڕۆژێکی وسو چۆبۆ سەفەرێ. پیاوێکی ڕدێن ماش و برینجی هاتە نێو دێی. سلاوی کردو سلاویان لیّ وەرگرتەوە. هەرکەس دەهات هەر دەیگوت: مام ڕەمەزان ماندو نەبی؛ مام ڕەمەزان بەخێر بێی. فاتیّ فەقیریش ئەگەر گوێی لەئەو هەمو مام ڕەمەزان مام ڕەمەزانەی بو؟ڕەمەزانەکەی دیکەی لەبیرچۆوەو، دە دلّی خۆیدا گوتی بە خوای بیّ و نەبیّ ئەوە ئەو ڕەمەزانەی ڕۆنمان بۆهەلگرتووە، هەوە.با بچم بانگی کەم. ڕۆنەکەی خۆی بەرێتەوە.فات چولەپشتەوەڕا دەستی مام ڕەمەزانی ماچ کرد. پاش چاك وچۆنی، گوتی مام ڕەمەزان ئەگەرکارەکانت خەلاس بو،زەحمەت نەبیّ هەتاماڵەمەوەرە.مام ڕەمەزان پاش تەواوبونی کارەکانی کارێکی واشی نەبوچۆماڵەکابرای. فات گوتی مام ڕەمەزان بەخوای لەمێژەوسوکوپێکی ڕۆن بۆهەلگرتوی،جائێستاکەهاتویەتەئێرە،دەگەلەخۆتی بەرەوە،مام ڕەمەزان: زۆری فکر کردەوەنەکەسی پیّ قەرزداربونەپولّی ڕۆنیشی دابو، بەکەس دەلّیّ دەی باشە؛کوپەڕۆنی لێوەرگرت ئەوجارخۆی بەجورێ کی دی حیساب کردو گوتی خوا بەزیادی کات،ڕزق و ڕۆزی وزیاد بیّ. ڕۆنی وەرگرت وڕۆییشتەوە. ئاخرەکەی زانی ئەوە وا هەرنیە ؟وسوی فەقیریش ئەوە ئاگای لە هیچ نیەوفات هەرباسیشی نەکرد.**

**بەلّێ مانگی ڕەمەزانێ هات.شەوی ئەووەلّ هیچنەبو.شەوی دوهەم هیچ نەبو.شەوی سێهەم لێی پرسی: ئەرێ ئەوە بۆ چ لیّ نانێی فاتیّ؟! ئاخر لەکنە خۆو.بەڕۆژوینەو. وئەوە ڕەمەزانە،**

فات جابەچی لێ نێم ،چۆن بەچی لێنێم..ئاخر بەچی لێنێم وسو:بەڕۆنی لێنێ ، فات :خۆڕۆنمان نیە ؟!وسو: ئەی ئەی جاچۆن ڕۆنمان نیە ؟!: ڕۆنی چی؟ئاخرنەمگوت کوپێکی بۆبەرخواردێ وئەوی دیش هەلگرەبۆڕەمەزانێ؟فات گوتی حا ! !وەڵلاڕۆنەم دابەمام ڕەمەزانی. وسو:مام رمەزان، ورد لێی پرسی. فات بۆی گێراوەکەچۆنی ڕۆن داوەتە مام ڕەمەزانی. وسو سەبری کرد هەتا ڕەمەزان خەڵاس بو. سوێندی خواردوگوتی دەڕۆم هەتا توشی ژنێکی لە ژنەکەی خۆم نەزان وگێلتر نەبم، ناگەڕێمەوە،ئەمن بڵەم ڕۆنی بۆڕمەزانێ هەلگرەبچی ڕۆنی بدەیەکابرایەکی کەس نازانی چەکارەیە وکێیە، کەوتەڕێ ڕۆییشت هەتالە سێ چواردێیان تێپەڕی هەتانەیناسنەوەچونکەبەتەمای شتێکی بو .دوایەگەییشتەدێیەکی. لە دەرکیماڵێکی دانیشت. زۆرماندوبو. ژنێك لەماڵەکەی وەدەر کەوت هەروەك شێتان.هات وگوتی ئەرێ کاکە مریشکان ناکڕی؟ دەگەڵ قسەکردنێ، وسو زو زانی ئەوە لەژنەکەی خۆی گێلترە گوتی بەڵێ مریشکان دەکرم. ژنە بە بێ قیمەت برینەوەو پولی هەیەیانیەتی و، دەستی کردبەمریشك گرتنێ. هەر گرتنی ولاقی بەستن. مریشکێك مابو. زۆری ڕێکەوت، بۆی نەدەگیرا. مریشکەکە،بەتەنێ مابۆوەوچۆدە کۆخی. ژنە ؟سەری دەکۆخی‌نامریشکێ بگری،وسوش لەبنەوەڕابەحەسرەت هەرتێی دەفکری و؟! بەڵێ، ؟ئەومریشکێشی گرت و؟ هەموی لەوێ دانان.جائەوجاروسودەڵێ خۆپولیشم پێ‌نیە ؟ ژنە: ئەدی چۆن دەبێ.وسو: جاچۆن دەبی، ئەوکەڵەبابەی من لێرە ببەستەوە هەتا دەچم پولی دێنم.جائەودەمی کەڵەبابەکەشم دەگەڵ خۆم دەبەمەوە. ژنەبەبێ ئەوەی کابرای بناسی یاچی. : زۆر چاکە. وسو مریشکی دەستدانێ و تۆڵەی دوتوڵە مام ڕەمەزانی لە ژنی ڕەشۆی کردەوە.

تۆڵەی کوپەڕۆن ومام ڕەمەزانی کردێوەوبێ وەی هیچ کەسێ بزانی<br>
مریشکی هەمولاق بەستن وهێنای تابیان خوابەخۆگێلەی خێزانی

بەڵێ کابراڕۆیشت ژنەهەتا ئێوارێ هەرچاوەڕوان بوپولی مریشکانی بۆبێنی کەچی چاوەڕوانیەکەی هەدەر بوئاخر وسووخۆبەتەمای هاتنەوەی نەبوجابابزانین ڕەشۆئەگەر

لەدروێنەی هاتەوەچە دەڵێ وچە دەکا، وەختێکی ڕەشۆ لەدروێنەی هاتەوە مـاندومردودیتی کەڵــەباب لەلایــەکی ماڵـــێ بەســـتراوەتەوە. لەژنەکــەی دەپرســـی: ئەوکەڵـــەبابەت بۆبەستوّتەوە بەئەونوێژی شێوان بەریدە یان دەکوّخی کە؟

ژنەدەڵێ مریشکەکانم هەموفرۆشتن.کاک ڕەشۆ: وەڵڵا باشە، بە کێ؟

:کابرام نەناسی.:

ئەدی ئەو کەڵـەبابەی بۆنەبردوە.

ژنـە:پوڵـی پێـنـەبو، چـووە پوڵـی بێنـێ، ئەگـەر پوڵــەکەی مێنـــا، جــا کەڵــەبابەکەشی دەباتەوە،نازانم بۆهەرنەهاتەوە.

ڕەشۆش زۆر لـەسەرەخۆ دەڵـێ: وەڵڵا لە ... نێی بردوی تازەدیتەوە. ژنەش لـە ڕەشـۆی هێدیتر دەڵـێ بەخوای بەخۆم نەبو ڕەشـۆگیان سـەرم دەکـۆخی دابوچـم پـێ نـەدەکرا. ڕەشۆکەئەوەشی گوێ لـێ بو،گوتی زۆر باشە.دوڕۆژم دروێنەماوەلـەودروێنەی خەلاس بم، دەڕۆم یادەپسێم یان دەبی توشنی ژنێکی لەژنەکەی خۆم گێلتر بم دەنا ناگەڕێمەوە.

بەڵـێ لەدروێنەی خەلاس بـو. بـەیانی زو، کاڵـەوگۆرێی لێ هەڵکێشـاو وەڕێ کـەوت. زۆرڕۆییشت، هیـلاك ببووڕێگاکەشـی چـول بوسـێ چوارگـەوەی دیکـەی بڕیـن ولـەدورەوە قـەلاچێك وەدەرکـەوت. ڕوی دەقەلاییچەکـەی کـردو. ئەگـەر گەیشـتێ دیـتی لــەبەر قەلایەکەی کانی و حەوزێکی زۆر خۆش وئاوێکی ساردی لـێ بو.

| | |
|---|---|
| گەیشتەکانی وحــەوزی کی زۆرخۆش | مانــدوێتی ڕێگای زوکردفـــەرا مۆش |
| بـەلام فـایدەی چی نەحــەسایـــەوە | بێ حـارپێك هێنەرهـات بــەلایــەوە |

لەسەر حەوزەکەی دانیشت دەسـت و چـاو.ولاقـی شـتن وبڕێکـی ئـاوخواردەوە. زۆر ماندوبوو لەوەزعی ژنەکەشی زۆرناڕەحەت بو.لـەناکاو عافرەتێك بەغار هات بـەربینگی بـە ڕەشۆی غەریب گرت : ئەرێ کاکە لە کوێڕا هاتوی؟ ڕەشۆش لە حاڵـی خـۆی وەڕەز بـو :بڕۆ دایکم چـت لـە مـن داوە بـڕۆ وەدوی کـاری خـۆت کـەوە. نـەخێر؛ ... دەسـتی لـێ نەدەکێشاوە، کاکـە گیـان لــەکوێڕا هـاتوی. ڕەشـۆش بۆوئـەوەی لەکۆڵـەخۆی کاتـەوەو

زۆرجار بەقەڵسی شتی وا قسێکی وا بۆلەکۆڵ کردنەوەی دەگوترێ ودەڵێ لە جەهەننەمی ڕا هاتوم. دەگەڵ ڕەشۆئەوەی گوت، ئەوە قەرەواشی ژنی پاشای بو. بەغار هەڵات بۆکن خانمێ ودەڵێ خانم کابرایەك لەسەر حەوزی دەرکی سەرایە دانیشتوەو دەڵێ، لەجەهەننەمێڕا هاتوم. خانم نێوی بزورگ خانم دەبێ، هەر قیت دەبێتەوەو دەڵی دا کەوشانم بۆدانی بابزانم چ ئاگای لەبابم نیە.

هێندەی پێ نەچو،بزورگ خانم لەگەڵ قەرەواشێ گەییشتە سەر حەوزێ و ماندونەبون وبەخێرهاتنی کردو. ڕەشۆ زوزانی گەییشتێ بەڵام دە دڵی خۆی دا دەڵێ لەبیرم نەچی. چونکەبەئەوەوعافرەتەم گوتبو لەجەهەننەمێ ڕا هاتوم.هاتنی ئەوخانمەی بەخۆڕای نیەخوایەبەتەمای تۆ ،هەتاهاتنی ئەوانەبرێکیش حەساوەو هاتەوە سەرەخۆ. ئەوجار خانم زۆر هێدی لێیپرسی: براگیان ئەوە لەکوێڕا هاتوی؟وا ماندووهیلاکی ؟ ڕەشۆ بەتوندی دەڵێ خانم لەجەهەننەمێڕا هاتوم بزورگ خانم برێکی لێ دەچێتەپێشی و دەڵێ ئەدی ئەوەچ ئاگات لەبابم نیە ؟

ڕەشۆش بەنیشان دانی ماندویتی زیاتریش خۆی لەبەرێك دەکێشێتەوەباوێشکێکی دێنێتەخۆی ودەڵێ چۆن ئاگام لە بابت نیە،ماڵە بابەکەی بابت خەرابێ ئەوە حەوتویەکە دەرێگایەدام.نەنانم خواردوە تەنانەت ئاویشم نەخواردۆتەوە. بابتیان لە جەهەنەمێ هەڵاوەسیوە، ئەوە بە داران لێ دەدەن بۆ سەد تمەنی. نیشانەی ئێرەی پێ گوتبوم. ئەوەدەحەسامەوە،جادەهاتم پێم دەگوتی.چاك بو.بۆخۆت هاتی پسساوم دەگەڵ گەرانێ. بزورگ خانم دەستی کرد بە فینکەفینکێ.برێك گریا وبەگریان چۆوە ماڵێ و زوێکی سەد تمەنی هێناوەڕەشۆی دا.دەڵێ دەئاخروەرەبچینەماڵێ نانێك، ئاوێك.

ڕەشۆ:خانم! ئەمن دەڵێم ئەوە حەوتوێکە،لەتاوبابت نانم بەئەوکیدانەچۆتە خوارێ. گوتی هەتا کەس نەیزانیوە فێڵەکەم لێ پوچەڵ نەبۆتەە،بازوێکی هەڵێم.

بزورگ خانم هێندەی دیش گریا.ڕەشۆ پولی وەرگرت و کەوتەڕێ زوزوئاوڕی دەداوە دوایە. دەیزانی پاشا بێتەوەبەقابەئەو درۆییەی ناکاو وەدوام دەکەوێ. زۆری پێ نەچو

پاشالەڕاوێ هاتەوە.ڕۆژەکانی دی، پاشا کەدەهاتەوە بزورگ خانم،تفەنگی لێ وەردەگرت وجڵەوی ئەسپی ڕادەگرت و..ئەوێ ڕۆژێ خۆی دەپاشای نەگەیاندوهەرنەچۆ دەرێش، پاشالەکاری خانمێ عەجایب ما؟ بۆنەهاتۆتەدەرێ کەچۆو ژورێ،خانم دەگریا. پاشا دەڵێ ئەوەچیە؟ چ بوە،بۆدەگریی.؟

بزورگ خانم دەستی پێ کرد: ئەتۆ ئەمەت هەرلەکن سوکە،خۆدەمە ناگەیێنی.هیچ ئاگات لەکەس وکاری من نیەوچی وچی پاشا:باشەئاخرچ بوە؟ خانم دەڵێ چۆن چ بوە؟ بابمیان لەجەهەننەمێ بۆ سەد تمەنی هەڵاوەسیوە،لەوێرا پیاوی ناردبو.

پاشا: جا ناکا بۆت نەناردبێ؟!خانم: بەڵێ بۆم نارد.پاشا:چاکت کردوە.

پاشا زانی ئەوە حیللەیە، بەلام نەیدەزانی حیللە لەویش دەکرێ. پاشا وەدەرکەوت. پرسیاری کرد: ئەو کابرایە بەکوێدا ڕۆییشتوە؟ ڕێگاکەیان نیشان دا پاشا سواربوو وەدوای کەوت.ڕەشۆئاوڕی داوە تۆزە باریکەیێکی لە ڕێگای پێدا هاتبو دیت، زانی پاشایەو وەدوایکەوتوە کەوتەفکران چەبکەم چۆن خۆم نەجات دەم.ئاخردەشتێکی چۆل وهیچ حاشارگەییکی لێ دیارنەبوتەنیا ئاشێك لەوێ دیاربو خێراچۆدەرکێ ئاشی وبانگی ئاشەوانی کرد،هێنایەدەرێ.وگوتی ئەرێ مام ئاشەوان ئەوتەپ وتۆزەت دیوە؟ ئاشەوان چاوێکی لێ کردو:بەڵێ.گوتی ئەوەپاشایە.زۆرچاکەپاشایەبەخێرێ!مەنزۆرت چیە؟

ڕەشۆ:پاشایەو تفەنگێشی پێیەو هەرکەسێکی کەری ··بی دەیکوژی . ئاشەوانی غەریب کەوتەفکران وبیرکردنەوەی دەڵێ بەخوای ئەمن بەمنداڵی جاشولێکم ··وە؟

ڕەشۆ:بابم ئەمن سوێندم بۆخواردوەبابەرگەکانمان بگۆڕینەوە.ئەتۆ خۆت بشارەوە. دوبارەئەمن سوێندی بۆدەخوم خۆشم تۆزاوی دەکەم نامناسێتەوە.پاشاباڕواو دوایەدیسان بەرگەکانمان دەگۆڕینەوە.دەزانم منداڵی وردت هەنەبا بەخۆڕای نەکوژرێی.

ئاشەوانیش دەڵێ ئەرێ بەخوای پینج منداڵی دەوردیلەم هەنەوبەقای پێ دەکاو ڕەوانەبەرگیان گۆڕینەوە.ئاشەوانی ناردە،بەرزلانەی ئاشی.بەختی ڕەشوی بو یان بەختی ئاشەوانی ئەوێ ڕۆژێ چە ئاشێری لێ نەبون ڕەشۆبرێك لەبەرئاردی ڕاوەستا. تاتەواوتۆزی

ئاشی لەسەرو چاوی وهەموگیانی نیشت.پاشا گەییشتە دەرکێ ئاشی وهەرای کرد: ئاشەوان؛ ئاشەوان؟

ڕەشۆ چۆ دەرێ: بەڵێ پاشا. پاشا دەڵێ کابرا یەکی ڕوتەڵە بێرەداهات نەتدیوە؟

ڕەشۆ: بەڵی دیتم پاشا:چی لێ هات. ڕوشۆ: ئەوە دەبەرزەلانەی ئاشیداخۆێ شاردۆتەوەنازانم چی کردوە.

پاشادابەزی گوتی دائەوئەسپ وتفەنگەم بۆبگرە چونکەپاشازۆربەتاڵوکەبو،خەریك بوئەوکابرای فێڵی لەخانمێ کردبوبیگری وتۆڵەی سەت تۆلەی لێ بکاتەوە،ئاشەوانەکەی خۆێ نەناسیوەونەیگوت خوێەوەئاشەوانەکەی من نیە.

ڕەشۆ ئەسپ وتفەنگی لێ وەرگرت وسەت تمەنەکەشی هەربەدەستی وەبو.پاشاچۆ ژورێ ئاشی هەرای کرد: وەرە دەری سەگباب.

ئاشەوانی فەقیردەڵێ پاشابە قوربانت بم بە خوای بە منداڵی تەنیا جارێکی جاشولێکم ..وە.پاشائەگەرئەوەی گوێ لێ بوبەخۆی گوت بەخوای ئەسپ وتفەنگەکەشم چون. هەر هاتەوەدەرێ دیتی ئەوە ڕەشۆسواری ئەسپی بوەوتفەنگەکەشی بەدەستەوەیەو، دورڕاوەستاوە،ڕوی دەپاشای کرد گوتی پاشا ئەگەرخەزۆرت بێتەوەدەبی سواربی وتفەنگیشی پێبی دەنا بۆ شانی تۆ کەسرە.

پاشاش لەوەی بەدەرچارەی دیکەی نەبودەڵێ جائەگەروایە؛ئەوەشت فیشەکدان. فیشەکدانی بۆ هاویشت. ڕەشۆبەئەسپ و تفنگ وسەت تمنەوە گەڕاوە ماڵە خۆی تۆڵەی وسوی لە پاشای وخانمێ کردەوە. پاشاش بە پێیان هێدی هێدی چۆوە ماڵێ و بە خانمێی کوت خوێەتۆفکرت نەدەکرد.ئەوە تا ئەمن ئەسپ و تفەنگیشم بۆ بابت ناردن ئەتوش هەر لێم نارەحەت و ناڕازی.



**مەکری ژنان**

هەر پێیان دەگوت مەلا وەسیم، دەنا فەقێ بو زۆریشی نەخوێندبو، بەڵام زۆر لە نێو فەقێیان مابۆوە؟.

ڕۆژێکی کاغەز و قەڵەمی دەست دایە، لـێیان پرسی: مەلا وەسیم ئەوە چ دەکەی؟

مەلا وەسیم دەڵێ بەقورئانێ لێم خوێندوە لـەئەوڕۆبەدواوە هیچ ناکەم تەنیا مـەکری ژنان دەنوسم. دو سێ فەقێ لە دۆستەکانی خۆی پێیێ دەڵێن بەخوای ڕەنگ بـێ هێندیـان فریو دابێ (عادەتی جحێڵی هەروابوە) جـا ئێسـتا چـت پـێ نـەماوە دەڵێـی مـەکری ژنـان دەنوسم، وەدوای ئەو کارەی مەکەوە، زەرەرێ دەکەی،

بەڵێ بە قسەی دۆستەکانی نەکردن وجابابزانین کتیبی مەکریژنان چۆن دەنوسێ ؟

چۆدێیەکی و لەماڵێکی وەژورکەوت تەنیا ژنێك لـە ماڵـێ بـو،سـڵاوی کـردو ژنـەوڵامی سڵاوی داوەو زۆری بەخێرهاتن کردو.دوایەلـێیپرسی:مام ۆسـتائەوەبۆجوحمانەی هـاتوی بەتـەنێ کوائەڕۆجوحمەیـە ؟مـەلادەڵێ نەخێربەهشـتی ، هـاتوم مـەکری ژنـان دەنوسـم خانەخوێ:حەك ڕەببی بەخێربیێ،وەڵڵاهی ئـەمن دەستەخوشـکێکم هەیەئەوەندەمـەکری ژنـان دەزانـێ هەرپێشـت نانوسـرێتەوە ئەگـەر قـەولم پـێ بدەی بـەنێوی منیـان بنوسـی پـاش‌نوێژێ بـۆت بـانگ دەکـەم هـەموان بنوسـەوەئەویش هەربەقسـەی مـن دەکـا.ئیـدی بەئەوقەولـەی بێ لەکتێبەکەت بنوسی (خوازێ ئەشکبار) پێی گوتومە.

مەلاوەسیم ئەو قسەی پێخۆش‌بوو دەڵـێ هەرلێرەکتێبەکـەم تـەواودەبێ، دەڵـێ بـە چاوان، ئەوە قەولم پێدای، هەرلەکنەتۆدەنوسم ئەگەرخوشکەخوازێ ئەشکبار پێی گوتوم و نوسیومنەتەوە دەئەوقسانەدابون خوازێ هـەرقیت‌بۆوەو لەئەوبـەری مـاڵان دیـاربوگوتی ئەها، جەلال هاتەوە.مەلاوەسیم :جەلال کێیە ؟ خوازێ:جەلال مێردمە.

: دەی هاتەوە هاتەوەچەبو ؟خوازێ دەڵێ ناباش نیە،لەنێوئەو ژورەیدا ئەتو دەگەڵە من ببینێ بامیوانیش بی. هەرچەندهیچ نیەبەڵام نەبادافکرێکی ناجوان لەمەبکا. مەلا دەڵێ ئـەدی چ بکـەین. یـەغدانێکی زەلامیـان لـەنێوماڵێ بوخـوازێ هـەرزوێکی دەچێت سـەری

یەغدانێ هەڵدەداتەوەو دەڵێ وەرەبچۆو دەنێوئەویەغدانەی، نان وچای دەخواو دەڕوا، دوایە دەتهێنمە دەرێ و گوڵانێشت بۆبانگ دەکەم جامەکرەکان بنوسەوە.
مەلا چارەی نەبو چوّنێویەغدانێ، خوازێ سەری داداوە وزوێکی قفلێکی لە یەغدانی دا. کاک جەلال هاتەوە.وەژورکەوت.: ئەرێ خوازێ! برسیمە ! زونان وچایەکم دەیە کارم هەیە دەڕۆم ئەوەچەندرۆژە ئەومالۆسکەم بۆساغ نابێتەوەپسساوم دەگەڵی بەئەوگەرمایەی.
خوازێوادەکائەرێ جەلال تازە فەقێیەك هاتبو،دەیگوت ئەوەمەکری ژنان دەنوسم .
جەلال: ئەدی کوا؟ چی لێ هات؟
خوازێ دەڵێ ئەوەتا دەئەو یەغدانەم ناوە.
جەلال:داکلیلانم وێدە،کلیلانم وێدە.خوازێش زۆرلەسەرەخۆوهێدی هێدی،کلیلی لەبەرۆکێ دەکردنەوە.جەلال:دەزویەزوو.کلیلی لەبەرۆکێ کردنەوەو.وەجەلالی دا.جەلال غاری‌دا۔ سەریەغدانێ.نەیهێشت جەلال بگاتەسەریغدانێ خوازێ وابەبێ وازی دەڵێ لێم نەبرد یۆە؟ هێندێکیش پێکەنی وجەلال لەحەیفان کلیلی بەعەرزی دادان، نان وچاشی لەماڵەخۆیان نەخوارد وەدەرکەوت.گوتی وەڵلاهی وام زانی بەڕاستیتە.مەلاوەسیم دەنێویەغدانێ دا ئەگەرگویی لەقسەکانی وان بوهەرئەوەندەبودڵی نەتوقی بو،دەنائەوەی دی قەومابوقەیدی نیە،پاش ڕۆینێ جەلالی خوازێ سەری یەغدانێی هەڵداوە، بەڵام لەبەر بۆگەنیوێ کەس نەدەحاواوەهەرچوّنێکی بو.مەلاوەسیمی بەدارەدارەوهەرلاقی نەدەگرت و وەك جاوی سپی هەگەڕابو.لەنێویەغدانێ هێنادەرێ؛دەڵێ وەرەدانیشەنان وچایەکی بخۆۆئەمنیش جادەچم زوێکی گوڵانی دەستەخوشکمت بۆبانگ دەکەم جامەکرەکان بنوسەوە.مەلاوەسیم هەرچەنگێکی لێ هاتبوّوەو گوتی خوشکەخوازێ مەکری توّئەوە بێ ئەگرمەکرانیش نازانی، چۆڵەمەشکێنت لەمێردەکەت بردەوەو ئەومەرەدەشت بەسەرەمن هێنا، دەبێ دەستە خوشکەکەت چۆن بێ ئەومەکران دەزانی ئەدی ئەوجارمێردەکەت بێتەوەژورێ چم لێ دەکەی ودەکوێم دەنێی؟! ئەمن هەر ئەوەندەم بەسە و توّبە.



## سێ ژنی وێکڕا دەوێن

کوڕەش هێندفکری لێ کردبون شەوێ
ئاخرئەمنێکی ئاوا و، تازە لاو
ڕۆڵەگیان ئاخر کوا جا چۆن وایە:
با ژنێکت ئێستا جارێ بۆ بێنم
باشە با جارێ یەك دانەت هەبی
نە فریوت دەدەم، نە دەت خافڵێنم
کوڕەش ڕازی بو، ژنێکی بۆ بێنی
کابراش زانا بو، دەیزانی چ بکا
بە بوکەکەی گوت چاوم بی سەدجار
بێ بلێ؟ ئاو یانان چی بێتەسەر زار
تا کار د ێتەدەر ئەتۆ هەر کێژ بە
بۆ هەردوکانیان ئەو قسە خۆش بو
بە ویستی هەردوان، تا نیوەی بەهار
دیزە ئاوەلا و کتکیش نەوسن بێ
ڕۆژێك چەندی بلێی هێندە گەرما بو
نەیتوانی مێشان لەخۆ بڕەوێنێ
بە خۆی گوت لاوە، وەختیە بیدوێنم
بانگی کرد کاوە ئیمڕۆ بەیانی
ئەو ژنەشت جارێ با بۆ وەگوێزم
پێیدەڵێ بابە چ ژنی دیم ناوێ

بە بابی دەڵێ من سێ ژنم دەوێ
لە هێز و توانا تەواوم.وبەباو
بە خوای من وێکڕا سێ ژنم پێنایە
پاش بەینێکی دی دوی دیت بۆ دێنم
ئیشە، کاری ماڵ تۆش مەعتەل نەبی
دو ژنەکەی دیشت دوایە بۆ دێنم
تا ماڵ و حاڵێك بۆ خوی پێك بێنی
لەو ڕێیەی دەبوفێڵ لەکوڕەکەی بکا
کوڕەکە بێتە ژور،بۆ هەر ئیش و کار
بە بێ مەعتەل بون خۆبخەو بیخە کار
هەرچی لێیویستی هەربۆی درێژ بە
بە تایبەت کاوە خۆی زۆرلەجۆش بو
بۆ کاوەی فەقیر، شەو و ڕۆژ هەر کار
دەبی هەموی بخوا، یان سەروبن بێ
بەر تاوی بەهار هەڵتروشکابو
کش ڕەبی بابو دو ژنو بۆ بێنێ
با ژنێکی دیشی ئێستا بۆ بێنم
کچێکم خواستبو پێم خۆشە بزانی
لە باری ماڵی، بروکێك بێ هێزم
بەسە چیدی خۆم ناخەمە داوێ

ئەخێر! من قەولم وا بە تۆ داوە: | یەکم بۆ هێنای، دو ژنی دیت ماوە
خۆت ڕاگرە جارێ پاش بەینێکی دیش | حەتمەن بۆت دێنم ژنی سێهەمیش
هێند بە بێوازی ئەگە کوتی کاوە! | دەبی بە قسەم بکەی، باشم داناوە
هەر بە هەرد وکمان، مەیکە وەس وەسە | دایکم تەلاق دە ئەو ژنەمان بەسە

❊ ❊ ❊

ئەو شێعرانەی خوارەوە دایکێک بەکوڕەچکۆلەکەی هەلاگوتوە لەئەوکاتەیدا کە تازە دەیویست پێ هەلٚ بگری بۆکۆڕپێکی بێ مراد. ئەمنیش کردومنەتە شێعر:

ئەی خەم ڕەوێنی دەردانم | ڕۆلەم، کوڕپەی ژیر و جوانم
بینایی هەردوک چاوانم | فیدات بێ ڕوحی ڕەوانم

فیدات بێ ڕوحی ڕەوانم

ئەی ئاواتی دنیا و دینم | ئەی ڕۆلەی جوان وڕەنگینم
تێر بەژن و بالات ببینم | شەمامەی سوری بێستانم

شەمامەی سوری بێستانم

ئەی ڕوناکی تاریکاییم | دلبزوێنی خۆشی و شاییم
خۆشەویستی باب و دایم | گلێنەی هەردو چاوانم

گلێنەی هەردوچاوانم

دارەدارەدارە سالیەتی | کورم وەختی ژن و مالیەتی
هیمداد بۆ دایك و خالیەتی | لە جێی گۆڕی مردوکانم

لەجێی گۆڕی مردوکانم

ئەی باخچۆلەی خونچەوگولم | ئارامبەخشی گولەیی دلم
بولبولی سەر لك و چلم | دەرمانی بۆگشت دەردانم

دەرمانی بۆگشت دەردانم

ئەی کۆرپــەی جــوان ومدریکــم        چــرای وێرانــــەی تــــاریکم
لــە شــین و شــادیت، شــەریکم        هیــوای بــۆ دوا ڕۆژی ژیــانم
هــیوای بــۆدواڕوژی ژیـانـم

کــورم دەچێتــە کوێســتانێ        دەکــەن ســەیران و دیلانــێ
دێنــێ حــەواجی کابانــێ        مــەندۆك و بــیزای، کوێســتانم
مـەنـدۆك وبـیـزای کـوێـستـانـم

ئاواتمــە کــورم بگاتــێ        دەینێرمــە ڕێــزی خــەباتێ
بـا بگـرێ ڕێگــەی نــەجاتێ        ســـەنگەرکری کوردســـتانم
سـەنـگـر گـری کـوردسـتـانـم

*** 

**کەرێ بۆز**

لـە زەمـانێك داو لـەزۆر زەمانـەکانی پێشـودا بـەئاغایانیان گوتونەپاشـاهەروەکو؟زەمـانی ئاغایان هەرلەمەڵبەندەکەی خۆمان ئاغای واهەبوچەنددیی هەبون وەکومالەحەمەد ئاغـای (ئەمیرعەشایری) هەموبەربنەی ئی ماڵێکی بوە،بـەلام کونـدرێ وزەنگیـاوێش هەریەکـەی بەشی چەندئاغایان بو.دەبی ئەوزەمانیش هـەرئاوابوبێ.دەنائەوهەموپاشـایەدەولاتێکی دا داچۆن حاوانەتەوەوچۆنیان ڕەفتارکردوەچونکە سەعدی شیرازی گوتویەتی:

دەدرویش درگلیمی بخسبند        دوپادشا درا قلیمی نگنجند

پاشا،بۆکۆنەنۆکەرەکانیان بابێکاریاپیرولـەکارکەوتوبان، هەردەبیریان‌دابوونە.

ڕۆژێکی یەکێك لەکۆنەنۆکەرەکان کەزۆریش کۆن‌ساڵ بووە چۆتــە خزمـەت پاشـای و عەرزی کـردوە:قوربـان مـاڵی دنیایـەم نیەومنداڵیشـم زۆرن، بێکاروکەسبم نـاتوانم هـەمو کـارێکیش بکـەم،پـەنام بۆجـەنابت هێناوەهـەتاکارێکم بـۆوەدۆزی یارێگایــەکم بۆدانێــی، با منداڵـەکانم لەبرسان نەمرن ئەمنیش نەبمەمەڵحەکەی خەڵکی.

پاشاپاش کەم بیرکردنەوە،شەش جورەماڵیاتی بۆدیاری کرد،بـەلام پاشـانەیدەزانی

تووشی کێ دەبێ ولەکێی وەردەگرێ؟

بەڵێ،پاشا.کاغەزی بۆنووسی وبۆی ئیمزا کرد.شەش جورمالیاتەکان بریتی بون لە.

١ـ هەرکەس بارە تەپاڵەی بفرۆشێدوقڕان ماڵیات

٢ـ هەرکەس کەرێ بۆزی پێ بێ دوقڕان ماڵیات

٣ـ هەرکەس نێوی هەیاس بێ

٤ـ هەرکەس ژنی نێوی مامز بێ

٥ـ هەرکەس برای نێوی سێمان بێ و

٦ـ هەرکەس نێوی بابی قویتاس بێ؛ هەریەکەی دوقڕان ماڵیاتێ دەبێ بدەن ..

پاشا.گوتی باشەبۆخۆی هەم دەخافڵێ وشتێکیش پەیدا هەردەکات.

بەڵێ کابرای کۆنەنۆکەرحوکمی پاشای دەباغەڵی ناوبەیانی زوو ڕۆییشت بۆنێو شاری. زۆرگەڕا هەتا لای ئێوارێ هەرهاتوچو؛ چی وەدەست نەکەوت لەدوسێ کەسانیشی پرسی کاکەنێوت،چیە هەیاس نێوی وەدەست نەکەوت ونەدەکرالەکابرای بپرسی ئەدی بابت یابراکەت نێوی چیەوچت پێ بووەهەرچەندی نێوشاری گەڕاکەرێ بۆزی نەدی و توشی هیچ بارە تەپاڵانیش نەبو.بەدڵساردی دەگەڕاوەبۆلای ماڵێ ودەفکری خۆی دا گوتی وادیارپاشاهەردەم خافڵێنێ دەناکوائەوانەدەبیندرێنەوەولەکوی پەیدادەبن ئەگەروا تەماشای کردلەنێوخۆڵەپۆتێکی،کەرێکی بۆز،کردویەتەتەپ وتۆوز،ئەوەخۆدەگەوزێنی، بەپەلەبۆلای‌کەرەبۆزی چووکەسی لەدەورەی نەدی هەرای کرد: ئەی ساحێبی ئەوکەرەی، ساحێبی کەرەبۆزی، زۆری هەراکرد،کەس دیارنەبوخەریك بوبڕوا لەناکاو کابرایەکی ڕوتەڵەی چۆك و ئانیشك پنوکراو، ئارەخچنێکی چڵکن و سەروچاوی تۆزاوی،کەهەموو لەشی دەئارەقەی‌دا شەلاڵ ببوو، بەغارهات وەیزانی کەرەکەی چۆتە دەزەرێ یان چ کارێکی پێیەتی؛بەخەونیش ئەوچاوەڕوانیەی نەدەکردئە؟وەی بەسەری هات گوتی بەڵێ قوربان، ئەمرت هەبوو ساحێبی کەرە بۆزی ئەمنم.

جا گوێتان لە گفتوگۆی ڕوتەڵەو کۆنەنۆکەری بێ..

:ئەوکەرەئی تۆیە؟ : بەڵێ. : وەدە دو قرانان :بۆ بابم چیکردوە، زەڕی کردوە؟! کواچی خواردوەبوڵەخۆڕاشلّتاغم پێ دەکەی؟

باجگیر:نا،بابە حوکمی پاشایەهەرکەس کەری بۆزی هەبێ دەبی دو قران باجی بدات.

کابرای ڕوتەڵە دەستی دە باغەڵیناهەرجارەی لاگیرفانێکی دەگەڕاو زۆربەزەحمەت دوقرانی دەرهێنادای بەکابرای باجگیر. زۆرکەس هەیەلەکاتی لێ ئەستاندنی ئەوجۆرە باجە بێجێیانە دەردێك یاگیرێکی خۆی دەڵێ بەڵکوزگیان پێبسوتێ لێی نەستێنن،یان لانیکەم بۆی کەم کەنەوە،هەربۆیەگوتی:بەخوای بابە بارەتەپاڵەم فرۆشت!

کۆنەنۆکەر دەڵێ چی بارەتەپاڵە، بارەتەپاڵەشت پێبووە؟

ڕوتەڵە،بەڵی بارەتەپاڵەم پێبووە:وەدە دوقرانی دیش دەی،ڕوتەڵە:بۆبارەتە پاڵەش باجی هەیە؟ : بەڵێ،بەڵێ.بارەتەپاڵەدوقرانی باجە.ئەوجارکابراهەرخۆی نەخوراندو،دو قرانی وێدا.وگوتی حاە ئەوە پوڵی سێمانی برامبو،وبێدابووم پەڕەجغارەی بۆوبکڕم.

کۆنەنۆکەرکەیفی سازبوو،گوتی چۆن براشت نێوی سێمانە؟

ڕوتەڵەبەچاولێ کردنێکی بەقینەوە:بەڵێ برام نێوی سێمانە.

باجگیر: وەدە دوقرانی دیش دەی. دەستی بۆباغەڵی نەدەچو،هەرچۆنێك بێ،دو قرانی دیشی دەرهێناووەکۆنەنۆکەری دا. : بەخوای بابەخەنەم بۆ زوڵفی مامزێ کڕی!

باجگیر هاتە پێشێ :وگوتی مامز چی تۆیە ڕوتەڵەدەڵێ مامز خێزانمەکونەنوکەر:چۆن ژنیشت نێوی مامزە؟ :بەڵێ، ئەدی چۆن؟ :دە وەدە دوقرانی دیش، نازانی هەرکەس ژنی نێوی مامز بی دەبێ دوقرانیش باجی بدات. لەکاتی پوڵ دەرهێنانێداسەری لێ شێوابوو.نەی دەزانی چەبکاوگوتی حەك ئەستۆت شکێ هەیاس دەگەڵ سەفەری کردت، کۆنەنۆکەرکەلێیخۆش هات بوولەسەریەك لەسەریەك دووقران دوقرانی لەڕوتەڵەی وەردەگرت قاقاپێکەنی :ئەی،کوڕە نێویشت هەیاسە؟ :وەدەدوقرانی دیش.بەدبەخت حەوق مابوونەیدەزانی چۆن وڵام بداتەوە، چ بکا، هەر پێی دەکرا دەست دەگیرفانی نێت ودراوێ دەرهێنێ وچاویشی دەکابرای باجگیربڕی بو.ودەڵێ کوڕەئەرێ وەڵڵا بابە نێوم

هەیاسە. خۆ ئیشاڵلا، نێویشم لێ قاچاغ ناکەی. ئەویش دەڵێ کورە نەوەڵلا نێوت لێ قاچاغ ناکەم دەبەرنێوت مرم بەڵام، نێوت بۆمن دوقڕانی عەواریز تێدا، دووقڕانەکەم وێدە دەی. ڕوتەڵە،بە لەرزەلەرزەدەستی بۆباغەڵی بردلەحەیفان چاوی هیچی نەدەدیت دو قڕانی دیشی بۆدەرهێناو:بابەتاڵانت کردم،قۆیتاسی بابیشم،پیاونیەئەگەرئەمن ساڵێکی دیش بێمەوەئەوشارەوێران بوەی.

کۆنەنۆکەرئەوچاوەڕوانیەی نەبوهەموعەواریزەکانی لەکابرایەکی ئاوافەقیروەربگرێ، خوێەوەندەشی ئینساف وپیاوەتی نەبوبڕێکی پێی ببەخشی ؟هێندەی کەیف خۆش بوو، پێدەکەنی ولەشایان وەخۆنەدەهاتەوە،دەستێکی هاویشتە سەرشانی کابرای: هەربە ڕاستی، بابیشت نێوی قۆیتاسە؟

ڕوتەڵەیەك بەخۆی گوڕاندی:بەڵێ نێوم هەیاسەوبابیشم قۆیتاسەبادنیابزانێ.

نێوم هەیاسە، بابم قۆیتاسە بەسم بدوێنە لەو قسە و باسە
دەی باشەئەتۆش زارت گرێدە ئاخیر عەواریز دو قڕانم وێدە

بەڵێ واهات هەر شەش عەواریزی لە کابرایەکی ئاوا وەدەست کەوت وەدە دو قڕانی دیش دەی. دو قڕانەی ئاخری دەرهێناو گیرفانی چۆل بوو. باجگیر بەکەیف خۆشی تەواوەوە بۆماڵەخۆی و هەیاسیش بەناڕەحەتی سەری دەبەرەخۆینا، نەخەنەبۆزوڵفی مامزێ، نەپەڕۆسێمانی برای ونەئالیك بۆکەرەبوزەی بەپیت وبەرەکەت نەدودەنك نۆغڵ و شیرنیات بۆمنداڵە ڕەش وڕوتەکانی، هیچی پێنەکراوبەدەستی بەتاڵ گەڕاوەبۆ ماڵی؛ ئەوەی پڕ بێ دڵی بوکەپڕبولەبوغزوکین لەئەوهەموزوڵمەی کەلێی کرابوو،لەبەر پەرێشانی وناڕەحەتیانی هەتالەشاری وەدەرنەکەوت، کەرەکەی لەبیرنەبو،دوایەگەڕاوە نێو شاری بەزەحمەتێکی زۆرلەنێوکوچەوکۆڵانان،کەرەبوزەی دیتەوەو نەیدەوێرا بی هێنێ تەوە،لەترسی عەواریزێ.

دەیگوت نەبادا؟ئێ دیشیم لێ بستێنن.



## قاله و ئەسلان

قاله دەگەل ئەسلانێ، هەربەنێو، ژن و مێرد بوون؛ دەنابەتەواوی کردەوە، ئەسلان پیاوبوو وقالەش ژن بوو. بەکورتی، ئەسلان هەمەکارەی ماڵێ بوو. قالەچکارە نەبوو، زۆریش لە ئەسلانێ دەترسا،بەهیچ جۆر چارەی نەدەکرد. ؟

ئەسلان هیچ خاڵێکی کزی نەبوو، لەوەیی بەدەر زۆر بەتەماع بوو. قالە زۆرگەڕا، زیندانێکی دیتەوە فکری گەییشتەئەوجێگایەی، بەهەرجورێك بێ، ئەسلانی دەئەو زیندانەی باوێت و خۆی لەدەست ئەودێوەزمەی ڕزگار بکات.،

قالەزۆربەخۆرەبوو، بەپێچەوانە، ئەسلان زۆرکز ولاوازبوو.

قالە ڕۆژێکی بەپەلەهاتەوەماڵێ و،گوتی ئەسلان! جێگایەکم، دیوەتەوەخەزنێکی زۆری تێدایە، هەتاکەس نەیزانیوەبابچین دەریبێنین.بەڵێ،یەك دووگوریس وچەندتۆربەیان دەستدانی،وچوونە سەر،زیندانەکەی وقالەگوریسی دەنێوقەدی خۆی خست، گوتی ئەسلان گوریسەکەی بگرەباچمەخوارێ. ئەسلان لەلایەك نەیدەتوانی قالەی بەخەزێنەوە هەڵکێشێتە سەرێ، بەبەتاڵیش هەرنەیدەتوانی ولەلای دیش دەترسا، قالەبڕێکی لە خەزێنەکەی بشارێتەوە، جالەبەرئەودو هۆیەی، بەقالەی گوت بێنەگوریسەکەی دەنێوقەدی من خە، بۆخۆم دەچمەخوارێ. قالەبۆخاترجەم بوونی ئەسلانێ، بڕێکی پڕکێشی کرد. ئاخرەکەی ئەسلان گوتی ئاخرخۆئەمن ناتوانم ئەتۆهەڵکێشمەوەوخولاسە هەرچەندی قالەگوتی، ئەسلان قبوڵی نەکردو گوریسی دەنێوقەدی خۆیخست و سەری دیکەی گوریسی وە،قالەیدا. ئەوجار قالەبە خاترجەمی ئەسلانی ڕۆیەڵ کردوبەگوریس ومریسەوە دە زیندانەکەی هاویشت و گەڕاوەبۆماڵێ و پشوێکی بەئاسوودەیی هەڵکێشا،

سبحەینێ لای نوێژی شێوان، چۆوە سەر زیندانەکەی هەتا بزانێچەخەبەرە هەستێك؟هەرایەك. دیتی یەکی سەرقرژنۆکە، ئەوەلەزیندانێ دێتەدەرێ قالەوایزانی ئەسلانە، دێتەدەرێ خەریك بوودەزیندانەکەی باوێتەوە؛ پێیگوت تێمەهاوێوە، ئەوەندەت قازانج پێدەگەیەنم، پێت سەروبەرنەبێ. لێی گەڕا هاتەدەرێ، دەڵێ چ

قازانجێکم پێ دەگەیێنی؟ئەتۆچی چەکارەی ؟پێی‌گوت ئەمن ئەجیننەم هەرجێگایەکی بچم، بەتایبەت ژن ومندالّ شێت دەبن، ئەتۆش خۆت بکەدوکتوربگەڕێ وبلّێ شێتان بە زەمانەت چاك دەکەمەوە. هەرجێگایەکی ئەتۆهاتی، ئەمن دەڕۆم، ئەگەرئەمنیش رۆیشتم شێت چاك دەبێتەوە.ئەوە.ئەوقەلەم پێی دای ؟کەهاتومەدەرێ،قاله پرسیاری لێ کرد: بۆچی لەئەوزیندانەی هاتیە دەرێ. وەلّامی داوە: نازانم چ غەزەب لێ گیراوێك ئەو ژنەی دێرە هاویشتوەو لەترسی وی هاتوومەتەدەرێ وهەلّدێم هاوارخورام.

قالەش دەلّێ بابەئەوەئەسلّانە.هەرچابوەنەی خواردوی چاکت نەجات بوە. بەلّی، قالەخۆی کردەدوکتور، برێك دەرمان مەرمانی دەکیسۆلکان کردوچۆوشارێکی دیکەو. بەلّێ ئەمن دوکتورم. لێیان پرسی: دوکتوری چی؟ : ئەمن دوکتورم؛ شێتان چاك دەکەمەوەبەزەمانەت. گوتیان،، کچی مەلیك غازانی شێت بووە چ بکەین؟ چ نەکەین؟ کەوتنەگەڕانێ. وئەولاولایان کرد، قالەیان وەدەست کەوت. لێیان پرسی: دوکتوری چی؟ ولّامی دانەوە: دوکتوری شێتانم بەزەمانەت چاکیان دەکەمەوە. بەلّێ قالەیان بۆمالّە پاشای برد،دەگەلّ قالە چووبۆلای، نەخوشەکەی جندۆکەچاوی بەقالەی کەوت ڕۆیشت وشێت بەبێ ئەوەی بەشولکانی لێ دەن چاك بووە.پاش چەند ڕۆژی دیکەخەبەرهات، ژنی فلّانەپاشایەی شێت بووە،چونکی خەبەری ئەو دوکتورەیان زانی‌بوو لە دوای هاتن، پاش وەرگرتنی، پولّ و زێرێکی زۆر، ڕۆییشت بۆمالّەپاشای کە ژنی شێت ببوو، ئەویش هەروا چاك بووەو چەند شێتی دیکەی چاك کردنەوەو،ئەوجارگوتیان، کچی والی موسلّێ شێت بووەلەوێراهاتن. قالەیان بردبۆموسلّێ لەڕێگایەجندۆکە ڕێی پێ گرت: ئەمە، قەرارمان ئەوەنەبووەبۆتەواوی دنیایەوەدوام کەوی، قالەگوتی ئەمن بۆیەنەهاتووم شێتان چاك کەمەوە، پرسی ئەدی لەچی دەگەڕێی؟

قالەدەلّێ بابەئەسلّان لەزیندانی هاتۆتەدەرێ لەترسی وی هەلّدێم.

جندۆکەدەلّێ هەی نەبی.

قالە:بەلّێ.جندۆکەکەدەلّێ جائەگەروایەئەمن ئەوەدەڕۆم بۆئەوبەری بەحری ڕەش.

**غەنیمەت**

کابرایەك جیرانی چاوەشێکی بوو.چاوەش وەزعێکی باش،ومندالّی دەکۆك وپۆشتە، تێروپڕ، جیرانەکەشی هێندەفەقیربوو، ئەگەرنانی هەبا دۆی نەبوو، ئەگەردۆی هەبانانی نەبوو،ڕۆژی واش هەبوو،شتاقی نەبوون.هەربۆیەڕۆژێکی ژنەکەی پێی گوت ئەوەتا،ئەو جیرانەمان ئاواتێروپڕن، ئەمەش هیچمان نیە،بۆناچی هەرنەبێ زوڕنایەکی لێ وەربگری، بەلّکوئەتۆش،شتێکی بۆمندالّەکان پەیداکەی چیدی هێندەئیحتیاج نەبین ئاخرخۆهیچمان نیەچیکەین.کابرای فەقیر،ئاخرقەتی زوڕنا لێ‌نەدابوو،.ناچارشەوێ چۆمالّەچاوەشی جیرانی وهەر،وەژوورکەوت،بەخۆوبەژن ومندالّی لەبەری هەستان،زۆریان ئیحترام گرت و، بەخێرهاتنیان کردو.زۆریان پێی سەیربوئەوکابرایەهاتۆتەمالّەچاوەشێکی چونکەپیاوێکی بەجورێیکی بو،پاش دەمێك دانیشتنێ لەڕوی خۆی هەلاّویشت:برالەئەگەر هەتانە هەرنەبێ زۆڕنایەکم بەئەمانەت وێدە،وەللاّهی وەزعم زۆرشەپڕێوەوهیچمان نیە، چاوەش بەژنەکەی گوت زوڕنایەکی بابەگەورەم لەمێژە هەلّگرتوەئەوەدەبن سەری کۆلّەکەکەی ئاخری تەویلەی دایە،بچوبۆی بێنەبەلّکو ئینشاللاّ ڕزق ورۆزی بۆزیادبێ.

بەلّێ، ژنە زۆڕنای بۆهێنا وێیدا،مام چاوش فێریشی کرد ئاوای لێدەبرێکی فیرەفیرلێ هینا. زوڕناکەی وەرگرت وهاتەوەمالّێ، هەربەیانی زوو وەڕێ کەوت ئەبەومەنزورەی،لە ناوچەی خۆی بچێتەدەرێ وبچێتەجێگایەکی کەس نەیناسێ هەم نەیدەزانی زوڕنایە لێ دا دوهەمیش پێ عەیب بو.

بەلّێ ئێوارێ گەییشتە قەراغ دێیەکی کۆنە ئاشێکی لێ بوو. گوتی ناچمەنێود ێی بانەم ناسن ئەوشۆولەنێوئەوکۆنەئاشەی‌دا دەبم و بەیانیش زوو وەڕێ دەکەوم،

دەنێوکۆنەئاشی‌دا دانیشتبوو،گوێی لەهەستێکی بو، هاتەدەرێ دیتی سوارێك، ئەوە بارێکی شتومەك پێیە وەکووفەڕش ونوێن وشتی باش وگران بەقیمەت و... لەدەرکی کۆنەئاشی دابەزی، بارەکەی داناعەرزی.ئەسپەکەی بەستەوەوجێگای ڕاخست؛ هەر دەهات ودەچووبەماتەماتەدەیڕوانی. پاش دەمێکی، ژنێك پەیدابوو،کابرا زۆری جنێو بە

ژنەی دا بۆوادرەنگ هاتوی نازانی چەندلەمێژەئەمن لێرەمەحتەلی تۆمە؟

ژنە:ئاخر،هەتانانم داوەودەست وپێوەندم جێبەجێ کردون هەروام بۆکراوەچبکەم .

بەڵێ، ئەودووەوێکراپاش برێـك قسـەی دەخـۆش پێکـەنین وسـرت وخورتـێ لەسـەر جێگـایی درێـژ بـوون،کـابرای سـوارگوتی ئـەوە ئـەمن لـەشکری ئینگلـیزیم.ژنـەش گوتـی ئەمنیش ئەوەعەسکەری رۆمێ مە.کـاك عوسمـان لەبەرەخۆیـەوەگوتی جائەودولـەشکرە بەشـەڕبێن،خۆبـەبێ شـەیپوری شـەڕی هـەرنابێ.بائـەمنیش شـەیپوریان بـۆلێ دەم وئەودولەشکرەش بابەشەڕبێن؟ دەگەڵ فیڕەی لەزوڕنایە هێنابەلینگ ڕوتی ،هەریەکەی بە لایەکیدا هەڵاتن وئەسپ وشتومەك،بەجێمان.کاك عوسمان هەرگورجێکی،شت ومەکی کـۆ کردنەوەولەئەسپەکەی نـان وسـواربوو، گـەڕاوەبۆماڵێ. هەرئـەو شـەوەی گەیيشـتەوە، ژنەکەی هاتەدەرێ وگوتی بەخوای بابەکارت کرد،نانت بۆمناڵان پەیداکرد.نەیزانی چەباسە :ئەوچاوەشەی جیرانمان دەڕوابەدوومانگ وسێ مانگ نایەتەوە،ئەتۆکوێرا هاتێەوە.

کابراش :کارت بەوەی نەبێ،بەقەد سێ مانگەی ئەوچاوەشەم بەشەوێکی هێناوەتەوە.

کاك عوسمان بارەکەی ئێخست ئەسپەکەی بردتاقەت کردشـتومەکەکانی بردنـەژورێ ئەوجارژنەکەشـی حـاڵی کـرد؟بـەڵێ،سبحەێنێ هێندێکـی لـەئەوشت ومەکـەی هێنـابوی، فرۆشتنی وبرێکی وەسایلی بژیـوی خـۆی ومنداڵـەکانی پێـك هێنـا.پـاش دو،سـێ مانگـان بڕوکێك موحتاج ببۆوەئەسپەکەی بردەبازاڕی بیفرۆشـێ.کـابرا لـەوێ پـەیدابووگوتی ئـەو ئەسپە،ئەسپی منە،عوسمان سوارەکەی ناسیەوەوگوتی ئەوەدەڵـەی چی کاکە؟

کابرا :دەڵێم چـی دەڵێـم ئەوئەسپە،ئەسـپی منـە.عوسمـان دەڵـێ باشەئەوئەسپەلە شەڕی ڕۆم وئینگلیزی بەغەنیمەت گیراوە.غەنیمەتیش نادرێتەوەبەکەس.

کابرای سـوارئەگەرئەوەی گـوێ لـێبوو، قسـەکەی خـۆی وژنەکـەی وەبیرهاتـەوەو. وەدەولەمـەندانیش دەچـو،ڕاسـت ڕۆیشـت و.وازی لەئەسـپەکەی هێنـا.مـام عوسمـانیش ئەسپەکەی فرۆشت ولەمنداڵەڕەش وڕوتەکانی خەرج کرد وهاتەو؟



## قەیات

مام وەتمان پیاوێکی زۆر فەقیرو بێ فێڵ بوو، ئەومام وەتمانە، جوتێکی گا پێبوون، لە مەزرایەلەنێوزەویەکرێنەکەی خۆی جووتی دەکرد. سوارێك بەرێگایەدا دەرۆیشت لایدا و ماندوونەبوونی لەمام وەتمانی کرد ودوایەدەڵێ براله ئەگەربچی نیسکێنێکم بۆبێنی زۆرم ئیشتیا لێ یەئەومایەنەت دەدەمێ، مام وەتمان خێرایەکی چوگایەکانی بەردان؟کابرادەڵێ ئەوەچەدەکەی مام وەتمان :دەچم نیسکێنەت بۆدێنم،کابرا :ئەدی گایەکان چەلێ دەکەی مام وەتمان :دەیانبەمەوە،کابرای سواردەڵێ بابە.بەپێی گاجوتان خۆتەتۆهەتائێوارێ ناگەیەوەئێرەئەمن ناتوانم هێندەمەحتەل بم مام وەتمان لەتاومایێنێ هۆشی نامێنێ ودەڵێ ئەدی چیان لێ بکەم ،هەتادەچم نیسکێنەت بودێنم، سوارەکە دەڵێ لێیان گەرێ هەتاتوانیم جوتیان پێ دەکەم دەنا بەریان دەدەم بابڵەوەرێن؟

مام وەتمانیش دەڵێ زۆرباشە،گاجووتی بەجێ هێشتن وبەغار. رۆییشتەوەماڵێ، نیسکێنەی بێنێ ومایینی وەدەست کەوێ،فکری نەکردەوەئاخرئەوەفێڵەدەنا چۆن کابراسواربێ ماینێ بەنیسکێنەدەدا.گەییشتەوە ماڵێ، بانگی خێزانی کرد: هەمین، وەرە زوونیسکێ نێکم بۆلێ نێ بۆکابرایەکی دەبەم ماینێکم دەداتێ ئەوەلەمەزرایە لەسەرە من مەحتەلەجازوبەخواناردویەتی ،خوشکەهەمینیش خواهەڵناگری زۆربەتەڕدەستی نیسکی شوشتنەوەو.وەسەرئاوری ناو، مام وەتمان ئەوجاربانگی خێزانی کرد:هەزارجارلەسەری منت کەوی، وەرەهەتانیسکێنە دەگوڵی بەپوشکان،جارێ زۆری دەکێشێ ئاوم بۆبێنەبا ئاخورێکی بۆماینەکەی دروستکەم ئەمنیش بێکاردانەیشم.

هەمین ئاوی بۆ هێناومام وەتمان ئاخورێکی بۆماینێ دروست کردو،بەهەمینێ خێزانی گوت بەپشتەوەم دا وەرەلوشکت لێدەم بزانم دەتکاتێ، نەبادامایندکەلوشکان باوێ ، هەمین بەپشتەوەی داهات مام وەتمان لوشکێکی هاویشت، وەزگی ژنەکەی کەوت، ژنەکەشی حاملەبوو، منداڵی لەبەرچوو، مام وەتمان گوتی ئەگەر ژنەکەشم، بەری هاویشت، ماینەکەم وەدەست کەوێ هەر باشە،

بەڵێ نیسکێنەحازربوو،دەدیزەی کردو،دوو سێ نانی دە زاری دیزەی ناهە تا نەشڵەقێ.خەسووی مام وەتمانی چاوی نەیدەدی بەڵام ئاگای لەئەوکەینەوبەینەبووبانگی کردگوتی توخواڕۆڵەوەتمانە،ئەگەرماینت هێناوەوفرۆشتت، دەسمالۆکێکی بۆدایەخۆ بکرە، مام وەتمان بەپێچەوانە،خەسوکەی زۆرناخۆش دەویست، داهاتەوە،پوشکێکی هەلگرێتەوەوبلێ ئەو پوشکەشت بۆناکرم، نان لەزاری دیزەی هاتەدەرێ ونیسکێنەی بە سەرسەریدا ڕژاو،هەموسەروچاوی سووتا، ئەوجاریش مام وەتمان برپێك دم وچاوی چەور دەکاو،دەلێ ئەگەرسەروچاویشم سووتا، ماینەکەم وەدەست کەوێ دیسان هەرباشە، بەلام هەتائەوهەمو،وردەکارانەی کردن ونیسکێنەی بەپووش وپەلاشی کولاند،زۆردرەنگ ببوو، نیسکێنەی تێکردەوەو،ڕۆییشتەوەبۆلای ماینەکوێتی،

بەلام بەداخەوەکابرای سوارلەوێ نەمابوو،گاجوتەکانیشی لەوێ نەمابوون،کابرای سوار بردبوونی بەلام مام وەتمان ئەوفکرەی نەدەکردکابرای سواربردونی وکابراش بۆفریودان وشۆێنەونکەی چونکەوادەردەکەوێ ئەوەڵ جاری نەبوەوزۆرجاری دیش ئەوجورەفێڵەی کردوە ؟تەپێکی ڕیخ لەسەرئامورەکەی دانابو.مام وەتمانی بەڵەك هاتەوە ماڵێ و ژنەکەی لێی پرسی: ئەدی کوا ماین! گایەکانت بۆنەهێناونەتەوە؟ مام وەتمان ولامی داوە: کابرای سوار لەوێ نەمابو زۆردرەنگ چومەوە.گاجوتەکانیش پێم وایەمەلاییکان بردویانن بۆحاسمانێ لەوێ جوتیان پێبکەن دیسان ڕەنگ بێ بێستانی بکەن.هەمین: جاچوزانێ مەلاییکان بردویاننتەحاسمانێ مام وەتمان: چۆن لەحاسمانێ ڕاڕیخیان بەرداوەتەوە کەوتۆتەسەرئامورەکەم، ڕاست لەسەر نێوەڕاستی نیرەکەی کەوتوەخۆهەردیار.

بەڵێ مام وەتمانی فەقیر ماینی وەدەست نەکەوت، ژنەکەشی منداڵی لەبەر چوو، بۆخۆشی سەروچاوی هەموسووتان، لەوەش خەراپتر گایەکانیشی لە دەست دان.



## گەلا خڕنوك

دەڵێن ژنێك دڵداری دەکرد وزۆریشی پێی خۆش بوو بەلام ڕێگای نەبوو، چونکە مێردەکەی هەمیشەهەرلەماڵێ بوو.وبۆ هیچ جێگایەکی نەدەچوو،ماڵی بەجێی نەدەهێشت. دەلالی ئەو ژنەی، ژنێکی جیرانی بووو،ڕۆژێکی تووشی هات و پێی‌گوت ئاوا فایدەی نادات، خۆت نەخۆش کە، لێفەی بەسەرسەرتدادەو بەدزیش نانی بخۆ هەتاسێ چوارڕۆژان ئەتوێوواگێل وماڵ وێرانی. ؟ئەودەمی کابرات (مێردەکەت) بۆت وەحەولان دەکەوێت و، ئەگەر لێی پرسی لەدوای کێ بنێرم،بڵێ بۆخۆت دەزانی،کەری کە،کەهات ونێوی هەر ژنێکی هەڵیدا بڵێ نا، هەتا دەگاتە من، ئەودەمی، بڵێ کەیفی خۆتە مەڵێ فلان بابێی، جا ئەگەرلەدوای من هات، ئەمنیش هاتم بۆخۆم دەزانم چ دەکەم ئەتۆهەرخۆت ناڕەحەت وبێ حاڵ کەو؟هیچ مەڵێ. چەند ڕۆژێك، ئەوژنەخۆی لەسەرجێێ ئێخست، بەلام مێردەکەی باوەڕی پێ نەدەکردودەیزانی نەخۆشی فێڵێیە، پاش سێ، چوار ڕۆژان کابرا تەماشای کرد ژنە زەرد هەڵگەڕابوو، ئەوجار بۆخۆی بەخۆی گوت؟ بەڕاتی خودای دەڵێی نەخۆشە! فکری ئەوەی نەکردئاخرئینسان چوارپێنج ڕۆژان خۆداپۆشێ زەردهەڵدەگەڕێ؟

چۆ بن سەری وگوتی عافرەت بۆوادەکەی؟ کوێت دێشێ؟

ژنە زۆربەبێ تاقەتی وبێ هێزی ولامی داوە: ئەوەندەم سەردێشێ قەراری لێ هەڵگرتووم. خۆئەودەمیش دوکتورلەولاتی کوردوستانێ دانەبوو،بیانبردبادوکتوری ئەوەی هەبوهەر دەرمانی پرووپیرێژنان هەبوو. : ئەدی کێت بۆبانگ کەم؟

ژنە: کەیفی خۆتە،بۆخۆت کێت پێ خۆشەبابێت، ماڵەکەشمان برێك بۆخاوێن کاتەوە.کابراهەرژنێکی نێوی هێنا، ژنەگوتی نا، هەتاگەییشتە دەلالەکەی، ئەوجار گوتی بۆخۆت دەزانی. عەولا (مێردی ژنە نەخۆشەی) چوو دەلالەکەی بانگ کردو پێی گوت هەتامالەمەوەرەخێزانم زۆرنەخۆشەوداوای تۆی کردوە.

ژنەتیوهەربەغاروبە پێ خواسی خۆی گەیاندەماڵەعەولای، هەرکە دەرکەی کردەوەو چاوی بەجێ وبانی ژنەکەی کەوت، بەسەروگوێلاکی خۆی داداو :حەك خوشکت کوێربێ!

حەك بۆت نەمێنم جەرگم خەرابێ! بەعەولاَی دەڵێ ئەوەبۆ زوترلە دوام نەدەهاتی. پیاوهەروابێ ڕوحمن بڕێکی ئەولاوئەولا کردودەستی لەسەرنێوچاوانێ داناو بڕێك دەست وباسکی ڕێك گوشین ودەڵێ ئەوەلەلای دێیەکەی ماڵەبابیشم، ژنێك هەرئەونەخۆشیەی گرتبوو (ژانەسەر) لەئێشی سەری هۆشی نامێنێ.دەرمانی ئەودەردەی گەلاَخڕنوکە دەگەڵ خەنەی دەیگرنەوەودەسەری دەدەن، وەك یەك ساتەی هەندویە.

عەولاَکەزۆربەوردی گوێی دابوەژنەی چونکەگوتی بەژانەسەرێی دەگری،ژنەکەشی گوتبوی سەرم دێشێ،لێرەش بڕێکی باوەڕ پێ کرد.لەژنەی پرسی گەلاَخڕنوك لەکوێ وەدەست دەکەوێ؟

بەڵێ،جێی گەلاَخڕنوکانی پێگوت کەڕێگای شەو،وڕۆژێکی پیادەی قۆچاغ بوو،کابرابەیانی زۆر زووکاڵەوپێتاوی لێ هەڵکێشاودووسێ نانی دەبنی توربێنی ناو،توربێنی لەپشتی بەست وگۆچانێکی دەست دایە،بگرەگەلاَخڕنوك هاتم.هەرلەدێی وەدەرکەوت ژنێکی دیکەی جیرانی کەئاگای لەئەووەزع وحاڵەی ئەوژنەی بو،تووشی عەولاَی بووکەئاواخۆی حازرکردوە.زانی سەفەریان بۆپێك هێناوە.لێی پرسی:عەولاَئەوەبۆکوێ دەچی واخۆت حازرکردە؟!

: خێزانم نەخۆشە، سەری دێشێ دەچم بۆگەلاَخڕنوکان دەگەڵ خەنەی دەسەری دەدەن دەڵێن پێی چاك دەبێتەوە.ژنە:گەلاَ خڕنوك .گەلاَخڕنوك لەکوێیە؟! دەڵێن لەدۆڵە نییە، لەدەراوی ماڵی سۆفیان هەیە. ژنەدەڵێ مردوت مرێ نەخۆشی چی، گەلاَ خڕنوکی چی؟! نوێژێ شێوان بچووەلەسەرکولانەی خۆت مات کەبزانە چ دەبینی؛ عەولاَش کەلەئەوبەزم وڕەزمەی هەرنیگەران بوو،بەقسەی ژنی جیرانی کردهەتاهێوارێ لەمەزرایە خۆی حاشارداو نوێژی شیوانێکی تاریك تارێك چووەسەرکولانەی وتەماشای کردنەخۆش نەمابوو، جێگای نەخۆشی خڕکرابۆوەو،ماڵێکی پاك وخاوێن وژنەش کەراسەنوێکەی وبەرگێکی جوانی دەبەرکردبوو؛ پاك وخاوێن.دەهات ودەچو،لەئەو وەختەیدا، کابرایەکی بۆشناغ وزۆرجوان هات وەژوورکەوت، ژنەگوتی ئەوەهاتوی چت بۆهێناوم؟

کابرا دەڵێ سێوی سەرچڵۆکان.

ژنەدەڵێ ئەمنیش ئەوەخۆم بۆڕازاندویەتەوە وەکووتازەبووکان.

عەوڵاش لەسەرکولانەی خۆی بۆڕانەگیراوگوتی ۰

ئەمنیش ئەوەهاتمەوەلەگەلاخرنوکان.

کابراوژنەئەگەرگوێیان لەدەنگی عەوڵای بوو، فویـان لەچرایەکردودەرکیان داخست، عـەولا هاتەوەپشـت دەرکـەی بوبەتاریکەشـەوێك چاوچـاوی نـەدەدی هەرچـەند دەیگوت دەرکەم لـێ وەکەن. لە ژووری ڕاولامیـان دەداوە: کـابرا! ئـەوە شـێت بوویـە؟! چیە؟! بۆناچێەوەماڵەخۆت، چت لەمەدەوێ بەئەوشەوەی؟!

بەڵێ؛ عەولای گێژکوچەوکـولانان دەگـەڕا، ئاخرئەوەماڵەفلانەکەسیەوئەوەش فلانـە کـولانەیە، وەلـلا ئەوەماڵەخۆمانـە، دەچووەپشت دەرکێ ودیسـان هێدیـیان دەکـردێ ئەوجارپاش زۆرمەعتەل بوون وئەولا وئەولاگەڕانێ، بەگەڕەکێداچۆخوارێ، تەواوێك لەماڵە خۆی وەدورکەوتبۆوەشەویش درەنگ ببووگوێی لەدەنگەدەنگێکی بـوو،چۆپشت دەرکـە کەی زۆری ڕوانی، دوایەلەکەلێنی چەپەرێ ڕاتەماشای کرددیـتی ئەوەکابرایەك ژنێکی لـە کۆڵـەکەی بەستوەهەتاتوانی لـێی داویـەجێی هێشـت ورۆیی. پـاش ڕۆییشـتنێ کـابرای، ژنێکی دی هات ولـێی پرسی گوتی چۆنی ژنە:جاچۆنم هیندی لێ داوم گوشتومی؛ لێمکەوە بائـەتۆبزێك لـێ بەستم لێرەمـەعلوم بوئەوەدەلالیـەتی،بـەلام قسـان نەکـەی دەنگـت دەناسی؟: نانادەنگێ ناکەم، ژنەدەلالەکەی لەکۆڵەکەی بەسـت بۆخۆشـی لێـی داڕۆیشـت بۆکـوی مـەعلوم بـوو؟!کابراهاتـەوەو،وەرگەڕادەلالـەکەی، وەیزانـی ژنەکـەی خۆیـەتی هەرچەندی لـێدا هیچی نەگوت،ئاخرنـەدەکرا۰،جـاران یـان دەپاڕاوەیـان دەیگـوت بۆلێـم دەدەی؟ ئەوجارمـەروابێدەنگ بووکرومـات.کابراهەڵیکێشـاکێردێ وگوتـی وئـەوەدیارە بەپیاویشم نازانی ودمی بڕی ودیسان لێیداڕۆیشـت.پـاش دەمێکـی ژنەگـەڕاوە، دەلالـەکە گوتی بابانت وێران بێ دمیشت بەبڕیندام، ژنەگوتی قەیدێ ناکا،کاری مـەی پـێ چادەبـێ دەلالـەکەی لـێ کردەوەوگوریـس وشـت ومـەکی بـەخوێنیان گـۆڕین، دەلالـەکەژنەکەی

لەکۆڵەکەی بەستەوەچوولەسەربانی ماڵەجیرانی بانگی کوڕەکەی کردوگوتی کێردەکەم دەبن سەرینی لانکی(بەسیلێ دایە) بۆم باوێ بوکی مامە سوری منداڵی بوە دەچم نێوکی دەبڕم. کوڕەکەی خەواڵو بوو، دەگەڵ کێردی بۆ هاویشتە سەربانی هەلآهەلآی لێ پەیدا بوو. وگوتی قوڕم وەسەری کێردەکەم وەدەمی کەوت، دمت بڕیم ،دەلآلەکەچوکارەکەی ودم ولوتی خۆی ئاواجێ بەجێ کرد، پینە کرا،

بەڵێ کابراش دیسان گەڕاوەبۆلای ژنەی وەری گەڕایە، ژنەدەستی پێ کردئاخر بۆوادەکەی بەئەونیوەشەوەی بۆچیم لێدەدەی؛ سوچم؟ تاوانم ئاخر چم کردوە؟!

کابرا گوتی نۆرەی ئەوەیەدەمێك لەوەپێش چەندم لێدای دەنگت نەکرد هەتادمیشم بڕی. ژنە: دمی منت بڕیوە؟ کابرا:بەڵێ؛ دمی تۆم بڕیوەئەدی دمی کێم بڕیوە.

ژنە: ئایاڕۆدمی پەریانت نەبڕیبێ، خۆت خەجاڵەتی دەرگای خوای تەباڕەك وتەعالا کردبێ قوڕم وەسری بو.

کابرا: جابزانەشێتیشم ناکەی، ژنە: جاپیاوێژگەئەمەدێین گرێوی دەکەین ئەگەرئەمن دمم بڕابوو،گەرنت خۆش وئازابێ سەریشم ببڕە، ئەگەردمیشم نەبڕابو، ئەمن هەردوو شەقان دەتۆ هەڵدەدەم دیاربوە پیشی فێربوەدەناژن چۆن وێراویەتی بەمێردی بڵێ تێت هەڵدەدەم ئەویش دەوەختێکی وادا.

کابراش چونکەبەدەستی خۆی دمی بڕی بو،چوزانی ئەوەحیللەی لێکراوە، گرێوی دەگەڵ ژنەکەی کرد. چووچرای هەڵکردەوە، هێنای وەهەرچەندی تەماشای کردو دمی ئەودیوئەودیوکردشوێنیشی لێ دیارنەبووئەوجارهێنای ژنەکەی لەکۆڵەکەی کردەوە، هەستادووشەقی دەمێردەکەی هەڵداوکێشەخلآس بوو.

عەولآش کەئەوەی چاو پێ کەوت برێك شل بۆوەوگەڕاوە ماڵێ هەتا هاتەوەزۆری گێشابوو،وەزعی ماڵەویش گۆڕابوو، هیچ کەسی نەدی، ژنەش چۆبۆوەدەجێی، وپێکەوە نوستن؛بەیانی کەلەخەوێ هەستان باسی گەلآ خڕونوك ونەخۆش مەخۆشی نەکرا،ژنەش ژانەسەری چاك بۆوەودەستی کردەوەبەکاری ڕۆژانەی خۆی!؟

**لە گەڕەکێ هەر شەوەی سەری پیاوێکیان دەبڕی**

سوڵتان مەحمود لەئەوەڵێ ڕا چونکە عادەتی وابوە شەوانە بە بەرگی دەروێشی و بە هەمووجورەبەرگێکی دەگەڕا هەتابزانی وەزعی شاری چۆنە. وچەباسە.،

شەوێکی بەبەرگی کارگەری لەنێو شاری دەسوڕاوە، ژنێك و پیاوێك، پێکەوە قسەیان دەکرد ژنەکەبەکابرای دەگوت وەرەئەوبەرەی. کابراش دەیگوت نایەم. ژنە:دەوەرە، بۆنایەی. کابرا گوتی هەتانەچی سەری مێردەکەت نەبڕی ودەنێوئەوجۆگەی نەهاوێی ونەیکەیەپردەبازگەو ئەمن پێیدا نەپەڕمەوە نایەم.

ژنەکێردێکی بەدەستی وەبوزۆربەتەڕدەستی چۆڕۆرێ وسەری مێردەکەی بڕی و دەجۆگەلەی هاویشت و پێی گوت ئەوجاردەوەرە.دەی.کابرادیسان گوتی نایەم،

ژنە: ئەوجار بەهانەت چیەبۆنایەی، کابرا دەڵێ چەندت وەفابۆمێردەکەی خۆت بۆە هەرئەوەندەشت وەفابۆمن دەبیت. نایەم. ئەوان، لێك جوێبونەوە. سولتان چو،گولە دەزویکی لەخمخانەی هێناودەرکی ماڵەکەی مۆرکردو ڕۆییشتەوە ماڵێ و لێی نوست. ژنەچونکە ئەوکارەی کردبو (سەری مێردەکەی خۆی بڕیبو) هەر گویسقولاغ بۆو؛پاش جێبەجێ کردنی کەلاکی. وەختێکی شەوێ کەهاتەدەرێ و دیتی دەرکی مۆرکراوە گوتی بەخوای بابەزەریفە، چو هەشتاگڵەدەزوی هێنا؛ چل ماڵ لە لایەك و چل ماڵیشی لە لای دیکەی مۆرکردن وخۆێ شاردەوە،سولتان بەیانی کەچۆودەبەرگی غەزەبێ، ئەمری کرد لە فلانە گەڕەکە ی وفلانە کولانەی دەرکێك مۆرکراوە بچون، ژنی ئەو ماڵەم بۆ بێنن.

پیاوی پاشای ئەگەرچون تەماشایان کرد.دەرکێکی چی،هەشتاوویەك دەرکەمۆرکراون، هاتنەوەوعەرزیان کرد:قوربان هەشتاوویەك دەرکەمۆرکراون،بۆن مەعلوم نەبووکێهە دەرکەیە،دوایەسولتان مەحمودحەسەن مەمێندی بانگ کردوگوتی حەسەن ئەمن ئەوە دەچمەڕاوێ حەوت شەوحەوت ڕۆژان.هەتادێمەوەنابی ئەوی ژنەدەشاری غەزنەوێ دا بمێنی،

سولتان ڕۆیشت بۆڕاوێ؛ حەسەن دەستەوئەژنۆ ماوە؛یا ئیلاهی ئەمن چ بکەم، پاش

زۆرفکرکردنەوەی،چۆوە ماڵێ یارمەتی لەبابی ویست وگوتی بابە؛ سوڵتان حوکمێکی ئاوای لێ کردوم، چ بکەم؟ بابی دەڵێ کورم ئەوقەتڵ وعامەبەتۆناکرێ هیچ دەست مەبزێوە. ئەگەر سوڵتان هاتەوەو گوتی بۆئەمری منت بەجێ نەهێناوە بڵێ بابم نەیهێشتوە، ئەودەمی بۆخۆم وڵامی دەدەمەوە.یان دەنابائەتۆبکوژێ .؟

بەڵێ سوڵتان پاش چەند شەو ورۆژان کەگەڕاوە،حیلکەوپێکەنینێ ژنان لەکانیەڕێیە ڕۆژێکی دەڕۆیشت بەخۆی گوت بەخوای بابەحوکمم ڕەوانە !

هەرڕەوانەدابەزی،چۆدەبەرگی غەزەبێ ودەستوری داحەسەن مەمێندیم بۆبانگ کەن، حەسەن مەمێندی کەهاتەحزورسوڵتانی؟! دەڵێ ئەدی ئەمن چ دەستورێکم پێدابووی چەباسە.گوتی قوربان هەرئەمرێکی بەمنت داباوهەرجورێك بایەبەئەنجامم دەگەیاند، ئەوەش بزانە،ئەمن بۆکەچکەخوێنێکی ناپارێمەوەبەلاّم بابم مانع بوونەیهێشت.

سوڵتان ئەمری کرد:برۆن مەمێندیم بۆبێنن.چون مەمێندیان هێنا.لە قەراری کەبۆیان گێڕاوەمەتەوە،مەمێندی هێندەپیربووەوچوکەبۆتەوە،دەنێوقەفەزیدابووە.گوێشی گران بونەوزۆربەزەحمەت گوێی لەقسان بووە.

سوڵتان گوتی مەمێندی ئەتوبۆ نەتهێشتوە حەسەن ئەمری من بەجێ بگەینێ.

گوتی قوربان ئەمن بۆخوێنی حەسەنی ناپاڕێمەوە ،ئەگەر ئیجازەم بدەی، بەسەرهاتێکت بۆدەگێڕمەوە.سوڵتان گوتی ئەگەرتاقەتی گێڕانەوەت هەبێ زۆرم پێخۆشە گوێم لەقسانت بێ.گوتی بەڵێ قوربان تاقەتم هەیەو ئاوای دەست پێ کرد.

:ئەلەئەوشارەێ غەزنەوێ هەرشەوەی سەری پیاوێکیان دەبڕی وکەسیش نەیدەزانی کێیەوسەری ئەوعالەمەی بۆدەبڕی بەگەڕەکێداهاتەخوارێ هەتاگەییشتەماڵەمە، وئەوشەوەی دەبالەماڵەمەسەرێك بڕابا، ئەمنیش بیرم لێ کردەوە هەرلە ئێواریڕاخۆم بۆحازر کرد، شیرم لەخۆبەست وئەسپم زین کردو لغاوم بەقەڵپۆزێ زینیدا هێنا، دیتم لەسەروحەددی نیوەشەوێ، لە دەرکەیان دا، گوتم کێیە.دەنگێک گوتی مەمێندی حازری؟ گوتم بەڵێ. گوتی ئەسپەکەت لغاویش کردوە. گوتم نەخێر. گوتی حەیف. ئەوەی

گوت و ڕۆییشت. دەرکەم کردەوە، دیتم ڕەشسوارێك و چی دیم بۆمەعلوم نەبووونـەمنیش هەرنیگەران بوم ودەرکەم داخستەوەوخۆم مات کرد،

بەڵێ ئەوێ شەوێ سەری کەس نەبڕاو،سبحەی‌شەوێ شیرم لـەخۆبەست وئەسپم زین و لغاو کرد، هەرلەوەختی شەوێ دیکە هاتەوە، لەدەرکەی‌دا، گوتم کێیە ؟ گوتی مـەمێندی حازری؟ گوتم بەڵێ قوربان. گوتی وەرە بەدوامدا. دەرکـەم کـردەوەو سـواربوم وکەوتمـە دوی، نە ئەوەبوو بیگەمێ ونەئەوەبوو وونی‌کەم لە پێدەشتی کە تێپـەڕین، ڕوی دە دۆڵ و دەڕەیکی کرد هەتا توانیمان بەسواری، دوایەدابەزی وگوتی ئەوئەسپەم بۆبگرە، ئەسپم بۆ گـرت وبـەپێیان دەدەڕەی هـەڵبو،ڕەشسـوارکەڕۆیی ئـەمن بۆخـۆم بـەخۆم گـوت بـۆ لێرەڕاوەستم، ئەسپەکانم بەستنەوەوکەوتمە دوای ڕەشسواری وگـوتم ئـاخر بـزانم بۆکـوێ دەچێ، چ دەکا ؟برێك بەدوڵەکەی‌داڕۆیشت؛دوایەزۆری هەست ڕاگرت وهێدی ولـەسەرەخۆ چۆدەئەشکەوتێکی ئەمنیش بێ ئەوەی بزانێ، ئەوە هەریەدوای مەوە؛ کەچۆدەنێودیوێکی دەئەشکەوتەکەی‌دا، لەنێو گـۆڕکی دیوەکەی ئـاورکرابۆوە، وچەندکەسێکیش لـەدەورەی ئاگرەدامرکاوەکەی بەدانیشتنەوەولەسەرتەنیشتێ وچۆن وچۆن ویا پاڵیان‌دابۆوەوخـەویان لـێ کەوتبو،دیاربوتازەش لەتالآنێڕاهاتبونەوەو،زۆرماندووهیلاك بـون، ڕەشسـوارکەهەرئاوا هێدی هێدی هەنگاوی هەڵدێنان،شمشێری بەدەستی ڕاستەوەبوکیسوڵکێکیشـی لەباغـەڵێ دەرهینابەدەستی چەپەی‌وەو،چۆڕۆری دیوەکەی کیسۆلکەی یەکەیەکەبەدم ولوتی وەنـان ؛ دوایەزانیم ئەوەدەرمانی بێ هۆشیە،هەمووی بێ هۆش کردن ئەوجار هـەڵی کێشـاکێردێ وپێیان‌دا هات کەپۆولوتی هەموانی بڕی ودەکیسۆڵکەی نان، ویستی بێتەدەرێ، ئەمن هەر ئـاوا هێـدی ولـەسـەرەخۆهاتمەدەرێ، خـۆم گـەیاندەوەکن ئەسپەکان، ئەگـەر ڕەشسـوار هاتەوە لای من، ئەسپەکانم بەدەستەوە بوون،بۆئـەوەی شـکی نـەکردبێ ،،ئـەمن وەدوای کەوتوم.تـۆربەکەی بەدەستەوەبوئەسپەکەی لـێ وەرگرتم، سواربوو گوتی وەرە. هەر ئاوا گەڕاینەوە، هەتاقەراغ شاری؛ لـەوێ بەبێ هیچ قسەوباسێك گوتـی مـەمێندی خواحـافیز ، خەریك بوبڕوا. وئەمنیش گوتم بۆکوێ خواحافیز؟ ئاخرئەمن دەبی بتناسم، بزانم کێـی؟ چ

کارەی؟ گوتی ئێستا ناکرێ، سبحەینێ پاش نیوەڕۆیەوەرەفلانەمحەللەی وفلانە مالەی لەوێ دەتبینمەوەوجاقسان دەکەین ولێك حالی دەبین.

بەلێ، شەوێ هاتمەوە مالێ حەسامەوەبەلام زۆرناڕەحەت بووم هەردە فکری ئەو کارەی‌دابووم ئەوەچ بوکێ یە.سبحەینێ پاش نیوەڕۆیەئەونێوو نیشانەی دایبومێ، چوم؟ مالەکەم دیتەوە،لەدەرکەمدا ژنێك هات دەرکەی کردەوە.سلاوم کردو گوتم شەوێ نیشانێکیان دابومێ دەبێ‌ئێرەهەوبێ.ژنەزۆربەڕوخۆشی گوتی بەلێ ئیرەیەفەرمووەرە ژورێ،چومەژورێ برێك دانیشتم،دوایەگوتم ئەدی کواپیاوەکەولەکوێیە؟ئەمن کارم هەیەدەبێ بڕۆم.

ژنەکەگوتی پیاوی چی؟!کێت دەوێ؟برێکیش لەخۆم ترسام، گوتم توشی چ بووم. ئاخرشەوێ پیاوێك ئەونیشانەی دابووبەمن، لەبەرئەو قسەی هاتوم. گوتی کارم پێتە، وەرەئێرە،ئەوم دەوێ. ژنەگوتی ئەوەی شەوێ پێی گوتی وەرەئێرەئەمن بۆخۆم بووم. ئەگەروای‌گوت، واقێکم بردەوەتەماشایەکم کردوگوتم باشە ئەدی ئەتوبۆئەوقەتل وعامەت دەشاری غەزنەوێ ئێخست؟

ژنە گوتی چل تەریدان مێردی منیان کوشتووە، ئەوەندە کارەی بەتۆم هەبو، هەر ئەوکارەشم بەئێکی دی هەبو،دەچومەهەرمالێکی، بانگی کابرام کردبا، یان بێ کەوا، بێ پاتۆل، بەسەرولینگی ڕوت، دەهاتە دەرێ، ئەمنیش شیرێکم لێ دەداو سەرم دەپەڕاند، دەمگوت جاتۆخوا ئەتۆش پیاوی؟

لەئەوشارەی‌دا،ئەگەرپیاوهەبێ ئەتۆی،ئەوەئەتۆهاتی ئەسپەکەت بۆگرتم وچوم کەپۆو لوتی ئەورێگرەخوێڕیانەم بڕی کەمێردەکەیان کوشتبوم تۆلەم لێ‌کردنەوە، تۆربەکەی هێنالەپێش دانام؛کەپۆولوتەکانم تەماشاکردن کەبڕیبونی ودیتبوشمن وگوتی، جا ئێستاحازرم مێردی بەتۆبکەم ئەگەرڕازی بی وپێت خۆش بێ،

سولتانم خۆش بی ئەمن بەشانازیەوەئەوشێرەژنەم هێناوەجادوایەباسی ئەوەم بۆگێڕاوە کەوەدوای کەوتبوم وئەویش زانیبوی ئەگەر وەدوای کەوتومە.

بەڵێ حەسەنی کوڕم ئەلەوژنەی بوە.

کەباسەکەم ئاوا بوگێڕاوەولەدوایەش‌دا گوتم ئەمر،هەر ئەمری سوڵتانیە.

جا قوربان ئەوژنەی جەنابت دەفەرموی ئەویش هەیەوئەوژنەش هەبوەسوڵتان مەحمودیش،زۆری ئەوبەسەرهاتەپێ خوش بوچونکە قەتی گوێ لێ نەببو.سوپاسی مەمێندی کردوسەبارەت بەئەوژنەقارەمانەی وتکای مەمێندی لە کوشتنی ژنی شاری غەزنەوێ وخەتای حەسەن مەمێندی خۆش‌بو.

مەمێندیش زۆرخۆشحاڵ بولەئەوبەخشینەی ودوعای بۆسوڵتانی مەحمودی کرد.

**(شێعری)لە گەڕەکێ هەر شەوەی سەری پیاوێکیان دەبڕی**

هەر ئە لەو شارەی، شاری غەزنەوێ سەریکیان دەبری هەر هەموشەوێ
شا سوڵتان مەحمود ئەو شای وا زانا هەموشەو لە ناو کوچە و کۆ لانا
دەگەڕا وەزعی شار بێتە دەستی لە جیێ داروغەی زۆر بە بێ هەستی
لەو بەر و ئەوبەری جۆگەلە ئاوێك سرت و خورتیان بو، ژنێك و پیاوێك
ئەتو لەوبەری بۆ ڕاوەستاوی وەرە ئەوبەرەی، زۆر لەبەر چاوی
:ئەنجامی نەدەی تۆ ئەو داوایەم هیچ بو ئەو بەر و بۆلای تۆش نایەم
سەری مێردەکەت نەبڕی وەك بەرخی تا گوێیم لێ نەبی لە قرخەقرخی
تا نەچی، سەری بڕاو نەهێنی لە نێو ئەو جۆگەی داینەمەزرێنی
نایەم بۆ ئەوبەر ژنە کە بیستی غاری‌دا ژورێ و کێردی بە دەستی
سەری مێردی بڕی وەکو پڵینگی گەراوە سەر و کێردی بە چینگی
دا ینا نێو جۆگە و بانگی کابرای کرد وەرە دەی ئەمری تۆم بەڕێوەبرد
:تۆ بۆ مێردەکەی خۆت وەفات چەندە بۆ منیشی دانێ، دەی دو ئەوەندە
من نایەم، ڕۆییشت، سوڵتان زۆر زرەنگ دەزوێکی هێناو ئەو دەرکەی کرد ڕەنگ
بۆ حەسانەوەی چۆوە دەرباری بۆ گشت کەس شەوێ نوستنە کاری



## با بزانین ئەو ژنە چ گێرەشێوێنێکی دەکا

هەرکەس کاریٚ بکا، دووربیٚ لە ویژدان     هەر چاوەڕوانە بۆ هاتنی بەردان
هاتەدەر شەویٚ دیتی دەرك و ڕەنگ     هەشتا گوڵەدەزوی هێنا بە بیٚ دەنگ
چل ماڵ لە لای چەپ،چلیش لە لای ڕاست     هەموی ڕەنگ کردن وڕۆیشت بەبیٚ هەست
بەیانی بەرگی تورەیی پۆشی     وەعدەی دا، لەو ژنە نەکا چاوپۆشی
دارۆغەی بانگ کرد حاڵی کرد کویٚ یە     ئەو شوێنەی ماڵی ئەئەو ژنەی لیٚ یە
وەختێك دارۆغە هاتە ئەو ناوە     هەشتا و یەك دەرکە ڕەنگی لیٚدراوە
دارۆغە دیتی و خێرا گەڕاوە     ئەو هەشتا و یەکەی بۆ شا ی گێڕاوە
سولٚتان هەروەکی هیچ ڕوینەدابیٚ     :حەسەن مەمێندیم بۆ بانگ کەن با بیٚ
حەسەن مەمێندی هات، پاشی سلاٚو     سولٚتان ڕایگەیاند ئەمن دەچمە ڕاو
هەتا حەوتویەکی ناگەڕێمەوە     هەرچی پێت دەڵێم تاکو دێمەوە
ئەتۆ ئەو کارەی دەبی پێك بێنی     نابی تاقە ژنێك لەو شارە بمێنی

## سولٚتان مەحمود دەچێتە ڕاویٚ

سولٚتان و وەکیل دەگەڵ چەند وەزیر     خێوەت و قشون سەردار و ئەمیر
ڕێکەوتن وێگڕا هەمو بەرەو ڕاو     بۆ کەیف و خۆشی شوێنی دیاری کراو
حەسەن مەمێندی وەك بەرپرسی شار     سولٚتان پێی ئەسپارد، تا بکا کوشتار
حەسەن زۆر داما، بیری کردەوە     تەگبیری بۆ لای بابی بردەوە
عەرزی بابی کرد، ئەمری سولٚتانی     ئەتۆ زۆر لە من باشتری دەزانی
:چابو پێم زانی، هاتی بۆو نێوە     ئەتو بۆوکارەی دەستت مەبزێوە
کوشتاری ژنی شاری غەزنەویٚ     لە چ ڕێگایەك، چۆن لە تۆی دەویٚ؟
شا با بێتەوە، لەگەڵی بدوێن     ناشپارێینەوە بۆ دو کەچکە خوێن

سولتانیش ئەگەر، لە ڕاو گەڕاوە — پێیوابو لە شار، هەرژن نەماوە
گەیییەوە دیتی قاقا و پێکەنین — ژن وێنەی مورو شایی هەڵپەڕین
بۆ خۆی بە خۆی گوت بەڵی زۆر باشە — حوکمی سولتانیە و خۆ هەر بەلاشە
گەیییەوە و بەرگی غەزەبی پۆشی — حەسەن مەمێندی ویست بە ناخۆشی
بۆ پای مەحکەمە، حەسەنیان گازکرد — بۆ لەسەردانی، جەللاد خۆی ساز کرد
لێیپرسی بۆچی بێئەمریت کردوم — لە چی ترساوی بۆ ئابڕوت بردوم
پاشام! هەر ئەمری بە منت ئەسپاردوە — بە بێ دوا کەوتن بەڕێوەمبردوە
مەمێندی باوکم بەلام بۆو کارەم — مانع بونەی هێشت جا کوا من چارەم
دەبڕۆن مەمێندیم ئێستا بۆ بێنن — خوێنم وەجۆش هات دامەمرکێنن
مەمێندیان هێنا، هێند چوك ببۆوە — لە نێو قەفەسدا، جوان جێیببۆوە
سولتان مەحمودیش زۆر نەرم و هێدی — ئاکاری پێشوی مەمێندی هێند دی
بۆچی نەت هێشتوە حەسەن برپارم — بەجێبگەیینی تۆی مەنعی کارم
وەزیرە پیرەی باوکی سولتانی — ولامیداوە وزۆر بە ڕەوانی
من لەگەڵ بابت کارم زۆر کردوە — ئەو دەورە دیارە بۆ من ڕابردوە
ئیجازەم بدەی ئەمن قەیاتێك — بۆت بگێرمەوە، یان بەسەرهاتێك
ڕون دەبێتەوە چەند کار و ئەو کار — ئیختیار بەخۆتە ئەنجامی ئەوجار
سولتانیش دەڵێ تۆ کە توانات بێ — زۆرم پێخۆشە گوێم لە قسانت بێ
بەڵی دەتوانم بۆتبگێڕمەوە — قەراربێ هیچت لێ نەشێرمەوە

❋ ❋ ❋

## بەسەرهاتی مەمێندی

ئاوای دەست پێکردمەمێندی زانا — سولتانیش ڕێزو قەدری بۆ دانا
هەر ئە لەو شارە، شاری غەزنەوێ — سەرێکیان دەبڕی هەر هەمو شەوێ

پێ داهات ئاوا، بێ نێوان بڕی    ماڵ بە ماڵ هات و هەر سەریان بڕی
حیساب واکرابو ئەو شەوەی وابا    لە ماڵەکەی مە سەرێك بڕابا
لە نێواریڕا خۆم بۆ حازر کرد    ئەسپم زین، لغاو بە قەڵپوزدا کرد
وەختی ماڵنوستنان بە گورز و توندی    یەك بانگی کردم:سازی مەمێندی
وەکو دەنگی خۆی ولامدراوە    ئەسپم زین بەلام، لغاو نەکراوە
هەر حەیفێکی ،گوت ودیتم گەڕاوە    مەعلوم بو کاری،ئەنجام نەدراوە
زانیم دێتەوە بۆ سبحەی شەوێ    ئەسپم زین و لغاو، پێش وەختی خەوێ
وەختی شەوی پێش،هەرئەو ڕەشسوارە    هات بانگی کردم توندتر ئەوجارە
مەمێندی سازی، وەرە بکەوە دوم    سواربوم کەوتمە دوی، دور و نیزێك بوم
پێ دەشتی کە بڕی، ڕوی کردە دۆڵێك    چۆن بە ترس و خۆف وا چۆل و هۆلێك
شەوێك وەك مانگی بەهارێ تاریك    وا بەترس خۆف، ڕێی چەخت و باریك
دابەزی دورو نیزێك بو لەغار    تروسکێك، هەستێك لێی دەهات جارجار
ئەسپەکەی دا من شیری گرتە دەست    پێپێ و زۆر هێدی دەڕۆیشت بێ هەست
پاش ڕۆییشتن و توند بیرکردنەوە    خێرا دابەزیم، ئەسپم بەستنەوە
کەوتمە دوی هەر وا شیر بە دەستەوە    ترسام، خۆم ڕاگرت زۆر بە هەستەوە
لە نێو ئەو غارە چوبۆ نێو دیوێك    خۆن مات کرد هەر یەك لە لای پەسیویك
چەندکە سێك لەوێی پاڵیاندابۆوە    لە دەوری ئاوری سەریان نابۆوە
خەو و ماندوێتی وای یەخە گرتبون    نەك نستو، دەتگوت هەمویان مردون
بەسپایی دەستی بۆ باغەڵی برد    کیسەی دەرهیناو زو دەستیپێکرد
دەرمانی ڕە دمولوتی هەموان خست    کیسەی دوبارە لە گیرفانی خست
کە زانی هەمو بێ هۆش بون زۆر زو    لێی هەڵدەکێشان، کێردی تازەسو

دەسك ماە و زەڕ کە دەخۆی ڕاخوڕی    کەپۆو لوتی ئەو چەند کەسەی زوبڕی
دە نێو تۆربێکی گەورەی سپی کرد    ویستی بێتە د وا، من پێش وی ڕامکرد
بە د یتنی ئەسپان من گەشامەوە    ئەوجار ترس و خۆف هات بەلامەوە
ڕەشپۆش گەڕا وە زۆر بە تەڕدەستی    تۆربەی پڕ کەپۆی بڕاوی بە دەستی
ئەسپی لێوەرگرت، گورجێك گەڕاوە    دە گوتی بگەڕێوە، کارمان تەواوە
دەهات وەکو با، هەر ئەسپی لینگدا    نەیگەیمێ هەرچەند تانوتم لێدا
لە قەراغ شاری، خواحافیزی کرد    وتی من دەڕۆم من دا وام لێ کرد
مەرۆ با بزانم ئاخر کێی ئەتۆ    دەبزانە چەندەش نارازیم لە تۆ
لەگەڵت هاتوم، بۆو شاخ و دۆڵە    ئە بەو تاریکیەی لەم چۆل و هۆلە
کارت پێمنەما، ئێستا دەردەچی    نابی پێمبڵێی تا بزانم تۆ چی



## دوایی و ئاکامی کاری مەمێندی

ولامی داوە:ئاکرێ بەوشەوە    جێگا و شوێنی من، وەبیر خۆت خەوە
سبەی پاشنوێژێ،من چاوەڕێتم    لە فلان کوچە و ماڵێ هەر کارێ پێتم
لە خزمەتتدام، بەو کارە و هەرکار    خواحافیزی خواست،جێی هێشتم ئەوجار
ئەوشەوەی تا ڕۆژ چاوم نەچۆ خەو    سام و هەیبەتی ئەوەی د یتبوم شەو
ڕۆژەکەش هەتا وەختی د یاریکراو    تورە و نارەحەت، وەك زوڵمێ کرا و
چوم بۆئەو ماڵەی بۆی د یاری کردبوم    دەق ولبابم کرد زۆر کەم مەعتەل بوم
ژنێك هاتەدەر زۆر بە ڕوخۆشی    سلاوم لێ کرد پاش چاك و خۆشی
شەوێ ماڵێکیان پێ گوتم لە د وری    داخوا ئێرەیە؟ دەبێ بمبوری
ژنە بە هەیبەت، ڕەوان پێمدەڵێ    فەرمو وەرە ژور، ئێرەیە بەڵێ
دانیشتم خافلام، زۆر چاوەڕوان بوم    لە هاتنەکەی خۆم هێند پەشیوان بوم

چونکە لەو ماڵەی لەو ژنەی بەدەر      کەسی دیم نەدی لە ژور و لە دەر

پرسیم:پیاوەکەت کوانێ؟ لە کوێیە؟      هاتوم بیبینم زۆرم کار پێیە

پیاوی چی؟ئەتوهاتوی کێتدەوێ؟؟!      ئەوکەسەی ئێرەی پێ گوتبوم شەوێ

دەڵەی چی ئەوە؟! ئەمن بۆخۆم بوم      کە بیستم کەمێك، دڕدۆنگی خۆم بوم

بیرم کردەوە و سستبوم لە جێی خۆم      ویستم زو هەڵێم پێمنەما بو بڕۆم

تێیفکریم گوتم چۆنبو ئەوکارە؟      ئەو قەتل و عامەت خستە ئەو شارە

زۆر بە ڕەوانی وئاوای دام وڵام      جوان تێنەگەییوم خۆم ڕاگرت بەلاّم

ئەوجار بە جوانی هات حاڵی کردم      پێمخۆشبو بمرم کوانێ دەمردم

بۆم ڕونببۆوە ئەو تەریدانە      مێردی منیان کوشتبو زۆر نامەردانە

هەر ئەوەند کارەی لەگەڵت کردوم      کارم ئەوەبو، ئەسپت بۆ گرتوم

سەرتاسەر گەڕام هەموی ئەوشارە      هەر ماڵێ دەچوم خوێڕی بێ کارە

کابرام بانگ دەکردبەحاستەم،دەبزوت      دەهات بێ پاتۆڵ پێ خواس و لینگ ڕوت

هێند تورە دەبوم ئەگەر وام دەدی      سەرم نەبڕیبان، چم کردبا ئەدی؟

ئەو تۆریەی کەپۆ و لوتی تەریدان      هێنای هەڵیڕشت لە گۆڕگی مەیدان

لەو نامەردانە تۆڵەم کردەوە      هەستی دەرونم جوان مردەوە

ئەگەر ئەو شارە پیاوی تێدا بێ      ئەتۆی، جوێ لە تۆ کەس بۆ پیاو نابێ

دەڕوانم، هەمو خەڵکیش دەبینم      لەو شارەی ڕەوای خۆم، کەس نابینم

وا حاڵی بە قسەم باست بۆ دەکەم      منیش حافرەتم، مێردی هەر دەکەم

من بە تۆ ڕازیم، تۆش کە بوی ڕازی      خۆت دەزانی چۆن ئیزنێ دەخوازی

لەگەڵ ئەو ژنەی زەماوەندم کرد      هەرتاکو مابو، شانازیم پێکرد

حەسەنی کوڕیشم ئە لەو ژنەی بووە      ئێستاکەش ئەمر هەر ئەمری تووە

ئەوەی جەنابت دەفەرموی هەیە — بەڵام شێرەژنی ئاوالەش هەیە
سوڵتان ئەونەقڵەی هێندە پێخۆشبو — چونکە نەیبیستبو و گوێشی لێ نەبو
غیرەت و مەردی، ئەو ژنەن چۆن دی — یا بە خوامیش و تکای مەمێندی
حەسەن مەمێندیش هەر کۆنە کارە — خۆشبو لە کوشتنی ژنی ئەوشارە
مەمێندی وحەسەن لە حەیی وەدود — دەپاڕانەوە بۆ سوڵتان مەحمود

## گلۆڵەبەن و کیتەڵەماست

ئەگەر هەڵیدەکەی سەیریدەکەی — ئەگەر دەیچێژی، دەیڕێژی

کاك برایم لەمەزرایەڕاهاتەوە ماڵێ،مەزراکەیان لەماڵێ دورنەبو.لەبەرهەیوانێ لەبن کۆڵەکەی دانیشت. دیاربو زۆریش ماندوو هیلاك بو، بانگی خێزانی کرد و:ئەرێ خەجیج دەزانی چەندم برسیەوچەندیش ماندوم نانم بۆ بێنە !خەجیج هەر زویەکی،نردوەنانێکی دەکەوڵی دا هێنالەسەرسەکۆیەکەی لەپێش برایمی دانا،کاك برایم: ئەدی کوا پێخۆر؟ دەبرێکم ماستی بۆبێنە، لەسوێی ماستی وەختە چاوم سپی هەڵگەڕێن،

خەجیج وەجواب دێ ودەڵێ بە ناشوکری نەبێ جاکوا ماست؟! مانگامان هەیە !گامێشمان هەیە؟! بزن، مەڕ، چمان هەیە؟!هەتاماستمان هەبی ·

دیسان کاك برایم دەڵێ ڕۆژێکەوهەرئەوڕۆبزانە برێکم بۆپەیداکە:کوڕەبەسەیدی زەنبیلێ سپیاییمان دەماڵێدا نیەچت بۆپەیداکەم ،کاك برایم :هەرنەبێ بچۆماڵەکاك مەحمودی خەجیج:بەپەڕی دەقورحانێ ناچم،پێرێ مامزیلێم ناردبوئەوهەتیوەداوای ماستی دەکرد،ژنە گولەکەی هەرلەدوررپا.دەنگیدابوهای هۆهای هۆ،بەخوای بابەمەشکەم ژاندوەودۆیەکەشم ڕشتوە

کاك برایم:دەی باشە عیلاج نیەبابرێکی بەئیشکی بخۆم خواکەورەیە، .

دوایەدوبارەڕوی دەخەجیجی کردو:ئەری هیچمان نیەبەرم بیفرۆشم برێکی ماستی پێبکرم.
خەجیج :نەبەخودای هیچمان نیە:دە کەلێنوقوژینان بگەڕێ بەشقەم شتێکم بۆپەیدا

کەی. خەجیج برێکی دیش هات وچووبرەبەنێکی هێناولەپێش برایمی دانا. : ئەوەندە بەنەمان هەیە. برێکی تەماشا کردو گوتی هەرئەوەندەمان هەیە. : ئەرێ بە خودای، هەر ئەوەندەیە، دەیفرۆشی و چیلێدەکەی، دوایە بۆبەندروش مەعتەل دەبین.؟

کاك برایم هەرچاوی لەئەولا وئەولایان وبەنەکەی دەکرد، لەبن گیشەی چاوی بە کیسەلێکی کەوت ئەوە خەریکەخۆلەبن گیشەی بشارێتەوەولەئەورۆرابیکاتە قایمەبۆ جستانێ، هەردە خەجیجیی راخوری:دادەی بەغار بچو ئەو کیسەلەم بۆبێنە!

خەجیج: ئایەرۆ!کیسەڵت بۆچیە؟! :ئەتۆ بچوبۆمبێنەکارت بەوەی نەبێ.

خەجیج چوبەقێز؟بێز کیسەڵی گرت وهێنای لەپێش برایمی دانا. کاك برایم هەر گورجێکی ئەوبرەبەنەی لەسەرکیسەڵی هەڵکردلاق وسەری پێ ون کردن وکردیەگلۆ لێکی گەورە. بەیانی زو گلۆڵەبەنی وەبن هەنگڵیداوبەرەوبازارکەوتەرێ. ئەوبازارەش خوا نەیبرێ چی فکرت لێ نەدەکرد کرین وفرۆشتنی لێدەکرا.؟

لە لای دیکەوەکاك مستەفالەجێخونێ راهاتەوەبانگی خیزانی کرد:نازدار زو نان و چایەکم بۆسازکەوبرێکیشم بەن بۆبێنەلەگەڵ شوژنەکەی لێرەیان دانێ. ئێواری برێك زو دێمەوە، ئەوجل وجۆرانەپەرداغ کەمەوە،بابۆگیاکێشانێ حازربن.؟

نازداروەجواب دێت ودەڵێ خۆبەغەوسی ماڵ لەبەغدایە هەرداوێکیشمان نیەتادەگا بەوەی جل وجۆرانی پێچاکەی، دوێنی ئێواری خاتونێ خوشکم لەوێرا ناردبوی بۆ بەندروێکی،نەمان‌بوبۆی بنێرم.مستەفا:ئەدی چ بکەین،بەخوای دەنامەحتەل دەبم دەبزانە برێك رۆن یاهەرشتیکی بی بۆم سازکە.دوسبەی دەچمەبازارێ،بیفرۆشم وبرەبەنێکی پێبکرم،بزانەحەواجی دیکەش چمان پێویستە، بێنم. نازدار:بۆ.بۆخۆت نازانی ولاغەکانمان ئیشکیان کردوەنازانم ئاوسن یان ئەو هەتیوە دێزەیە نایان‌لەوەرێنێ، چیان تێدا نیە.

کاك مستەفا:بزانە وەك مەردان چۆن شتێکم بۆ پەیدا دەکەی؟

خوشکەنازدارچو،برەشیرێکی دەبنی دیزەی‌داهێناو،لەپێش مستەفای داناو گوتی ئەوەندە شیرەمان هەیە. مستەفا تەماشایەکی شیرەکەی کردو گوتی نازدار بچو

ئەودیزەی بشۆوبەپاك وخاوێنی بێنەئێرە، شیرەكەش بكوڵێنە.دیزەی بۆهێنا، مستەفاچوله تەویلەی ڕیخی دەدیزەی كردهەتاهات پڕبێ، شیرەكەشی لەسەرێ ڕا دەدیزەی كردوهەوێنی كرد.بۆدوسبەی بەیانی كەببوو بەماستێكی جوان وتوندوەك جەرگی، ئەویش دوسبەی ڕۆژی بازاڕی دیزەی دەست دایەو بەرەوبازاڕكەوتەڕێ.

دەڵێن ئەودوانەتوشی یەكتردەبن؛چاگوییتان لەقسەكانی ئەود وفێڵەزانانەبێ ٠

برایم دەڵێ كاكە ئەوەچیەپێتە؟ مستەفا:ماستە بابم.

برایم:چی لێدەكەی؟ مستەفا:دەیفرۆشم٠

برایم كەگوێی لەكابرای بودەڵێ ماستەودەیفرۆشم، زۆری ئیشتیاچۆماستەكەی، چونكە هەر ئیشتیای لەماستی بو،بۆماست كڕینێش هاتبو.

مستەفاش ئەگەرگلۆڵەبەنی دەبن هەنگڵی كابرای‌دا دیت،دەباڵەخۆی‌داگوتی بابزانم سەودام دەگەڵ ناكات. ئەوە دیارەماستی دەكڕێ.

لیێ چۆپێشی وگوتی ئەدی ئەتۆئەوگلۆڵەبەنەی چ لێدەكەی؟

برایم:وەڵلاّ براله ئەمنیش هەردەیفرۆشم. مستەفادەدڵی خۆی‌دا دەڵێ نا؛ خودا چاكی دا. هەرچۆنێك بێ دەگەڵی دەگۆڕمەوە،بەبرایمی گوت بۆنایەی سەودای بكەین؟ ئەوگلۆڵە بەنەم دەیەوئەمنیش ئەودیزە ماستەت دەدەمێ.

كاك برایم كە گوێی لەقسەی كابرای بولەشایان گەشكە ببوویەقای نەدەكرد چونكە له سوێی ماستی هەرنەمابو.دەڵێ باشە ئەمن سەودای دەكەم.

بەڵێ؛ سەودایان كرد. كاك برایم گلۆڵە بەنی وە مستەفای داودیزەلەماستی لێ وەرگرت. برایم هەربەسەرزاری‌دا هات گوتی

ئەگەر هەلێدەكەی سەیری دەكەی،

مستەفاش گوتی بەخوای بابە٠

ئەگەر دەیچێژی دە یرێژی.

بەڵێ هەردوك بەكەیف خۆشی گەرانەوەماڵێ هەرگیفەی سمێڵانیان دەهات چونكە

هەردوکیان بەمرادی خۆیان گەیشتبون برایم لەسوی ماستی نەمابوومستەفاش بۆبەنی مەحتەل بو، هەریەك لەوانەدەفکری خۆیاندا دەیانگوت ئەوفێڵەم لەکابرای کردوەو نەشیزانیوە؟ ئیدی نەبرایم فکری لەقسەی مستەفای کردەوەچەدەڕێژی؟

ونەکاك مستەفاش فکری لیٚ کردە وەسەیریٚ چ دەکا؟.

ئەوجاربابزانین لەماڵیٚ چ دەکەن. برایم تێرماستی دەخواکەهێندەی ئیشتیالەماستی بو؟! ومستەفاجل وجۆران بۆگیاکێشانیٚ چاك دەکاتەوە؟!

ماڵە مستەفای لەبازاری نیزێك بوهەرکەگەیشتەوەماڵیٚ هەرایکرد:نازدار؛ ئەوجل و جۆرانەم بۆبێنەدەگەلٚ شوژنەکەی، ئەوەندەم بەن هێناوەبەشی دەروجیرانانیش دەکات. کەیفیان دێنی باکورتانی بۆگوێدرێژەکانیان بدرون.زۆربەدڵخۆشی گلۆڵەی هێناپێشەخۆی لایەکی زەردببوکیسەلٚ پیسی کردبوهەرگۆی نەدایەو.هەودایەکی لیٚ ڕائەنگاوت،لاق وسەری کیسەڵیٚ وەدەرکەوتن، مستەفابرێك لەگشتیەکەی خاوبۆوەوقسەی کەی وەبیرهاتەوە لەسەرەخۆگوتی ئەوەبۆیەسەگ باب گوتی

ئەگەرهەلیٚدەکەی سەیری دەکەی.

فێڵەکەی خۆی لەبیرنەبو،بەنەکەی لەلاق ولەتەری کیسەڵیٚ کردەوەوو،کیسەڵی هەڵداشت؛ جا ئەوجاربزانین کاك برایم کەهێندەی ئیشتیالەماستی بو چ دەکات؟

هەر لاقی وەعەرزیٚ نەدەکەوت لەشایان، دەیزانی چی داوەتەکابرای ودیزێکی پڕی ماست هێناوەتەوەماڵیٚ بەتەواوی نەگەیشتبۆوە،بانگی خیزانی کرد:خەجیج! وەرەنانم بۆبێنەخۆئەمن لەسوییٚ ماستی دڵم تۆقی، ئەوەندەم ماست هێناوەبەشی ماستاوو دۆکولێویش دەکات، نانم بۆبێنەدەی.

نانیان لەپێش دانا،دیزەی هێناپێشەخۆی وگوتی جاریٚ بادو سیٚ پاروان لە سەرتوێیەکەی بخۆم زۆرچەوروخۆشە.دوپاروی لیٚدا .پاروی سێیەی تەماشای کرد :ئەوەچییەتییدا! خۆ ژنی ئێستاکەمتروایەشیری بپالێون هەروا هەوێنی دەکەن. پاروی دیکەی لیٚ دا تەماشای کرد؛ئەی!ئەوەچیە؟!تامیشی جوان وەکو ماستی نەدەچو ئەی

ئەوەبۆوایە ؟! بەوردی کەلیێ روانی،ئەی! ئەوەدەڵەی ریخـە! زۆرجـوان دیاربو، سـەرنجی دایـە،ئـەرێ بـەخوای خۆریخـی تێدایەلـەجیاتی ماسـتی خۆبنەوەشـی هەریخـە کچێ وەرە بەرەبیرێژە،خۆهەموی هەرریخە،ئەوەبویەدەویدباب دەیگوت

،،ئەگەردەیچێژی دەیرێژی.

ئەوەبو سەرئەنجامەی فێل ْبازی لە دراوسیێکەی خۆت.

## پیرێژن و بەردبژێر

سوڵتان مەحمود ڕۆژێکی بەخۆوبەلەشکری دەچێتـەڕاوێ، تەماشـا دەکات ئـەوە لـە قەراغ شاری پیرێژنێك بەتەنێ لە زەویەکی گەورەوبەرداوی بەردبژێری دەکات.

سوڵتان ڕوی دە لـەشکری کردو گوتی کوڕینە ئەوپیرێژنە زۆرفەقیرە، بەتەنێ لـەئەو زەویەی بەرداویەی، بەردبژێری دەکـات، زۆرم زگ پێـی دەسوتێ، بابەهەرکەسـەی پێنـج بەردانی بۆفڕیێدەنە دەرێ چی دیم لێوناوێ،

لـەشـکری سـوڵتانی وەنێوزەویـەپیریژنێ کـەوتن، ئێکـەی پێنـج بەردیشـی وەبـەر نەکەوت، بەرد لەنێوزەویەخەڵاس بون.

دوای خەڵاس‌بونی بەردان، سوڵتان مەحمود گوێی لە پیرێژینێ بـو،کـەدەیگوت ئـای کار کردنی بە زۆران؛ نان خواردنێ بە کەمان، چەند خۆشی.

سوڵتـان پێکـەنی وهـەرای لەلـەشکری کردگوتـی، کوڕینـە داپـیرە زۆر سـۆدرەیە، هەرکەسەی شەش بەردانی بۆباوێنەوەنێو زەویەکەی،

لـەشـکر، هـەروەکی لـە فڕیێدانـێ ئـیوا هـەبو پێنـج بـەردی وەبەرنەکـەوتبو، بـۆ هاویشتنەوەی نێوزەویش، ئی وابو، حەوت وەشتی هاوئیشتبونەوەنێو زەوێ پیرێژنێ بە جورێکی کە زەوی پورپیرێژینێ خالیس بوبەبەردەلان جارێ.



**مەلای کتێب سور**

دەگێڕنەوە، لەزەمانی پێشودا.دورونیزیکی مەعلوم نیەچەندە، لە ئاوەدانیەکی چۆکە چەند ماڵە دەوڵـەمەندی لێبون، مەلایەکی فـەقیرو کـەمخوێندوی،بـەخۆی ودومنـداڵ و ژنێکی، دەژیان.چ ژیـانێك، ئـەوەی خوداڵەسـەرعەرزی داینـاوەنـەیان بووشـکیان نـەدەبرد هەرچاویان لەکاسەجیرانەتی وپێخۆری ئەوچەندماڵەدەوڵـەمەندانەبو.دیـارە تـێ پـەڕبونی ئەم جورەژیانەجوێ لەلاوازبونی لـەش وڕوحی بنیادەمی هیچ سودێکی دیکەی نیە.جابەم هۆیەوەڕوژێکی مەلاژن فکری لێکردەوەوبەمەلای گوت ئەرێ مەلا ئەتو بۆ نشتوان نانوسـی بۆچماقورحانی نازانی هەرنەبێ بەسەرقەڵـەمانەکەی پێخۆرێ خۆمان پەیدادەکەین وچیدی منداڵەکان چاولەدەست نابن هەروەکو گوتراوەبەردێکی لەبەردێکی دەی شـتێکی لێ پـەیدا هەردەبێ.

مەلا فکری لـەئەوقسەی کـردەوە،شـارێکی بچکوڵەلـەنیزێکی دێـی ماڵەمــەلای بــو ڕۆژێکی مەلابۆچەندحاجـەتان (چۆنەوشـارەبچکۆڵەکەی) ولـەکاتی گەڕانــەوەی بۆمــاڵێ، کتێبێکـی نشـتوانی کـڕی، جلــدی کتێبەکــەی کاغــەزێکی سـوربو.هەرگەییشـتەوەماڵێ بەمـەلاژنێی گـوت بەقسـەم کـردی وئەوکتێبـەم کڕیوەونشـتوان دەنوسـم.مـەلاژن زوێکــی چۆکانی(وژن و ژاڵ لەسەراوودەراوان باسی هەموشتێکی دەکەن) ژنـی جـیرانی ماڵەمـەلای دەڵـێ کوێــر بم کوڕەکــەم ئــەوەدوڕۆژە ســەری هەڵنــەهێناوەنازانم ترسـاوە،سـەرمای بوەچیەدەسـتبەجێ مـەلاژن دەیقۆزیتـەوە:جاسەرقەڵــەمانەی بۆمــەلای بێنــە، نشــتوی بۆدەنوسێ ((بە دەمان زەمانە))

ژنەدەڵێ ئەی دەبەرکەوشەکانی دەمرم هەرمەلاوسەرقەڵـەمانە ! !

ژنەکە. لەکانیە نوێژی کردوچۆوە ماڵێ، نەچۆوە ژورێ، هەرلە دەرێڕا شتومەکەکانی دەحەساری هاویشـتن وڕایکردبـۆلای ماڵـە مـەلای، هەرلــەبیری‌نەبوسەرێکی لەکوڕەکـەی بدات و بزانی چۆنە، ئەوەش بزانین باشەئەگەربەخت وشانس ڕوی دەکەسێکی کردبـەژن ومنداڵـەوەعەقڵیان دێتەدەمێشکی، مەلاژن دە پێش ژنی جیرانی دا خۆی گەیاندەوە ماڵێ

و بەمەلای گوت ئەوەکوڕی فلاّنەکەسەی جیرانمان نەخۆشەزونشتوێکی بۆبنوسە، بەڵکوخواڕەحمێکی پیّبکات وچاك بێتەوەوشتێکیش بەمەبگات،لەئەوقسانەدابون ژنی جیرانی وەژورکەوت، سلاّوی کرد سلاّویان لیّ وەرگرتەوەوبەخێرهاتنیان کردومام وەستا. وەکوکەڕامەتداران دەڵیّ بۆ هەتاکوڕەکەت نەخۆش نەبونەهاتی. ژنەش:مامۆەستا گیّان هاتومە.هەم بۆبەخێرهێنانیّ ودوایەش ئەوەعەرزت دەکەم بەقورحانی بسم اللەیت لیکردوە ئەوەدوڕۆژەلەتاوناڕەحەتیەئەوهەتیوەی زەوادم نەبڕیوە،هاتوم سندوقی سەری خۆت نشتوێکی بۆبنوسی،ژنەچاوی پڕببون لەئاو و هەرفرمێسکی دەستڕینەوەومەلاش دەڵیّ ئەی بەسەرچاوم، هەرئێستا بۆی دەنوسم مەلا لەسەرکورسیلەی دەستنوێژی نویّ کردەوەو، بەنێتی دوڕەکات سوننەت نوێژی دابەست مەلاژنیش دەگەلّ ژنەی دەستیان بەقسان کرد باس وخواس زەمانەی؟

مەلاژن زۆری گلەیی لەئەو زەمانەی هەبوولەبەر شپرزەبونی وەزعیان، کە هیچیان نەبو،بۆژنەی دەگێراوە،بەڵکوئاورێکیان ویّ بدا هەرنەبیّ لەبڕە پێخۆرێکی؛ کەهەموڕۆژیّ منداڵەکانی، نانیان بەئیشکی دەخوارد. ژنەش زۆربەوردی گوێیدابۆیەوزۆریشی زگ پیّدەسوتان فکری دەکردەو، جاروبار پیاڵەماستێکیان بۆبنێرم خێرە. مەلاسلاّوی نوێژییّ داوەوفاتیحاو دوعای پاش نوێژییّ خوێندو زویەکی کتێبەکەی هێناپێشە خۆی وکوتەکاغەزێکی بۆرەکەڵەی لە بنەوەی گیرفانی دەرهێناوبڕێکی لێوبزاوتن وبڕێك کتێبەکەی ئەولائەولاوئەودیوئەودیوی پیّ کردو،لەجێگایەکی ڕاوەستا،ودەستی کرد بەنشتونوسینیّ؛ نشتوەکەی بەورتەورت نوسی و سیّقولینچکی کردوپێچایەوەودایەدەستی وگوتی خوشکیّ گیان؛ فەرمو،بەدەستی بەدەسنوێژ دەمێوییّ گرەو.دە ئاوییّ هەڵێنە، دەسلاّواتان لەدیداری پێغەمبەری(ص) لێدەوپینج جاریش بڵیّ استغفراللّە، خودایە پەشیمانم وبڕێکی لە ئاوەکەی بدەیەبابیخواتەوەو.وهێندێکیشی لەسەروچاوی هەڵپرژێنە چاك دەبێتەوە انشاءاللّەوتەعالاوئەتوش دوعای بەخێرمان بۆبکە.

بەڵیّ ژنەنشتوەی بردەوەوبەدەستوری مەلای دەعەمەلی هێناخوای تعالی ڕوحمی

پێ‌کرد کوڕەکە چاکبۆوە.

ڕۆژێکی پاش نیوەڕۆیە، مەلالـەدەرکێ دانیشـتبو، جیرانەکـەی لەمەزرایـەڕا هاتـەوە، هـەتانیروئاموری هێـدی ولەسـەرەخۆ.لەسـەرکەلاّن وەلابردوکەلّـەکانی دەتەویلـەی کـردن خەرەزەنی لەدەرکێ لـەبیرچو،ڕەوانەمـەلاچوبرێکی گـلّ وخـۆلّ بـە پێمـەڕەی وەسـەرکرد وەتابەجوانی ونی کردوهاتەوەلەجێی خۆی دانیشـتەوەوو دەسحیەبەکانی هێنانـەدەرێ کابرا.زۆرماندوببوچونکەلەنیوەشەوی‌ڕاچۆبۆجوتی٠لەتەویلـەی‌ڕاکە هاتەدەرێ برێکـی چـاو بەئـەولاولایان‌دا گـێڕا وچـۆوەژورێ.خـەریکی نـان خواردنـێ بو، پـاش درەنگـانێکی زانـی خەرەزەنی نەهێناوەتەوەمالّێ. چۆوەژورێ ودەرێ گەڕا، خەرەزەنی نەدیتەوە.چۆلای مام وەستاوی ،سلاّوی لێ کردوگوتی مام وستاگیان، خەرەزەنەکـەم لێ وونبـوە. بێزەحمـەت بۆن تەماشـایەکی کتێبەکـەت کـەبزانین، لـەکوێیە؟!مـەلا زویـەکی چوکتێبەکـەی هێنـاو لێکی‌کردەوەوچاکی خەرەزەنەکە پێ‌دەزانی، پاش برێك گـەرانێ چولەسـەرخەرەزەنەکەی یا کەمێك ئەولاتر ڕاوەستاو هەرتەماشای کتێبەکەشی دەکـرد، گوتـی:ئێرەبدەنـەوە. مـەلا تەماشای کتێبێ دەکردوکابراش بەپێمەڕەی، گلّ وخۆلّـی لادەداوخـەرەزەن وەدەرکـەوت، ساحێبی خـەرەزەنەکەی هەلّگرتەوەوبردێوە مالّێ. ژن و ژالّی کابرای سـاحێب خـەرەزەن، دایکی مندالّە نەخۆشـەکەی و مـەلاژن، لەسـەرئەوەی دەسـتیان بەقسەوباسـان کـرد.یـەك دەیگوت ئەومەلایە،وەلیە.ئەوی دی دەیگوت دایکم بەخودای ئەوکتێبەهەموشتێکی تێدایە وباسـی هەموشـتێکیش دەکـا،جیرانـەکانی دیکەشـیان لـەئەوبارەیەوەهاوبیریان دەکـردن (لەسەرنشتوەچاکەکانی مام وەستاوکتێبەسورەکەی) شاهیدیان بۆ یێکتری دەدا.

(یـا ڕەبـبی هیـچ کـەس نەبـەچاك ونەبەخـەراپ نەکەوێتەبـەرزاری ژنـەورکان) شەوو ڕۆژێ کانی وسەراو هەرزیلـەیان دەهات وهەرتـەعریفی مەلاوکتێبـە سـورەکەی بـو، خەبەربلاّوببۆوەبۆدەوروبـەریش.شـارێکی گـەورەش لـەنیزێك ئـەودێ چکۆلـەی بـوزۆری پێ‌نەچوڕۆژێکی بـەیانی خەبـەریان دابەپاشـای وگوتیـان هـەموڕۆژت لـەنوێ بی وبـەرگی نوێشت لێ موبارەك بێ،ئەوشوخەزێنەیان بڕیوەبیست کولّیان خەزێنەداگرتووبردویانە؟

پاشا.ئەگەرئەوخەبەرەی بیست دەستێکی کەوتەئەولای ودەستێکیشی کەوتەلای دی، وەزیرونایبووهەموکاربەدەستەکانی کۆکردنەوەوداوای لێکردن ئەوخەزێنەی دەبێ بیننەوە؛دەنا.لەسەری هەموانودەدەم.

تەواوی دەست وپەیوەندی پاشای تفیان دەزاریدا ئیشك ببوبەیەکتریان دەگوت چ بکەین؟چۆنی ببی نینەوە؟خۆبەخودای ئەگەرنەی بینینەوەپاشا سەری هەموانمان دەبڕێ. بەلآم لەلای دیکەوەخەبەری مەلای کتێب سور،بەهەموولآتی گەیشتبو، ئێکێك لە وەزیرەکان چۆخزمەت پاشای وعەرزی کردو:پاشابەسلامەت بێ،مەلایەك لەئەودێ چوکەێ پەناخۆمان هەیە، هەم کەرامەتی هەیەوکتێبێکیشی هەیە،هەموشتێکی تێدایەوهەرچی هەبێ ونەبێ باسی دەکات ئەگەرئیجازەبفەرموی لەدوای دەنێرین،بابێتەئێرە؛ وەزعەکەمان بۆ ڕون بێتەوە. پاشاش لەتاوخەزێنەکەی و.واشی لێ تێك چوبوونەوقسەی زۆر پێ خۆشبودەستوری داهەرئێستابچون مەلای بانگ کەن،چەندکەس لەپیاوەماقوڵەکان، چون مەلایان بەئیحترامەوەبانگ کردکەپاشاکاری پێتە،مەلادەپێش دازۆرترساوهەروەخت بوزەندەقی بچێ خۆلاسە هەرجورێکی بو.کۆنەحەبایەکی پنوکراوی هەبوکۆنەحەبای هاویشتەسەرشانانی وەپێش وەزیروکاربەدەستانی پاشای کەوت وڕۆییشتن بۆدیوانێ، دەرکەوانەکان خەبەریان دا ئەگەرکاربەدەست وپیاوەکان هاتنەوە، ئەوە مەلایەکیشیان دەگەڵە؛ ئیجازەیەبێنەژورێ؟

پاشائیجازەی پێدان،مەلا دەگەڵ وەژورکەوت پاشا یەك پێ لەبەری هەستاولەسەرەوەی خۆی داناو زۆری بەخێرهێناوئیحترامی گرت.لەپاش سەرف کردنی چەندقاوەوقەلیان؛ هێندێك قسەوباس وئەوجارپاشا.ڕوی دەمەلای کردوفەرموی دەزانی بۆچیم لەدواناردوی؟ مەلاوەختابولەترسان دڵی بتۆقێ سەریکی لەقاند. پاشاش لەتەعریفات مەلای دەست بەجێ لە قسەی خۆی پەشیمان بۆوەگوتی قوربان عەفوم کە،خودەزانم زۆرلەمە باشتردەزانی مەسئەلەچیە؟!بەلآم پێم خۆشەپێت ڕابگەیەنم ولێك حاڵی بین، ئەوبیست کۆڵەخەزێنەی من کە دزراوە،خواباربی دەزانم دەشیبینیەوەئەودەمی بۆخۆت هەرجورێ

پێت خۆشە،دەیانبەخشی، جەریمەیان بۆدیاری دەکەی، کارم پێی نیە. تەنیا ئەوەندەیە ماوەمان دیاربێ، هەتاچل ڕۆژی دی بی بینێوە، دیارەئەوەش بۆجەنابت کارێکی وانیە کەلەبیرت بچێتەوە.مەلادە گەڵ زۆرخواردن ولەرزینێ لە ترسی پاشای کەتوشی بەلایەکی گەورەببوبەلام لەگەڵ ئەوهەموقوربان قوربانەی،فەرموتە،بەڵێ بەڵێیەی، هاتەوەسەرەخۆو لایەکی حەباکەی بەربیوەبەسەر شانی داداوەوکەمێکیش خۆی خرکردەوە وبرێکی لێوبزاوتن خولابۆمەلای ئاشکراکرد دەناخۆئاگای لەمەحمودی بێ زەوادیش نەبو..بە دەنگێکی بەرزگوتی قوربان خوایار بێ هەرئەوماوەی جەنابت داتناوەبەڵکەزوتریش پەیدای دەکەمەوە.

مەلا خواحافیزی خواست وبەرەوماڵ بۆوە،هەرلەدەرکی ماڵێ ڕادەمەلاژنێ بەربو :خودا غەزەبت لێگری؛ توشی قەهری خودای بی! وەکی ئەمنت توشی ئەو دەردەسەریەی کرد. ئەمن چی ودیوانی پاشای چی؟! ئەمن چی ودیتنەوەی خەزێنەی پاشای چی؟! بۆلێت نەگەڕام، جەمێکم خواردباودوجەمیش بەبرسیایەتی ڕامبواردبا. هەر ڕۆژەی لەجێگایەکی گوزەراندبام. قەهر لێ گیراو؛ توشی چ دەردەسەریەکت کردم دەفەرمووەرەخەزێنەی پاشام بۆببینەوە،هەی کتێبێ بکرەکتێبێ بکرەونشتوان بنوسە.ئەوەتانشتوئەوەی پێوەیە !مەلاژن هەتا ئەودەمەی بێدەنگ بوئەوجاررۆرمێدی وئارام؛ وەجواب هات وگوتی مەلائەوە چ بوە؟ بۆهەڵچوی؟ چ تەنگانێکت هاتۆتە پێشێ؟

خەمێ مەخۆخوایاربێ هەموکارەکان بەباشی جێبەجێ دەبن.مەلا:بەکوێیدا جێبەجێی دەکەی؟ دە بۆم جێبەجێ کە؛ ئەمنیش هەرئەوەم دەوێ. مەلاژن:دەوەرەدانیشەبرێك لەسەرەخۆبەو.مەلا:کچێ لەسەرەخۆی چ بم؛ بە قورئانی لێمخوێندوە،وەختە شێتبم. مەلاژن مەلای دانا وبرێکی ئاوی سارد.دایەو لێی گەڕا هەتابرێك حەساوەوهاتەوەسەرەخۆ، گوتی مەلاوەرەبۆمبگێرەوەبزانم چبوە، هێندە تورەبویە؟ مەلا کارەساتەکەی لەنوکەوەبۆگێڕاوە.مەلاژن گوتی زۆرباشە، هەتاچڵ ڕۆژی دی خوادەمێنی وملکی دەمێنی. مەلاژن کەزۆرحەیاربوچوچل شوتی کرین هەتاحیسابی

چل رۆژەیان لێ تێك نەچی ولەتەرەی دان لەگەلٚ مەلای قەرارێان دانا هەر شەوەی شوتێکی بخۆن، هەتاچل رۆژان، ئەگەر چ خەبەرنەبو،شەوی ئاخیری هەلٚدێین دەرۆین. خوا نەبیٚ کەس پێنەزانی، خۆمیچمان لەپاش بەجیٚنامێنیٚ.

مەلا تەکبیری مەلاژنێی پیٚ باش بو.هاتەوەسەرەخۆولەلای دیکەوەئەگەریاس و خەبەری مەلای لەهەموجێگایەکی بلاٚوبیۆوەوهەرحیکایەت وباسی نشتوی مەلای وکتێبە سورەکەی بو،

بەلٚیٚ .چل تەریدەپاش گەرانێکی زۆرلێرولەویٚ ،ئاخرەکەی شەوێکی چون خەزێنەی پاشایان بری و بیست کولٚێان زێروجەواهێرات دزی،ئەوخەبەرەیان پیٚگەیشتبۆوەکەپاشا مەلای کتێب سوری بانگکردوەوداوای دیتنەوەی خەزێنەکەی لیٚ کردوە. لەوەزعی باسی مەلای وکتێبی مەلای ،دزان؟ دلٚیان کەوتەخرتوپرتیٚ:چ بکەین؟ چ نەکەین؟

پاش تەگبیرێکی زۆر، هاتنە سەرئەوباوەرەی شەویٚ نەفەرێکی بنێرنەسەرکولانەی مالٚەمەلای بزانن چ باسە؟ مەلا چ دەلٚیٚ باسمان دەکا؟ کابرای ناردبویان، دەگەلٚ گەییشتە سەرکولانەی، دەئەو،وەختەی‌دامەلاژن شوتێکی هێنا، کەئەوەلٚ شوتی لەچل شوتیەکان بولەپێش مەلای داناومەلا گوتی مەلاژن لەچلەکان ئەوێکیان هات ٠

مەلا دەگەلٚ چل شوتیەکانی‌بو.رەفیقی چل تەریدان بەخۆیان خالٚی بو.بەغارچۆوە کن گەورەکەیان وبۆی‌گێراوە:قوربان بەقورعان تەواونەگەیبومەسەرکولانەی مەلا فەرموی لە چلەکان ئەوە یەکیان هات. گەورەکەیان فکری کردەوە،شەوی‌دیکەدوکەسی ناردن، ئەودوکەسەدەگەلٚ گەیشتنەسەرکولانەی،مەلاژن شوتی دوهەمی لەپێش مەلای دانا. دیسان مەلاگوتی مەلاژن لەچلەکان ئەوەدویان هاتن.ئەودوکەسەش وەك شەوی پێشو، بەغارگەرانەوەبەگەورەکەیان راگەیاند:بابم بەخودای هیچ شتێك لەکن ئەومەلایەی وننابیٚ، ئەوی شەویٚ دی چووەراست دەکا. تەواونەگەیشتبوینەسەرکولانەی مام وەستافەرموی لە چلەکان ئەوەدویان هاتن. شەوی سێهەم، گەورەکەباشی باوەریٚ پیٚ نەدەکردن پیی وابوخەریکن فێلٚی لیٚ بەکەن.ئەوجاربۆخۆی چۆسەرکولانەی .کار ئەگەر راست هات راست

دێ. مەلاژن تێ گەڕاشوتیەگەورەکەی بۆمەلای هێنا، دەگەڵ مەلاچاوی بەشوتێ کەوت گوتی مەلاژن هی ئەوشۆلەهەموان گەورەترە! گەورەی چل تەریدان بەغارچۆوەکن رەفیقەکانی وهەموی خڕکردنەوە، :چ بکەین؟ بەخوای ئاشکرابوینە. تەواونەگەیبومەسەر کولانەی، مام وەستافەرموی هی ئەوشۆلەهەموان گەورەترە، سبحەینێ مەلابچێت وبە پاشای بڵێ، هەموانمان سەردەبڕن، دەی تەکبیر! تەکبیر! ساغیان کردەوەبەیانی زوبچن خۆدەماڵەمەلای باوێن. هەمویان ئەوەیان قبوڵ کرد،

بەڵێ بەیانی زۆر زوهەرچل کەس خۆیان دەماڵەمەلای هاویشت سەلام علیکم، سەلام علیکم . . . دەوخانوەچوکەی داچەندی کردیان چێگایان نەدەبۆوەگەورەکەیان، چو کەوشی مەلای ماچ کردوخۆی دە پشت مندالەکانی مەلایی هاویشت گوتیان مام وەستا بۆخاتری خوای ئەمەکردمان ئەتۆنەیکەی، بابم! خودا دەزانی هەربیست کولەکەم داناوە و چمان لێ خەرج نەکردوە، دەبێ بچی لەخزمەت پاشای شکوامان بۆبکەی لێمان خۆشبێت، مەلا لەئەوديمەنەی تەعەجوبی کردو دەمێکی تاسا:خوایە ئەوە چیە؟ لەچل تەریدانیش وابو ئەوە مەلا لەگەڵ مەلاییکان دەدوێ. دوایە هاتەوە سەرەخۆ:بەڵێ! ئەوە هەمانشتە، کەدەم هەوێ وپاشالێیویستبوم خەریك بوم لەترسانی هەڵێم، مەلا هەستا بڕێکی قسەبۆکردن وخۆی هەڵکێشا:بەقورئانێ لێمخوێندوە، پاشالەگولێوگرانترو پێبڵی لێی قەبوڵ ناکەم، هەرلەئەومەملەکەتەی نامێنم، ئێوەش بچونەوەلەجێگای خۆتان بحەسێنەوە هەتالەدواتان دەنێرم. چل ڕۆژبۆ سێ ڕۆژ پاشی سێ روژان مەلا کونەعەبای بەسەرشانی داداو.بەرەودیوانی پاشای وەڕێکەوت،کەگەیشتەجێ بەدەرکەوانانەوە.زەر نەبو یەکسەرچۆژورێ. دەرکەوانان هەرچەندگوتیان هەی ڕاوەستەڕاوەستە، بزانین چ کارێکت هەیە؟

مەلا، جوابی نەدانەوەوگوتی کورەبڕۆن هەی بێشعورینە، ئەمن کارم لەلای پاشای زۆر زەرورەوبەتالوکەم. لەگەڵ هەڵلایەپاشاهاتەدەرێ وتەماشای کردئەوەکێشەی مەلای ودەرکەوانانە،بەدیتنی ئەوديمەنەی کەزۆری پێسەیربوپاشازانی ئەگەرمەلا یەقین

کارێکی هەرکردوەبەخۆڕایی نیە، دەدەرکەوانانی ڕاخوڕی وگوتی ئیجازەی مامۆستای بدەن بابێتەژورێ.

مەلاهاتەژورێ وپاشا دەستی دە دەستی ناوبەخێرهاتنی کرد،وەزیرونایبەکانی لێی کۆبونەوەومەلایان بەخێرهاتن کرد.قاوەوقەلیان سەرف کرا،ئەوجارمەلا دەنگی بڵیند کردو ئاوادەستی پێکرد.

:بەڵێ قوربان پاشابە سلامەت بێ وبەرگی نوێت لێ موبارەك بێ، خەزێنەکەم دیتۆتەوەوداوام لەجەنابت ئەوەیە، هەروەکی دەپێشدافەرموت دەبێ لێیان خۆشبی چونکە بۆخۆیان ئاشکرایان کردوەو.خۆیان دەماڵەمن هاویشتوە، زیاتر عەرزێکم نیە.

پاشالەوخەبەرەی زۆرخۆشحاڵ بو،بەجورێکی دەپێستی خۆی دانەدەحاواوە، ڕوی دەوەزیرو نایبان کردو نەزەری لێ ویستن، هەموان ڕایان وابو کە دەبێ ئەوانەهەموان بە مەلای ببەخشی. پاشا ڕوی دەمەلای کردوگوتی جەنابی مام وەستای ئەمن ئەوەئەوانم بە تۆبەخشین جائەتۆش بۆخۆت دەزانی. مەلابەکەیف خۆشی لەدوای چل تەریدانی نارد،دەستبەجێ، چل تەریدەبەخۆیان وبەخەزێنەوە هاتنەحزور پاشای. پاشا برێکی زێڕ یاپوڵ دابەچل تەریدان وبەڕێ کردن لەبەردڵی مەلای، ئەوجارمەلاشی پڕکردومەلابەباغەڵی پڕەوە گەڕاوە ماڵێ ولەپێش مەلاژنێی دانا،جامەلاژن پێیگوت هەتا دەمری هەر بیخۆ، قەتت لێنابڕێ. ماوەیەکی زۆرمەلاو مەلاژن خۆشیان ڕابواردوتوانیان بەمنداڵەکانیان ڕابگەن و(زگیان تێرکەن وبەرگ وپێڵاوی باشیان بۆبکڕن) مەلاژن دەیگوت دەهەربیخۆ هێندەلەئەوکارەی ولەکتیب ونشتوان دەترسای.

ڕۆژێکی پاشالەدیوانێ دانیشتبو ڕوی دەوەزیرونایبان کرد.

وگوتی ئەرێ کوڕینەمەلابۆدیارنیە؟ دادەی بچون بانگیکەن! دادەی فەڕاشباشی، خەبەربەماڵێ بدە شێوێکی باشمان، بۆنیوەڕوێەبۆلێنێن و بلێ مەلامان میوانە،

فەڕاشباشی بەلایەکیداو دارۆغەبەلایەکیداهەرکەسەوەدوی کاری خۆی کەوت. نیوەڕوێەمەلا هات ولەسەرنانخواردنێ باس هاتەگۆڕێ کەپیاوێکی وەکومەلای حەیفە

مزگەوتی نەبێ پاشادەستوری بەغەزنەداری دا مزگەوتێکی لەفلانەمحەللەی بۆمەلای دروست کەن. بەمەلاشی گوت بۆخۆشت بەسەری ڕابگە. هەرکەم وکورپەکی هەی‌بوبەمنی ڕابگەینە، مەلائەوقسەی پێ خۆش نەبوورۆریشی پێ تێك چو، بەلاّم چارەی نەبوچاکیشی بۆهات بوو نەی دەویست تازەلەخۆی تێك دا.گەراوەبۆماڵێ پاش ماوەیەکی دەست کرا بە دروستکردنی مزگەوتێ، مەلاش تازە تێ هالاّبو، چۆن زانی باشە، ئاوای کرد هەتا مزگەوت تەواوبو لەهەموبارێکەوە نێومزگەوتێ بەجوانی وەکو

(دەرکەو هەمو،وەسایل پەنجەرە ، ڕایەخ و بەرماڵ)هەموڕۆژێ ڕۆژی خودایە، ئاوا جومعەبو،تەواوی خەڵکی ئەوشارەدێیەی بەفەقیرودەولّەمەندەوە ... پاشابەوەزیرو نایبەوەلەمزگەوتێ کۆبونەوەکەنوێژی جومعەی لەئەومزکەوتەنوێ یەی بەئیمامەتی مەلای کتێب سور بکەن. تەواوی خەڵکی، بەدەوروبەرەوەدانیشتن وچاوەڕوانی مەلای بون، زۆری نەکێشا، مەلای کتێب سوربەعەبایەکی تازە ومەندیل وئەنگوچکێکی سپی وەك بەفری،یەك شەوّە.وەژورمزگەوتێ کەوت لەگەلّ سلاّوکردنێ تەواوی حازریان لە مزگەوتێ لەبەرمەلای هەستان.مەلاچولەمیحرابی مزگەوتێ دانیشت وئەوهەموخەڵکەوپاشاووەزیرونایبانەی چاوپێکەوتن، قەتیش پێشنوێژی سێ‌کەسانی نەکردبو، هەرعەبەسا، خودایە چ بکەم؟ مەلاهەستا بڕێکی تەماشای بەری میچیی وکاریتەوئالّودارەکان کردو تازە قورەبان کرابو و باری زۆر قورس‌بوو؟هەرلەناکاو مەلا گوتی بڕۆنەدەرێ، مزگەوت ڕوخا، خەڵکەکەبە پەلەپەل ڕایان کردونیوەی کەوشیان وەدەست نەکەوتەوە، دەگەلّ دوایی خەڵکی کەلە مزگەوتێ هاتنەدەرێ، مزگەوت ڕوخاوتەپك بو. ئەوجاربەیەك جاری ئەوەی شکێکیشی لە مەلای بو، هیچ شکێکی نەما؟کەمەلا ؟وەلیەو ئاگای لەعەرش وکورسی هەیە.

بەلّێ ؟خەلّك بلاّوەی کرد هەرکەسەبۆلای مالّەخۆی ڕۆییشتنەوە؛ بەلاّم لەکوچەو کولاّن وهەمومالاّن، بەتایبەتی لەکانێ ژنان، باس هەرباسی کەرامەتی مەلای بو،

مەلاش چۆوەمالّێ لای مەلاژنێ وزۆریش خۆشحالّ بونەگەرلەنەوبەلاّیەش نەجاتی بو. چەند ڕۆژێکی مەلا بەئاسودەیی نانی لەئەوکی چۆخوارێ. ڕۆژێکی بەیانی پیاوی پاشای

هات وبەمەلای ڕاگەیاندکەپاشائەمری کردوە، تەشریف بێنی بۆسەراپەردەی پاشای. مەلا دەیزانی خەبەرچیە؟ خۆی بۆحازرکردکە چ بکات، ڕۆییشت بۆدیوانی پاشای.، دەرکەوانەکان پاش ئەوڕۆژەی کەهەڵلایان دەگەڵ کردبو، پاشائەمری پێکردبون ئیجازەی مام وەستای بدەن بێتە ژورێ، ڕێگایان پێنەدەگرت؛ یەکسەرەچۆژورێ، پاش سلاو وڕۆژباش وبەخێرهێنانی، لەحزورپاشای دانیشت،جێگای خۆی پێدەزانی قەدیم عادەت وابولەئەوجورەجێگایانە.هەرکەسەجێگای تایبەتی خوێ دیاربوەو.بۆخۆشی پێی زانیوە،پاش سەرف کردنی قاوەی،وقەلیان کێشانێ، هاتنەسەرباسی مەلای،ڕوی دەوەزیرو نایبان کردوگوتی دەبێ مزگەوتێ بۆمەلای چاك کەینەوە، ئەومزگەوتەڕوخا؛ مزگەوتێکی دیکە! مەلاچونکەزۆربەناڕەحەتی فکری لەمزگەوتەکەی دیکە نەجاتی ببو، ڕوی دە پاشای کردوگوتی قوربان؛ هەرجاری ئەوەڵێ عەرزم دەکردی، بەلام گوتم نەبادا دڵی پاشای شتێکی بحایشێنی،دەنا ئەمن مزگەوتم پێوەنایە بەسەری شیرنت سوێندەکە ئەگەر سەد مزگەوتیشم بوێ دروست کەی نوێژم دە ئێکێشیاندا پێ ناکرێ ودەڕوخێن جاکەوابو، نەچیدی خۆت ناڕەحەت کەو نەچیدیش زەرەرخوردە بە.

پاشا گوتی وەڵلاهی ئەمن نەدەخەمی زەرەرێ دام ونەدەخەمی ناڕەحەتێ دام. بەلام ئەگەرمزگەوتەکەنەبی فایدەی نیە، لێیدەگەڕێین. پاشاوازی لەمزگەوتێ هێنا هەتاماوەیەکی زۆر،مەلاش زۆربە خۆشی دەگەڵ ماڵ ومنداڵەکانی گوزەراندی وپاشاش هەتابەینێکی مەلای لەبیرچۆبووە، دیسان ڕۆژێکی لەدوایناردمەلا هات، دەستوری دا کە نیوڕۆژێکی باشمان بۆسازکەن، مەلامان میوانە، پاش نانخواردنێ، پاشاچۆدەرێ، هەرلە دەرکی دیوانێ، چاوی بەکللۆیەکی دەکەوی، کللۆی دەدەستی دەگری، پاشا دەڵێ ئەوە باشە ، لێیان دادێنم کەس هەڵی نادا ونایزانن پاشابەکللۆوەدێتەوە ژورێ کەبەڵێ کەس هەڵی نادا، ڕویان تێ دەکاودەڵێ ئەوە چیە دەدەستمدایە؟

یەك گوتی، یاقوتە؟یەکی دیکەگوتی، گەوهەرە، هەرکەسە شتێکی وایان دەگوت کە دەکرا دە دەستی پاشای دابا. مەلا کەنێوی ئەسلی«کللۆ»بودەپێش داگوتی ئاخری

توشی شتێکی هەردەبم،چاوی لەسەرێك دانابون و، لەبەرەخۆیەوە گوتی ئای کللۆ چەندم پیٚ‌گوتی (بفرە بفرە)ئێستائەوەلەبەردەستی پاشای‌دا (ترە ترە )پاشاچونکەلەمەلای نیزێك بوگویٚ لەقسەی مەلای بوهەرکللۆی فریٚ‌داوگوتی مالّت خەرانەبی ناهێلّی سوحبەتێکیش بۆخۆمان بکەین خۆئەمن لەتۆم دانەهێنابو،وای زانی مەلا بەتەواوی عیلمی غەیبی هەیەوزانی کللۆیەدە دەستی پاشای‌دایە، تەواوی وەزیرونایب هەمومەوتەحەیرمان لە زانینی غەیبی مەلای،بەئەوجورەی ئیحترام وقەدری مەلای رۆژدەگەلٚ رۆژیٚ دەچۆسەریٚ وپاشاش معاشێکی باشی بۆبرێنەوە، مەلابەخێروخۆشی و پاشابەعەدلٚ ودادخەریکبون، ئەمنیش هەر بەنوسین وپێداهاتنە وەکەی زۆر ماندوبوم.

## دوژمنایەتی گۆڕا بو بە دۆستایەتی

دوکەس پێکەوە دوژمنایەتیان هەبودوژمنایەتێکەشێان هەرلەسەرشتی جوکەبوە ئەودوە بۆسەفەرێکی دەچون، بەدوای یەکدا ئەورێگایەی ئەوان پێدا دەرۆیشتن رێگری لیٚبون و هەرکەس بەوێدا رۆیشتبایە.دەیان کوشتن یاروتیان دەکردن ئەودوکەسەئەو خەبەرەیان زانی بو،یەکێك لەئەودوانەکەبرێك زاناتربو، بانگی دوژمنەکەی کرد و پێی‌گوت ئەمەدوژمنین بەلاّم دوژمنی گەورەترمان لەسەر،رێیەیەواچاکە دوژمنایەتیەکەمان ئەلێرە دەبن ئەو بەردەی بنێین لەئەوسەری کەگەڕاینەوە هەر دوژمنی جارانین!

کابرای دوژمنی جونکە هەرنیگەران وزۆریش دەترسا.ئەوقسەی قبولٚ کردوپشتیان لێکبەست ودو سیٚ کەسی دیکە شیان رە گەلٚ کەوتن و بەسەردزان‌دا زالٚ بون و نەیان‌توانی ئەوانە، نەبکوژن نەروتیان کەن! سەفەرەکەیان تەواوبوو گەڕانەوە و گەییشتنەوەئەوبەردەی کەدوژمنایەتێکەیان دەبن‌نابو،راوەستان یەکیان گوتی جانەوجار بادوژمنایەتیٚ کەمان هەلگرینەوە.هەر ئەوکەسەی کەدە پێش‌داپێشنیاری ئەویەکبونەی کردبوگوتی جا ئەمە بەپشتیوانی یەکتری لەئەوسەفەرەی بەسلامەت دەرچوین چونکە دوژمنایەتیمان دە نێوانی‌دا نەمابو، تازە بۆ دوژمنایەتیٚ نویٚکەینەوە، ناوەللاّ با تازە خەلاّس بێت کابرای دیکەش قبولّی کرد و ئەو دو قارانجەیان کردن

١ـ دزنەیان‌توانی ڕوتیان بکەن ـ دوژمنایەتی کۆن کەدەنێوانیان‌دابوئەویش خەلاس بو

#### هەوای دەریێ چۆنە؟!

دەزانم لەبیرتان ماوەلە ساڵەکانی هەزاروسێ سەدوسی هەتا هەزاروسێ سەدوچل وپێنجی باری گەنم و جۆی لە سی تمەنی ڕامەتاچل تمەنی بو،

دەئەوسەردەمانەدابو توتنیش کەم دەکرا،چەوەندریش نەدەکراچونکەماشێن بۆبارکردنێ وەدەست نەدەکەوت هێندێك لەئاغاکانیش پشت ڕەق دەرهاتبون وکاسپیان پێ‌نەدەکرا،چونکەکاسپی ئەودەمیش بەکەڵ وگاجوتی وکێشانەوەی بەعارەبەو. وشتران بەڕاستی زۆر زەحمەت بو، هەرچاویان لەدەستی کرمانجان بو،لەبەرئەو هۆیەی، زۆرتری ئاغاکان موحتاج بون وهەرچی لەتوتن وچەوەندەرێش ئەگەرهەباو .وەدەستیان کەوتباهەتا لەشاری خەلا سیان نەکردبایە؟جابەهەرجورێکی باعادەت وابوەقەت نەدەهاتنەوەماڵەخۆیان،

بەتایبەتی یەکێك لەئەوئاغاڕوتانەلەزستانێدا،چونکە شلکەبڕوێش زۆرلێ‌دەندرائەویش لەڕۆژانی ساردی جستانێ دا .ئاغاش سەرمای بوکورەکەشی بەکەمران واگەرم داهینابو هەر پڕیشکی داویشت وبڕوێشەشلکەشی زۆرخواردبو هەروەك ڕەشکەی هەڵموسابو.بێ کاربی وبەسەرمایە شلکەبڕوێشیش زۆربخوی. دەنێونەووەتاغەیداهێندەی لێ برببوئەو وەتاغەچوکەی پڕکردبو ولاتی واقانگ دابوکەلێن وقوژبنیشی پڕکردبو،نۆکەرێکی هەبو دەگەڵ لەدەرێ ڕا دەرکی کردەوەوبۆنی ژوریێ بۆهات وئاغا لیێ پرسی ئەرێ هەوای دەرێ چۆنەچەدەباری، نۆکەرەکەلەبەرولامی ئاغای نەیتوانی دەرکەی پێوەداهەتائاغا،لەلەقسەکانی خەلاس بوبەبۆنی ژوریێ وەختابوفاقێ سەری بچی وئەویش دەولام داگوتی جا ئاغا.ئەگەرهەوای دەرێش وەکوژوریێ بی دەبێ لەدەرێ حەتمەن گووبباریێ .

**(هاورێی کەم بێژ)**

دوکەس بە ڕێگایەکیدا دەڕۆیشتن، یەك لەئەودوانە زۆری قسە دەکردو نەیدەهێشت ڕەفیقەکەی قسان بکات، هەر بۆخۆی قسەی دەکردولیێ نەدەبڕێوە هەتا گەیشتنە سەر کانیەکی کابرای کە زۆری گوتبو،ماندوش ببو لە ڕێگایە وتینوو، توشی کانیەکی بون وکابرا ؟یەك بین دمی بە ئاوێ وەنا، کابرای ڕەفیقی بەهەلی زانی ویستی دئەو وەختەیدا قسێکی بکات، کابرا دمی بە ئا وێ وەبو، لاقی ڕادەوەشاند،بە ئیشارەدەیگوت ڕاوەستە با ئەمن ئاوێ بخۆمەوە جا بۆتدەگێڕمەوە.

شێعری(هاوڕێی کەم بێژ)

دو کەس هاوڕێ بون دەچون بۆ سەفەر
یەك هەر قسەی کرد بێ نوبە یەکسەر
لەبە ر زۆربێژی،و ڕێگا و ماندوبـــــون
کەمێکیش هەورازو زۆریــش تینوبون
گەییشتنە کانیەك ئەو کابــرای زۆر بێژ
هەر پێی دانوسا و لینــگی کرد درێژ
هاوڕێکەی د یکەی زانی فرســـــــەتە
ویستی قسێکی بـــــکا لەو وەختە
تێی گەیشت زانی خەریـــــکە هاوڕێ
قسێکی بکا یان لە شتێــــــك بدوێ
لاق ڕاوەشاندن، بە ئیشارەی دەست
هاوڕێی حاڵی کرد تێیگەیاند مەبەست
گوتی ڕاوەستە ئاوێ بخۆمـــــــەوە
دوایە شیرینتــــــر بۆت بگێڕمەوە

## هەڵی‌نەدێری

دەگەڵ چەرمەسەری ڕۆژگارو چەوسانەوە لە ژێـر بـاری زوڵمـی زاڵمـاندا، تەمەنیشـی ئەوەندە تێ پەڕی بو کەچاوەکانیشی هیچیان نەدەدیت وبەتەواوی کوێر ببو،

کوڕەکەی نیوەشەوی هینای بابی سواری بارەبەرێکی وەکو گوێ درێژ یان ئەسپێکی کردو بەینی شەوو ڕۆژان بردیە جێگایەکی وەکو دوندی بەردی گوێزێ کە لە ناوچەی مـەدا جێگایەکە ڕەوەزەو هەرچی لێی هەلدێری هەپرون بەهرپرون دەبێت داینا،

بابەکەلە کوڕەکەی پرسی:ڕۆڵە ئێرەکوێیە؟

کوڕەکەدەڵێ ··ئێرە .ئێرەسەردوندی بەردی گوێزێیە.

بابەکەدەڵی باشەئەمنت بەئەونیوەشەوەی بۆ هێناوەتەئێرە··،

کوڕەکەدەڵێ بۆیەم هێناویەتە ئێرە هەتا لێرەڕا هە ڵت دێرمەخۆاری ؟

بابەکەی قاقا پێدەکەنیت!

کوڕەکە :دەڵێم هێناومی لێرەڕا هەڵتدەدێرم خۆقاقا پێدەکەنی.

بابەکە دەڵی ئەمن لـەبەر ئەوەی پێ‌تاکەنم.

کوڕەکە دەڵێ ئەدی بەچی پێ‌دەکەنی؟!

بابەکەی دەڵێ ئەمن بە وەی پێدەکەنم ئاخرئەمنیش بابی خۆم لێرەڕا هەڵداشتە خـوارێ! ئەگەر بابەکەی ئەوقسەی کردو کوڕەکەگوێی‌لێبو بڕێکی فکر لـەئەوقسەی کردەوە،وکوتی وەڵاهی ڕاست دەکا،بـابی سـوار کـردەوەو هێنایـەوەماڵێ، هەتابـەمردنی خـۆی مـرد هـەر خزمەتی کرد، گوتی، با کورەکەی منیش ئەمن لێرەڕا هەلنەدێرێتە خۆارێ.



## کەوڵـە گوێلکە

ئەو ژن و مێردە پاش سەروبەربونیان بە بێ هەڵـلاَ و بەزم و بە بێ ناڕەحەتی ژیـانی ئاسایی خۆیان تێ پەڕدەکرد،دەنێو قساندا هەر قسەی دەکەوت، مرۆت دەیگـوت پەحا، ئەمن ئەوجورە ژنانەم پێ شێتن بە هەوێی ناڕەحەت دەبن!

بە مەرگی ئـەو تاقـە برایـەم، کـابرای مـن دوژنـانیش بێنیـت لـەجێاتی ژنێکـی ئـەمن ناڕەحـەت نـابم ودەخەیاڵیشم نایە، کـابرای مـێردی دەباڵـە خۆیـدا گوتـی بـا ئەوژنـەی تاقیکەمەوەبزانم هەتاکوێی ڕاستەیاهەربۆفریودانی منەخۆمن خەیاڵی هیچم نیە؛

زۆربەبێدەنگی هینای کەوڵەگوێلکێکی فوداوبرِێکـی بـەرگی جـوان وەکوبوکـان سـپی دەبەری کردو نەی هێشت ژنەکەی بزانیت پاڵی پیۆوە کۆڵـەکەیداو.داینا،

مرۆت ئەگەرهاتەوەماڵێ لە مێردەکەی پرسی:ئەوژنە کێیە؟!مێردەکەی گوتی ئـەدی بۆخۆت نەتدەگوت لەجیێ ژنێکی دوژنانیش بێنی ناڕەحەت نابم، ئەو ژنەم هێناوە.،

مرۆت مات بووچینەگوت،برێك هات وچووبەبیانوی برەکارێکی بێهودەئاو هینانێك.. ئاورێکی وێداوگوتی دەزاری بابی خۆت ڕیبیت خۆزارم لێ خوار دەکاتەوە!

خات مرۆت برێکی دیکەش هات و چووبە پێش کەوڵە گوێلکی دا بە تونـدی تێپەڕی، خۆی سـەرەنگرێ کـردو ڕاوەسـتا :ئایـاڕۆ! خـۆ لاقـم وەبـەرلاقی هـەڵدەدا جاییەحـەی جانەوەکواحاوانەوەی دەگەڵ دەکرێ ؟

کابراش بـەجوانی لـەدروی ژنەکـەی حـاڵی بووگورجێکـی هەسـتا پـەرۆپاڵی لـەبەر گوێلکی داکەندو گوێلك بەجوانی وەدەرکەوت و ڕوی دە مرۆتێ کرد وگوتی ماڵ خەرانـەبو ئەوە خۆ کەوڵە گوێلکە کەوڵە گوێلك ژنی چی.

مرۆت ئەگەرکەوڵەگوێلکی دیت ئیدی لەبەرخەجاڵەتی ودرۆکانی چی پێ نەگوترا!



## کوڕە کەچەڵە

ڕۆژێکی کوڕە کەچەڵێکی عەجەم دەچێتە دێیەکی؛لە قەراغ ئەو دێیەی کانیەکی زۆرخۆشی لێ دەبیت، دەگاتە سەر کانێە وخەریکی ئاوخواردنەوەی دەبیت کچێکی زۆر جوان بە نازو عیشوە.وبە گۆزەوە دەگاتە وێ کەئاوێ هەڵێنجێ وبەرێتەوە، کەچەڵە لیێدەپرسی ودەڵێ (بوکەندن ئادی نەمەنادی)؟ کچە ولآمی داوە وگوتی خۆجە.

کەچەڵ (چوخ خۆش کەنددی)، وەلی ئەفسوس بوکەند قانە توشار! کچەکە. ئەگەر ئەوەی گویّلێدەبیت، چونکە زۆری دڵ بە دییەکەی خۆشبوەلیێ دەپرسی ودەڵێ (نێیە قانە توشر؟نەئۆلۆپ)؟، ؟،

کەچەڵە دەڵێ (مەن سەنن ئویزوننان ئوێپەرەم، سەن دە هـای سالرسەن، سورە کەندن خەلقی یغیشر مەنی ئولدورەجاغلار، بوجور قانە توشار)؛

کچەبرێکی بیرکردەوەولەسەرەخۆ گوتی کەچەڵ ؟( سەن مەنی ئوپپەسەن مەن هـای سالمیم نەئولور،) کەچەڵ :(ئوندا.هێش زاد ئولمور).بەڵی کەچەڵ وکچەئاواپێك هـاتن وخەلآس‌بووکەچەڵیش بەمەرامی خۆی گەیشت ودییەکەش خوێنی لێ نەڕژا.

## سەکول تۆ پیاوە

کابرایەك بەخۆی وبابی، خوشکێکی هەبومالی دونیایەش ماینە بۆرەیەکیان هەبو سەگێکی قولەشیان لەدەرکێ بو.کابرا بۆ کار کردنێ دێ بۆ ولآتی مە، ماوەی دو سالآن لەئەولآتەی دەمێنێ تەوەو خەبەری ماڵیشی نابیت دوای ئەو وەختە ڕۆژێکی توشی پیاوێکی خەلکی دێیەکەی خۆیان دەبیت وادەردەکەوێ ئەویش هەربۆکارێ هاتبێ، پێك شاد و شوکر دەبن وچەشادوشوکربونیك ؟لیێ دەپرسێ و

:دەی ماڵی ئێمەچۆنن کابرا:بەخواباشن. :هەمو ساقن؟ :ئەرێ بە خوا.

:کەسمان نەمردگە؟ :نە بە خوا! :کەسمان نەخۆش نیە؟ :نە بە خوا!

کابرا بەکاوەخۆ وپاش هەموقسان وکەمێك بێ دەنگی دەڵێ سەکول تۆپیاوە؟

ئەویش دەڵێ سەکول کابرا:ئەرێ ئەویش دەڵێ جا سەکول بۆ تۆپیاوە؟

:لەسەرکەلاکی ماینەبۆرەسەگان خینکاندویانە؛ ئەیی بەخوا حەیفە؟

دەی جاباوە ماینەبۆرە بۆ تۆپیاوە؟!

کابرا:بەخوای چەبێژم لە بن کەلاکی باوکت دا پساوە! ئەوفەقیرە هاواردەکاو ئەی قورەسەرخۆم باوکم بۆ ئەی باوکەڕۆباوەڕۆیاوکەگیان؟!کابراش لەسەرێك مزگێنی خۆشتری دەداتێ ودەڵێ لە سەر کەجانی خوشکت داپاچراوە؛

ئەوجارلێی قیت دەبێتەوەودم وچاوی پڕدەکالەتف: بەگریانەوە دەڵێ ئەی کێمان ماوە؛ بۆ ئێژی کەستان نەخۆش نیە و کەستان نەمردگە خۆکەسمان نەماوەگەماڵ باوکی درۆزنی باوەحیزتۆئێژی کەستان نەمردگە وکەستان نەخۆش نیە٠٠!

## خرچەی چۆن دەخوا

کابرایەك زۆری ئیشتیالەخرچەی دەبێ ودەچی لەنێوبارێکی خرچێکی هەڵدەبژێری ودەگەڕێ ودەچێ لەجێگایەکی بڵیندلاقی داوێتەسەرلاقی وبەفیزدادەنیشیت خرچەکەی دێنێتەپێشەخوێی توێلکەکەی زۆرئەستورسپی دەکادەڵێ بابڵێن ئاغایەك لێرەخرچەی خواردوە؟

بەڵێ خرچەی دەخواوئاخروەلایەکی زگیشی ڕاناگا.

تیرناخواوپێ دادێ توێلکەکانیش هەموبەجوانی دەکڕوسێتەوەو دەڵێ بابڵێن ئاغا نۆکەرێکی دەگەڵ بوە.

دیسانیش تێرناخوائەوجارتوێلکەکانیش دەخوادەڵێ بابڵێن ئاغاکەرێکیشی پێ بوە،

ئاخرکەمتر وامەیە پیاوبەمیوەی تێربخوا تێرناخواو؟دەست دەکا بەتۆوقرتاندنێی تۆوەکەش هەمو دەنك دەنك دەقرتێنی ودەڵێ بابڵێن ئاغاکەڵەبابێکیشی پێ بوە؟

## پیاوی نامەرد رێوی گونانی دەخوات

مام شەخسەو،شەختۆو،پێکەوەبەرەفاقەتی دەسەفەرێ دابون دیاربو رێیەکی دوریان دەپێش دابو،یان هەرگەرِیدەبون، هەرکەسە بەشی خۆی برەنانێکی پیٚبو؛

وەختێکی برسی بون شەخسەبەشەختۆی گوت باجارێ هەرلەنانێکی بخۆێن باخەسار نەبن. دەپێشدا بانانی تۆبخۆین، ئەگەر خەلاس بو دوایە نانی من دەخۆین·

بەلێ ئەو پیاوە بێفێل بو، قسەکەی لێ قەبولّ کرد، نانی شەختۆیان خوارد چەندجاران هەتا خەلاس بو، دوایەشەختۆ روی دە شەخسەی کردوگوتی نانی من خەلاس بو ئەوجاربێنەبا نانی تۆبخۆین؛ شەخسەدەلێ نەخێرئەمن نانی خۆمت نادەمێ! شەختۆ :جاچۆن نانم نادەیەی؟! : چۆنی دەوێ ؟ناتدەمێ نانی خۆمە.شەختۆی فەقیر:چون ئەتۆ هەتا نانی من خلاس بوەنانت دەگەلّ خواردوم ئیستا دەلّیی نانت نادەمێ؟!:نەخێر نانی خۆمت نادەمێ. ئەوەی گوت ونانی دەست دایەو هەستا لیێدا رۆیشت.شەختۆی بێفێلّیش بەبرسیایەتی لەوێ ماوە، ئێوارەبو، رێگای بۆ چ جێگایان دەرنەکرد، کەمێك رۆییشت ئاشێك وەدەرکەوت زۆرخوشحالّ بو بەخوێ گوت ئەوشوّلەئەوئاشەی دەمێنمەوە نانیش پەیدادەکەم وبەیانیش خواگەورەیە،روی دەئاشەکەی کردووەختێکی گەیشتێ وچۆ بەردەرکەی دیتی وگوتی ئەی ئەی کورەخۆچۆلە·چارەی نەبوچۆنێو ئاشەکەی وشەو بەسەردەستان‌دا هات وتاریکایی پەیدابو،کابرا وەنیگەرانی کەوت وگوتی هەیاران نەبادا درِندەیەك،شتێك پەیدابێت، بەبرسیاێتی بشخۆرێم بالەجێگایەکی خۆ بشارمەوە، چولەبەرزەلانەی ئاشیدا خۆیشاردەوە، دوای خۆشاردنەوەی دەنگەدەنگ پەیدابو گوییلێبوگورگ و رێوی و ورچ پێکەوە قسەیان دەکردن و زۆریش کەیفخۆش بون وپێ دەکەنین و،لە مام ریویان پرسی:ئەرێ ئەتۆ بۆ وا کەیفخۆشی خۆقەت وانەبویە ؟

رێوی:لە فلانە جێگایەی ئەوە بانبانکیك لە بەیانیرا هەتاکو نیوەرۆیە لیران دێنێ تە دەرێ ولەبەرتاوێ هەلّیان‌دەخات ولەنوێژ یش را هەتاکو ئێوارێ دەیانباتەوەژورێ، هەر سەیرێ ئەو بان بانکەی دەکەم بۆیە کەیفم وا سازەوهیچ ئاگام لەدونیایەنیە.

ئەوجارڕوویــان دە گورگــی کــرد:ئــەدی ئــەتۆبۆوا کەیفخۆشــی چــت کــردوە؟!
گورگ دەڵێ؛ ژنی پاشای شێت بوەوکەسیش دەرمانی نازانی تەواوی مەڕوگاڕان وبەرغــەل و ... بەرەڵلانە، هەرچی پێم خۆشبیت ئەوی دەخۆم بۆخۆم سەرپشکم؛
دوایە لێیانپرسی:جا ئەوەکەدەڵەی ژنی پاشای شێتبوەدەرمانی هەرنیەیانای زانن.
گورک دەڵێ دەرمانی هەیە. وکەس نایزانی ؟لێی دەپرسن چاکەدەرمانی چیە؟!
گورگ:ئەوەبــەرانێکی شــینبەش دەگــەڵ مــەڕی ماڵەپاشایەبیکوژنەوەوبەمێشــکی ئەوبەرانــەی تــەواوی بــەدەنی ژنــی پاشــای پــێ چەورکــەن وکەمێکیشــی دەڕۆنــی دابــۆ سورکەنەوە، بیخوات چاك دەبیتەوەوحەلەمی لێ دەبڕێ.
:ئەدی مام ورچ ئەتۆ چۆنــە وا شــادی؟ ورچ:لــە فلانــە جێگایــەی کانیــەکی لێــیە لــە بەرەوەی کانیەکەی، شەش، حەوت داری لێن، لە بن ئــەو دارانــە حــەوت کوپــە خەزێنــەی تێدان، لە بن دارە گەورەکــەی دادەنیشــم، بۆنــی ئەوخەزێنــەم بــۆ دێت وادەزانم تــازە لــە دایکی خۆم بە وەلــەدبومە.

بەڵێ ڕۆژ دەبێتەوەوشەختوی دڵ ودەرون پاك زگی تێردەکات ودەچــی دێارنــەدیاری بانبانکی دادەنیشی وبــەبێ دەنگــی، هەرکــەدیتی ئــەوەبانبانك،لیرەکــان دەباتــەوەژورێ، غار دەداتەبان بانکێ،وهەمولیرەکانی کۆدەکاتەوەودیان باتــەوەماڵێ یاجێگایــەکی دیــاری کراو؛ ئەوجاردەچیت کوپەخەزێنەی بن داران دەبینێتەوە،ئەوانیش دەردێنی،دوایــەوەدوی پێ وشوێنی ماڵە پاشای دەکەوی ئەوەیە تەماح قەت پڕنابێ ودەچێتەماڵەپاشــای ودەڵــێ ئەمن حەکیمی شێتانم؛ پاشا دەڵێ ئەگەرئەوژنەم بۆچــاك کەیەوەهــەرچی لێت بوێم دەت دەمێ و ئەگەر چاکیشی نەکەیەوەلە سەرت دەدەم قەراری من ئەوەیە؛جائەگەرپێت چــاك دەبێتەوەدەست بەدەرمان کردنێ بکەو،دەناخۆبەهیلاك مەدە،کابراش هەربەقسەی گورگی گوتی زۆرچاکە.ناردی بەرانیان هێناوەوگوشتیانەوەومێشکەکەیان دەرهینا تەواوی بەدەنی ژنی پاشای پێ چەورکردودەستوریشی دابڕێکی لەئەومێشکەی بۆسورکەنەوە، ئەویشیان سورکردەوەو دایان بــە ژنــی پاشــای و خــواردی و پــاش چــەندڕۆژێکی چاك بۆوە؛ پاشا

هەرچەندی شەختۆ ویستی زیاتریشی دایە،هەردەوچەندرۆژەی دا توشی شەخسەی ڕەفیقی بو(ئەگەر نانی نەدابۆیە) کابراکەئاوای چاوپێ کەوت ئەگەردەوڵەمەندبوە، لێیپرسی:ئەوەئەوهەمولیرەوزێروپوڵەت لەکوێ وەدەستکەوتوە؟!شەختۆوکەهەروابە دڵپاکی وبەبێفێڵی بۆیگێراوە،کۆنەئاشەکەشی پیگوت کەلەکوێیەوهیچ بیرێکی ناحەزیشی لێ نەکردەوە،کابرای نامەردچولەجێگای شەختۆی خۆی مات کرد وپاش چەند شەوان جانەوەر خڕبونەوە،بەلأم بەپێچەوانەی جاری پێشو، هەمویان تورەوناڕەحەت بون، هەریەکەی لوتی دە لایەکی بو ڕویان دە مام ڕێوی کرد:ئەرێ مام ڕێوی بۆواغەمگینی؟!

: جا چۆن غەمگین نەبم؛ نە بانبانك ماوەو نە لیرەسەیری چەبکەم!

:ئەدی مام گورگ ئەتوبۆوا تێکچویە؟: جاخۆ ژنی پاشای چاك بۆتەوەوهەموماڵات بەساحێب بونەتەوە بە سەوری سە یانیش تخون مەڕوبەرغەلم ناکەن

دەڵێن وەللا مام ورچ ئەتۆش وا دیارە نارەحەتی، ئەتۆ بۆ؟! :

خەزێنەکانیان دەرهێناون؛ هیچ کەیفم نەماوە خۆئێستا ناچمەبن دارەکانیش،

دوایە خۆبەخۆ گوتیان ئەوشەوەی پێکەوەئەوباسەمان کردوەئێرە کەسێکی لێبوە ئاوا لەمەحاڵی بوە بنیئادەم شیری خاوی خواردوەوتەماعی زۆرە، ڕەنگ بێ بۆ قسە و باسی د یکە هاتبێتەوە، با ڕاوێکی لێدابەشین بزانین تۆڵەی لێ ناکەینەوە،

ئەوانە هەستان ڕاوی لێ دابەشن وکابرای نامەرد لە ترسان چۆ دە دۆلاشی ئاشێوە؛ ورچ دیتێەوە بەلأم دە دۆلاشیێوە نەدەچو، ئەوجار گورگ لە سەرەوەڕا بۆی شۆڕ بۆوە، شەخسەداخزا خوارێ و هەر بەداران دە لمبۆزی گورگی دەکوتا، دەگەڵ هەلأت هەلأت وخۆشاردنەوەی وخۆڕێخشاندنێ پاتۆڵیشی هەمو دڕابوو.هیچی بەلاق ولەتەران وەنەمابو، ئاگای لەخوارێ نەبو لەترسی گورگی، هەتالەبنەوەڕا مام ڕێوی هەردوگونی خواردن وئەوبەشی خۆی تۆڵەلێ کردەوە کابرا ش چی وەدەستنەکەوت هیچ ڕێویش گونی خواردن ،جا لەبەرئەو حەکایەتەیە،کەدەڵێن پیاوی نامەرد ڕێوی گونانی دەخوات.

*****

**خودای ئەرزیٚ**

وەکی مێژو بۆمان دەگێڕێتەوە لە زەمانەکانی پێشودا مەغولیەکان وەکو چەنگیز و هەلاکۆو تەیمورە شەل، خەڵکێکی زۆریان کوشتبو کە دە حیساب نەدەهات،جا ئەمە کارمان بەئەو حەکایەتە دورودرێژەی نیە؛ بەلاّم لە زەمانی هەلاکۆخانی مەغولدا کابرایەك لە دەشتی خۆراسانیٚ زۆر سەری حالٚ دانیشت بو وەکو چ نەکرابێت، کەچی هەلاکۆخان چ ولاّتی نەهێشتبوئەوەندەی خەڵك کوشت بو،هەردە حیسابیش نەدەهات؛

وەختێکی لەشکری هەلاکۆی گەیشتنەدەشتەکەی وکابرایان دیت ئەوەدانیشتوە، هەلاکۆخان ئەگەردەیبینی ودەلٚیٚ ئەوەکێیەئاوا بیٚ خەم دانیشتوە دابچون بی هێنن بزانم چەکارەیە،چەند کەسێك چون لیٚیانپرسی:ئەتو چ کارەی؟

کابرائەگەرئەولەشکرەی دی زۆریان لیٚ ترسا.هەربەسەرزاری داهات وگوتی ئەمن خودام!

دەلێن چۆن خودای؟! دەلیٚ بەلیٚ ئەمن خودام.

نەیان وێرادەستی لیٚ بدەن یاهیچی پیٚ بلێن ئەو خەبەرەیان بە هەلاکۆی گەیاند، هەلاکۆ بۆخۆی هات و لێیپرسی ئەتو چ کارەی؟

کابرا گوتی ئەمن خودام؟خودای ئەرزیم.

هەلاکۆدەلیٚ دەتوانی سابیتیکەی؟

کابراپێوەبیوکەوتەفکران وگوتی چ دەلێن بۆو وەدیبێنم! هەلاکۆ دەلیٚ ئەمەپیاوێکمان هەیە زاری چوکەیە، برێکی بۆگەورەکەوەوهەرئەوەندەمان لەتۆ دەویٚ؛

کابرا : ئەمن دەگەلٚ خودای ئاسمانیٚ قەرارمان هەیەهەر کەسێکی هەر کونێکی لە پشتێندبەرەژێری هەبیت چوکەبیٚ وداوابکات ئەمن بوٚی گەورەی دەکەم بەلاّم کونی لەپشتێندی هەوراز ؟کاری خودای ئاسمانێیە و ئەمن دەخالەت دە کاری خودای ئاسمانیٚدا ناکەم دەبێتە موداخەلە.

هەلاکۆ،شوکر ،زۆری پیٚ پێکەنی وبەسەلامەتی بەجێیان هێشت.

******

**نەخواردوو لە سمێڵان مەیوو**

کابرایەك ژنێکی زۆر جوانی هەبو، ئەو ژنە چەندە جوان بو، ئەوەندەش بەناموس‌بوونەوەندەشی مێردەکەی خۆش دەویست، هەتیۆیکی خوێرپلە لەکۆڵی نەدەبۆوە، ڕێی‌پێ‌دەگرت و لەبەری‌دەپاڕاوە و ... ژنەش لەبەر حەیای خۆی هەتا ئابڕوی نەچیت، ڕۆژێکی لەگەڵ مێردەکەی باس‌دەکات کە فلانە هەتیوەڕێگام پێ‌دەگریت و لەکۆڵم نابیتەوەدەترسێم ئابڕۆم بەریت؛ کابراش دەگەڵ ژنەکەی ڕاوێژێ دەکەن ودەڵێ بە هەرجورێکی بێ بی هێنیتە ماڵی جادەردی دەزانم.

بەڵی؛ هەتیودیسان ڕیی پێ‌دەگریت. :ئەرێ ئاخر دڵم‌تۆقی، مردم لەسوێیانت؛ ڕوحمێك ... !

ژنە: هەرلەکۆڵم نابێەوە؟! هەتیو:نەبەخوای، یان دەبی قەولم پێ‌بدەی یان لە سەرەتۆ دەبێ بکوژرێم. ژنەبۆئەوەی خاترجەمی کات و،نیگەرانی نەمێنی دەڵێ ئاخر ئەگەرنەتۆ قەولم پێ‌بدەی ڕازم لەلای کەس ئاشکرا نەکەی و هەر لە لای خۆت بێت، ئەودەمی ئەمنیش قەولت پێ‌دەدەم. هەتیو:هەروەکی دەڵێم یان دەبێ قەولم پێ‌بدەی یان لەسەرەتۆ دەکوژرێم. هەر ئاواش قەولت پێ‌دەدەم، لە خۆم و لەخۆت زیاترکەس نەزانی. ژنە:زۆرچاکەئەوشۆمێردەکەم لەماڵێ نابیت لەسەرنان‌خواردنێ وەرە.بەڵێ هەتا ڕۆژ ئاوابو و شەوداهات هەتیو.وەختابوشێت بیت هەر بەتەواوی تاریك نەببو،خۆی دەماڵەکابرای هاویشت، ئەو ژن و مێردە کارەکانی خۆیان زۆر بە جوانی ڕێز کردبون. هەتیو کە لە دەرکەی‌دا ژنە دەرکەی لێ‌کردەوەو خەریك بوڕاماڵی بۆبەریت ژنەبۆخافڵاندنێی پێی گوت ئەتۆ بۆوابەتاڵوکەی؟! هەتابەیانی نامێڵم بڕۆیەوە،خۆهەمورۆژێ گولەم ناچێتەسەفەرێ وئەتوم وەدەست کەوێ!بەئەو جورەی نەیهێشت دەستی لێداو گڵاوی کات هەتیوبەئەو قسانەئەرخەیان‌بووبێ دەنگ دانیشت،هەر پاشی دانیشتنی وی لە دەرکەیان‌دا، ژنە زانی مێردەکەیەتی بانگی کرد:کێیە ! :کابرای مێردی وڵامی داوە و وگوتی ئەمنم ژنە:حا کوێرا هاتیەوە؟! مێردەکەی: بڵێم‌چی بۆم جورنەهات! ژنە:ڕاوەستە ئەوە لە سەر جێ‌نوێژێم

ئێستا دێم. هەتیودەڵێ جاچملێدەکەی خۆ.خانوبەرەی ئەوسەردەمی بەتایبەتی ماڵی فەقیرهەردیوێکیان هەبوو چەدیوی دی بەسەرەوەنەبو؟ژنە:چتلێبکەم؟!هێندێکیان بزن دەلایکی ژوریٚ کردبون وگوتی شمەکانت فرێدە هەرئەوکراسە ڕەشەت با دەبەردابیت و بچۆ نێو ئەوبزنانەئەگەرنوستین ئەتوش دەرکەی بکەوەوبڕۆ. هەتیو بەناعیلاجی بە قسەی ژنەی کردوچۆو نێوبزنان و ژنە دەرکی لە مێردەکەی کردەوە، هاتە ژوریٚ و لێی پرسی بۆ وازوهاتیەوە، قەرار نەبو سبحەی نیٚ پاشنوێژیٚ بێیەوە؟! کابراگوتی وەڵلا کارەکەم بۆجورنەهات ئەومام کابرایە هەرلەماڵێش نەبو، هەتاسبحەینیٚ لەویٚ چمکردبا؟!

ژنە:باشە دەی. کابرا هێندە دانانیشی وهەتیویش دەنێو بزنان دادبینیٚ بە ژنەکەی دەڵێ ئیشتیام لێیە باکارێکی وابکەین،ژنەش هەروەکی قەراری دایان نابو..برێکیشی زیادکردو :ئەریٚ ئەوەبۆ هەرچاوت پێم کەوت وئیشتیات دەشتیٚ هەموڕۆژیٚ بەئەوئاوە ساردەی نەحەمامێك ونە...خۆم پیٚناشۆریٚ نابی،کابرا.برێکی لەبەر دەپاڕێتەوەژنەخۆی بۆڕوت دەکاتەوەوەولەپێش چاوی هەتیوی ئ...ی خۆشیان کردو،پاش دەموکێکی دیسان داوالەژنەکەی دەکا:بەخوای نابی .کابراش:بەخوای نەمدەیەی ئەوجاردەچمەزگ ئەو بزنانە! ژنە :کەیفی خۆتەچەدەکەی بکە!کابرا دەچێتە نێو بزنان وەبەر هەتیوی دەنیشیٚ وکاری دەگەلٚ، تەواو دەکات ودوبارەی دەکاتەوەو لەجاری سێهەم دیسان بە ژنەکەی دەڵێ با کارێکی وا بکەین!ژنە هەروای جواب دەداتەوەو:کوێڕادیسان ئیشتیات چوێەودەڵێ بەخوای نات دەمیٚ کابراش هەروا دەڵێ نەمدەیی ئەمنیش هەروادەکەم .ژنەش دەڵێ چ دەکەی بکە،بۆجاری سێهەم کەهێرشیٚ بۆهەتیوی دەبات مەمنابەزەبری دوجارەنارەحەت ببو هەموشتێکی لەبیردەچیتەوە دەبالەخۆیدا گوتی ئەگەرئەوجاریش تخونم بیت ئەو سەگبابەدەمکوژێت،ئەگەرکابرا لێی نیزێك بۆوە هەتیو دەڵێ بۆسەگ باب هەرئەمن بزنم،

ئەوەیە سەرئەنجامەی ناپاکی وتەماح دەناموسی خڵکی کردن؟!...



## وای تێخێرە

چۆبوە خوێیە لە گەڕانەوەیدا دە چۆمـی کـەوت، کەرەکـەی خینکاویەکورتانـەوە بـە چۆمی دا ڕۆیشت و خوێیەکەشی بوّە بە ئاو،بەناعیاواج بە سەڵتی گەڕاوە بۆماڵێ

دایك بێخەبەر لەهەموشتێکی، لێی دەپرسی:ئەدی ڕۆڵە کوا کەر و بارت؟

کوڕەکـە دەڵـێ دایـە گیـان کەرەکـەم لێ دە چۆمـی کـەوت و خینکاویـە کورتانـــەوە دەگۆمێ کەوت وڕۆیشت خوێیەکەش بوّوە بە ئاو.

دایکی : گوێ لەکوڕەکەی بوئەگەردەڵێ چی ولێی حاڵی دەبی کوڕەکەی دەڵـێ چـی ئاخردایکی فەقیرتەنیادەسحێب وسلاّوەتی بـەش مـابون لەدونیایە بیریشـی لێ نـەکردەوە ئەوقسەچاکەویان خەراپە،؟

لەسەرەخۆدەڵێ دەی کوڕم بەڵکو وای تێ خێرە !

کوڕە دەڵێ دایە گیان ق ...ی تۆی تێ خێرە؛

کەرەکەم خینکاوەو خوێیەکەشم بە ئاوێ دا چووە چی تێ خێرە؟!!!

د یسان دا یکەکەوای بیرلێ ناکاتەوەوبێدەنگەی لێ دەکا وهیچ ناڵێ؟؟



## جوتێر و کوپەزێڕ

دەڵێن کابرایەك جوتی دەکرد ،بەهۆمۆو بەبابەوەت دەبەرمرم گاشین هەمولەشی بەئارەقەو.وزۆریش مـاندوپێی خۆش بودەئەو.وەختـەی دابیـانوێکی بۆهەڵکەوی وبرێـك بحەسێتەوە.لەناکاو خڕەیەکی لەگاسنی هات، تەماشای کرد؛ چونکە ئەو زەمانیش وەکو ساڵـەکانی هەزاروسیێ سەدوشێستی بەئەولاوەکە هەموچاك و پیرو قەبری پیاوچاکەکانیان داونەتەوە خەبەری ئەوجورە شتانە هەبو؛ بەجوانی کە تەماشای کـرد کوپـەلێك بوئەگـەر سەری کوپەی کردەوە، پڕ لە لیرە؛ دیـارە کـە دیتنـەوەی شـتی وا چـەندە خۆشـە ورەی دەدابەپیاوی، کابرا لـەشایان گەشـکەبو؛ کوپـەی دەرهێنـاو، دەئـەو وەختـەیدا سوارێك بەڕێیەدا دەهات،لەئەولاولایان دەیڕوانی ڕییەکەلەقەراغ زەویەکەی بوئاورێکی وەجوتێریش داو ، جوتێر کە ئاوردانەوەی سواری دیت، ڕەوانە کوپەڵـەی دە تورەکەی ناو حاشاریدا و گوتی؛ بەخوای ئەوە ئەوسوارە ئاگای لێبوە، وئەوە دەچیت بەپاشای بڵێ، با بانگی بکەم بیدوێنم بزانم هیچ ناڵێ.مام پیرۆت:هۆی کاکی سوار: کاکی سوار! سوار:بەڵێ :بیێزەحمەت هەتا نێرەوەرە. کابرای سوار چوبوّ لای مام پیرۆتی؛ فکـری هـەمو شـتێکی کردبـا فکـری ئەوەی نەدەکرد کە ئەوجوتێرە کوپەیەکی لیرە دیتۆتـەوە، بـەلام فکـری دەکـرد کـارێکی بەوی هەیە. سوار:کاکە ماندونەبی! مام پیرۆت دەڵێ خواعافوت کات بۆخۆت ماندونـەبی. سوار:خوات لێ ڕازی بیت، کاکی جوتێر ئەمنت بو چییە؟! مام پیرۆت:ئەرێ بە فکـری تـو ئەودڕوانە بدروم یان بیانسوتێنم؟ سوار:جا کاکە ئەگەر بیاندروی پەلیی دەبیت ودڕوشـی هەردەبیت، بەلام ئەگەر بیانسوتێنی ئەوانەی هیچ نابن تۆویشی نـامێنێ. مام پـیرۆت:جا باشەئەگەر وابیت دەیانسوتێنم، بەڵێ سوتاندنیان چاکترە. زۆر باشە.

کابرای سوارخواحافیزی لێ کردو لەزەویەکەی وەدەرکەوت، دە فکـری خۆیـدا گوتـی جا پیاو هێندە نەزان دەبیت! ئاورێکی دیکەشی وێدا، دیسان مام پیرۆت گوتی بـە خـوای زانیویەتی وئەوەدەچیت بەپاشای دەڵێ؛ دیسان بانگی کرد:کـاکی سوار! تۆخـوا تـائێرە بگەڕێوە. کابرای سوار گەڕاوە بۆ کن مام پـیرۆتی و:چتدەوێ بـابم؟مام پـیرۆت: ئـەرێ

کاکە ئەوزەویەی بەکەشاو بکەم یان بە سەردێر کێەیان باشترن؟! سوار :کەشاویش باشە بەلام سەردیر قایمترە. مام پیرۆت:جائەگەر وابیت بە سەردێری دەکەم. سوار:بەخوای جا بۆخۆت باشتر دەزانی. سوار وەڕێکەوت ولەسەرڕێیە، تەماشایەکی مام پیرۆتی کرد و لەبەرخۆیەوە گوتی جا ئەتوجوتێری نەزانی کەشاو باشترە یا سەردێر!

مام پیرۆت چاوی لەچاولێکردنی سواریبوگوتی، بەڵێ زانیویەتی ودەچیت بەپاشای دەڵێ؛ دیسان بانگی کابرای سواری کرد: کاکی سوار! کاکی سوار! توخوا بگەڕێوە کارێکی دیکەشم پێتە. سوار:ئاخ؛ هاوار؛ لە دەست ئەوکابرایەی نەجاتیم نابیت، دەڵەی شێتە، بۆجاری سێهەم گەڕاوەبۆلای مام پیرۆتی.گەییشتەلای:بەڵێ؛چیە؟!چتدەوێ دەی مام پیرۆت چەبرسیاری دیکەی نەبو؟! ئەرێ کاکە ئەو گایە چاترە یان ئەوی دیکە؟! کابرای سوار:جا بابم ئەمن چوزانم، گاجوت، گاجوتی خۆتن بۆخۆت جوتیان پێدەکەی ئەمن چ بلێم! نا! نا! ئەتوچاتردەزانی پێم بلێ.سواردیتی کابرادەست بەردار نابیت پێیگوت هەرگایەکی ڕاست بڕوات و خەتێ خوار نەکات و مانێنەگری ئەو گا، گای چاکە. مام پیرۆت:ئەو گابازوە ئەوی ئەتۆ تەعریفی دەکەی وایە. سوار:جا ئەوگایە لە گایەکەی دیکەت چاترە. کابرای سوار وەڕێکەوت، کە گەییشتە سەر ڕێیەکەی ئاوڕێکی وێداوە، دیسان لەبەرەخۆیەوەبرێکیشی دەست وسەربزاوتن وگوتی پێم وابی ئەوکابرایە تەواو نیە، دەناچۆن گاجوتی خۆیەتی وبۆخۆی جوتی پێدەکاولەمن دەپرسیت ئەوگایەچاترەیان ئەوی دی چابولەکۆلم بۆوەخەلاسیم هات لەدەست ئەوکابراشێتەی؟! مام پیرۆت کەدیتی سواردیسان ئاوڕی وێداوەگوتی، نەخێر زانیویەودەچی بەپاشای بلێ،بۆیەهەرئاوڕان دەداتەوەبانگی کرد:هۆی کاکی سوار! توخواوەرەکارێکی دیکەشم پێتە!سوار:ئەی کوڕە خۆلەکۆلم نابیتەوەبەشێتم دەزانی وەڵلا نایەم. مام پیرۆت:وەڵلا دێی! سوار:وەڵلا نایەم! سوار ئەوەی گوت و ڕکێفی لێداو هەلات ڕۆیشت.هەر سوار هەلات، مام پیرۆت داروباری هاویشتنەسەرنیری و تورەکەڵەی ( کوپەکەی تێدابو)لە پشتی بەست وهاتەوە ماڵێ،

مام پیرۆت ژنێکی زۆرزاناوزیرەکی هەبو، ئەگەرچاوی بەمێردەکەی کەوت وئاوا زوو

لە جوتیرا هاتبۆوە، زانی شتێك ڕوی داوە،مام پیرۆت بانگی ژنەکەی کرد:خەزالْ دا ئەو گایانە داکە ! خەزالْ غاریداگایەکانی داکردن :ئەدی ئەوە ئەتو بۆکویْ دەچی؟!

مام پیرۆت :ئەمن دەچمە دیوانیْ پاشای. خەزالْ شکێکی کرد:وەرە ژوریْ مالْە حاجی هەباسی ماستێکی ئەوەندەخۆشیان بۆهێناوین؛وەرەپاروەنانێکی بخۆئەمنیش برێك تفاقی دەپێش گایەکان دەکەم، بەلْیْ؛ خالْ پیروتی بەئەوجورەی فریودا تورەکەی لە خۆیکردەوە، بۆ وەی ژنەکەی فکریْ نەکات دەناخۆئاگای لەهیچ نەبوهەرشکیکی کردبو، تورەکەی لەدەریْدانا.خەزالْ نان و ماستی بۆمام پیرۆتی داناو بەبەهانەی گیاهێنانیْ چۆ دەریْ، کوپەلْەی دە تورەکەیدا دیت، دەری هێناو،دە کۆخی نا.بەردێکی وەکو کوپەلْەی خڕ و لەباری لەدەرکیْ بۆ دە تورەکەی ناو،

مام پیرۆت دوسیْ پاروی نان خوارد ئەو ماستەی خەزالْ دەیگوت، هەونەبو، نەیزانی بۆ فریودانیەتی بەتالْوکە هاتەوە دەریْ بیْ ئەوەی تەماشای تورەکەی بکات چونکەخەزالْ زۆر زانایانەدەگەلْی هاتەدەریْ،تورەکەی لەخۆی بەست وچوبۆ دیوانی پاشای کە گەییشتە بارەگای پاشای،جوابی دەرکەوانی نەداوە ئاخیرەکەی ئیجازەیان بۆ وەرگرت؛ چۆ ژوریْ لەشایە ئەوەی خەزێنەی بۆپاشای هێناوە.تورەکەی لەخۆی کردەوە ولەپێش پاشای بە عەرزێی داداو، بەردێکی خڕیلکەهاتەدەریْکەچاوی بەئەوبەردەی کەوت وەك تاسانیْ تاسا،

پاشاو وەزیرونایب کە چاویان بەئەو وەزعەی کەوت وئەوبەردەخڕەوکابرائاوا بەڕاشکاوی بێتەدیوانیْ پاشای لێیانپرسی ئەوە چیە؟! ئەو بەردەت بۆ هێناوەتە ئێرە. مام پیرۆت نەشەمزاوکوتی ئەوە دەگەلْ خێزانم گرێومان کردوە، ئەمن دەلێم ئەوبەردە نیوپوت دەبێت خێزانیشم دەلْیْ نیوپوت نابێت ،هەموان زانیان ئەوقسەوانیە. پاشازۆر هێدی و لەسەرەخۆ پێیگوت تەرازو هەبو کێشاباو مەعلوم دەبو؛ مام پیرۆت:ئاخر قوربان لە حزۆر جەنابی پاشای باشتربو. وەزیرێك ئەگەر چاوی بەکابرای و ئەو بەردە خڕەی کەوت بە پاشای گوت وانیە، ئەوکابرایە شتێکی دیوە، پاشا گوتی شتی چی دیوە؟! با بڕوا، وەزیر گوتی نەخێر قوربان شتێکی دیوە،

هێنایان دە دیوێکیان کرد، دەرکەکەی کون کونبو برێك دەویَدابو لەکونەکانڕا تەماشایان کردبەدەستان ، ئیشارەی دەکرد و تەعەجوبی دەکرد، کوپەولیرەکانی دێنانەوە بەرفکری خۆیَ ؟هێنایانە دەریَ و لیَ یانپرسی:ئەوە چتدەگوت ؟!

مام پیرۆت: هیچم نەگوتوە:چۆن هەر بەدەستان ئاوات دەکردوسەرت ڕادەوەشاند؟ :ئەها! ئەوە دەمگوت پاشا کەللەی دەلەی کەللەی دێویە، قینگی هێندە زەلامن دەلەی سەکۆی پینەچیانە ...ی دایکیشی ئەوەندوکەیە چۆن تێوەهاتوە؟!

پاشا برێك پێکەنی و گوتی بەرەڵلایکەن بابڕوا.

هەرئەووەزیرەگوتی ناقوربان! شتێکی دیوە، ئەوجار هێنایان دە دیوێکیان کردو بەدوکەڵی کایە قانگیان دا. مام پیرۆت وەپشم و هۆڕ کەوت هاواری کرد، دەرم هێننەوە پێوودەلێم، هێنایانە دەریَ وەزیرو پاشا هەمو ڕاوەستابون پێیانبڵیَ، دەی بڵیَ بزانم. مام پیرۆت زانی بۆیَ دەچێتەسەریَ خۆی لیَ شێت کردن دەڵیَ پاشا! پیاو بەدوکەڵی کایە زو دەخینکیَ، جارێکی دیکەهێندە کەرمەبە،کەس بەدوکەڵی کایەقانگ مەدە.

دیسان پاشا گوتی بەرەڵلایکەن بابڕوا،وەزیر گوتی نا! پاشا! شتێکی دیوە، بەڵیَ هێنایان دەمەڕیان وێدان وکەبیانلەوەڕێنیَ. گوتیان ئەوەدەمەڕەن مام پیرۆت:بەڵیَ دەمەڕن،دەکەسیشیان هێنان وگوتیان ئەوەش دەکەسن؛:بەڵیَ دەکەسن:هەریەکەی مەڕێکی بگرن.هەریەکەی مەڕێکیان گرت.دوبارەگوتیان دە مەڕتەواون؟!مام پیرۆت :بەڵیَ تەواون؛ دەبڕۆهەتائێواریَ بیانلەوەڕێنە ئاگات لێبن؟ گوتیان بابزانین هۆشی هەیە دەزانی بیانلەوەڕێنی و هەموان دێنێتەوە.خەزاڵ ئاگای لێبو.زانی خەریکن فێڵێکی لیَ بکەن کوپەکەشی چاك شاردبۆوەچوبرێك مام پیرۆتی خافلاند،بەبیانوی نان خواردنێك یا٠٠ هەتا هاتەوە مەڕێکی لێدزی ،مام پیرۆت زانی مەڕێك نەماوەبەلاّم وەسەرەخۆی نەهێناوونەشی وێرابیان بژێرێتەوە.ئێواریَ مەڕەکانی بردنەوەئەگەریژاردیانن،نۆمەڕمابون گوتیان ئەوەنۆمەڕن؟!مام پیرۆت:بەڵیَ نۆمەڕن.:ئاخر بەیانی دەمەڕ بون؛:بەڵیَ دەمەڕ بون:ئەدی ئەوی دیکە چیلیَ هات؟!مام پیرۆت:هەرئەوەندەبون.دوبارەپرسیاریان لیَ کردەوە

:باشەئاخربەیانی دەمەڕنەبون مام پیرۆت:بەڵێ دەمەڕبون ئیستا خۆنۆمەڕماون ،
مام پیرۆت :بەڵێ نۆمەڕماون ئەدی ئەوی دی چی لێ هاتوە،مام پیرۆت :هەرئەوەندەبون. پیاوی پاشای بانگیان کرد.دەکەس هاتن.گوتیان ئەوەدە کەسن! :مام پیرۆت :بەڵێ دە کەسن:مەڕەکانیش دەبون:دەڵێ دەبون ئەرێ بۆهێندەی دەڵێن! هەرکەسەمەڕێکی بگرن. هەریەکەمەڕێکی گرت، پیاوێکیان بێمەڕماوە.گوتیان باشەئەدی مەڕی وەی کوانێ؟!
مام پیرۆت: دەی خۆئەمن دەستیی ئەوەم نەبەستبۆن بابۆخۆی وەکوئەوانی دیکە مەڕێکی گرتباوە.چی لێ بکەم پاشاگوتی بابەلێیگەڕێن بابڕواخۆئەوە شێتە! وەزیر دیسان گوتی قوربان شتێکی دیوە وەمنی دە. پاشا:باشە ئەوە وەتۆم دا بزانم چی لێدەکەی؟!
ئەوجار وەزیر باڵتۆی خۆی وێدا گوتی برۆ ئەوباڵتۆیەی بفرۆشە. مام پیرۆت باڵتۆی بە سەرشانیدادا و بەکوچەیدا هاتەخوار؛ قەزاوقەدەر ڕێگای کەوتەدەرکێ ماڵە وەزیری، بەوێداهاتەخوارێ و. ژنی وەزیری لە دەرکێ قەدەمی لێ دەدان،چاوی بەباڵتۆیەکەی وەزیری کەوت ناسیەوەوبانگی کرد:کابرا داوەرە! مام پیرۆت هات:بەڵێ چت دەوێ خانم؟
: ئەوەئەوباڵتۆیەی چلێدەکەی ؟

مام پیرۆت:دەیفرۆشم.خانم :بەچەندی؟ مام پیرۆت:بە تمەنێك و ٠٠کی

خانم دەڵێ برۆبرۆ قسەی بێجێ بۆ دەکەی؟

مام پیرۆت:جاخانم مەیکرە! مەجبورم نەکردوی ئەمن ماڵی خۆمەو ئاوای دەفرۆشم. مام پیرۆت ڕۆییشت و ژنی وەزیری بەقەرەواشێی گوت، بە خوای باڵتۆی وەزیریە دەبێ بۆکوێی بەریت؟ قەرەواش:خانم خۆ ئەمن دەنگێ ناکەم ئەگەر پێت خۆشەهەتا بانگیکەم لێی بکرە. ژنی وەزیری بوخاتری باڵتۆی وەزیری کەبەخۆڕایی نەچێ دەڵێ دا بانگیکە. قەرەواش بەغار وەدوایکەوت، مام پیرۆتی هێناوە، دوبارە لێیپرسی:ئەگەر دەیفرۆشی چەندی دەڵێی هەتا پوڵت دەمێ؛ مام پیرۆت:خانم عەرزم کردی لەوەندەی کەمتری نادەم جابۆخۆت دەزانی.بەڵێ خانمێ وەزیری باڵتۆی وەزیری بەدڵخوازی مام پیرۆتی لەمام پیرۆتی کڕیەوە. پوڵ وحەقەکەی دایەومام پیرۆت بەکەیف خۆشی گەڕاوە بۆ دیوانی

پاشای، پوڵەکەی لە پێش پاشای دانا؛ وەزیر و نایب وەزیریش بۆخۆی لەوێ دانیشتبو: چۆن باڵتۆیەکت بە تمەنێکی داوە؟! ئەوە بە کێت فرۆشتوەواهەرزان؟:

مام پیرۆت:بە ژنێ وەزیرم فرۆشتوەدەڵێن بەتمەنێکت فرۆشتوە؟ :ناوەڵڵا؛ بەتمەنێکی وبە... کم فرۆشتوە.ئەگەروای گوت،وەزیر.ڕوی لێ وەرگێراوزۆری پێنا خۆش بو،هەرای فەراشی کرد:وەرەئەوپیاوەی بەرەلەدەری شاری بەرەڵڵای کەن خۆشێتە،

ئەوجارپاشاگوتی:نا!نا!وەزیر!شتێکی دیوە،برێکی دیکەشی لەئەولاولایان دە بزانە چی دیکەی لێ پەیدانابێ پاشادوسێ جاران بەوەزیری گوت دەی دەی شتێکی دیوەدەی!

ئەوجار مام پیرۆت هاتەوەماڵێ،برێکی نارەحەتی کێشا،بەلام لەباتی ئەوهەموزەحمەتەی تۆڵەشی کردبوۆوە شتێکی وای وەدەستکەوت ئەگەرنرخی ئەوزەحمەتەی هەبیت گەییشتەوە ماڵێ ژنەکەی پێیگوت جا هەتا دەمری بیخۆ لە سایەی ئەو. کەللەیەوە.

## چوێلەکە و سی مسقالێ زێڕ

کابرایەك چوێلەکێکی دەگری، چوێلەکە لێی دەپرسی:چم لێدەکەی؟ کابراش دەڵێ دەت خۆم چت لێ دەکەم.چوێلەکە:مەمخۆسێ نەسیحەتانت دەکەم بەئەوشەرتەی لەگوێی بگری،ئەوەچاکترەلە پاروە گۆشتێکی من. بەڵێ کابرا ڕازی بو،چو ێلەکەی لە سەر بەری دەستی دانا.چوێلەکە گوتی ١ـ لەدوای چوان مەڵێ ئاخ ٢ـ کچەتیوان مەکەبەشەوچراغ ٣ـ بەرکوێرەکانیان مەکەبەباغ،کابراش هەموی گوێ لێ بون وگوتی زۆرباشەبەقسەت دەکەم ،ئەوجارچوێلەکەچولەسەرداریکی هەڵنیشت وڕوی دەکابرای کردو گوتی ئەتو ئەمنت بۆ بەردا؟کابرا :بۆ،چوێلەکە !: ئەمن سی مسقالم زێڕ دە ئەوکیدایە؛ دەگەڵ چوێلەکەوایگوت،کابراگوتی ئاخ چۆن لەقیسم چوی فێڵت لێ کردم!چوێلەکەڕوی تێ دەکا ودەڵێ باشە قەرار نەبو لەدوای چوان نەڵێ ئاخ، ! خۆ ئەمن هەمو لەشم بیست مسقالێ نابیت، سی مسقالێ زێڕ چۆن دە ئەوکێ من دادەحاوێتەوە کابرا گوتی وەڵاهی وایە،دەی باشە ئەوانی دیکەم پێبڵێ. چوێلەکە گوتی نەسیحەتی ئەوەڵیت زۆر جوان دەگوییگرت نۆرەی ئەوانی دیکەیە جیقیکی کرد و هە ڵفڕ ی وڕۆ یشت ؟!

## خاچی ئەرمەنی

دوکاندارێکی ئەرمەنی خاچی فرۆشتنیێ هەبون،خاچێکی لە دەرێ هەڵاوەسی‌بو بۆفرۆشتنێ؛ پەلەوەرێك هەموڕۆژێ دەهات وبەخاچەکەی هەڵدەڕیا و دەڕۆیشت، ئەوکابرایەبەفکری خۆی وای‌دانا کە ئەو پەلەوەرە مسوڵمانە و خاچی ناخۆش‌دەوێ بۆیە پێی هەڵدەڕی. بۆ تاقی‌کردنەوەی، پێالێکی مەشروب لە قەراغ خاچەکەی دانا هەمان پەلەوەرهاتەوە، مەشروبەکەی خواردەوە، دوایەش بە خاچەکەی هەلاڕیا و لییْ‌دا ڕۆییشت ئەوکابرادوکاندارە زۆری پیْ سەیربو. سەری هەڵێنا، هەر چەند تەیرەکە لەوێ نەمابو، گوتی ئەگەرئەتومسوڵمانی ئەومەشروبەت بۆخواردەوە؟ بەمەزهەبی مسوڵمانان مەشروب حەرامە،ئەگەرمسوڵمانیش نی،خاچ لەلای غەیرەمسوڵمانی خۆشەویست وموقەددەسە، بۆبەخاچی هەلاڕیای.

## هەیاس و تاقی‌کردنەوەی سیْ کۆگڵ

ڕۆژێکی هەیاس بەنێوبازاریْ‌دادەڕۆیشت چاوی بەکابرایەکی کەوت سیْ کۆی گڵ دانابو بۆفرۆشتنێ چۆکن کابرای پییْ‌گوت کاکە ئەوە کۆی بە چەندیە؟

کابرا، دەڵیْ بەسیرێکیە.هەیاس سیرێکی دەرهێنا.وەکابرای داوگوتی مەعنای ئەو کۆیەی چیە پێم بڵیْ؟ کابرا دەڵیْ ئەو خاکە وەسەر ئەوکەسەی ئیعتیبار بە زاڵمان دەکات. هەیاس سیرێکی دی دەرهێنا وەکابرای داوگوتی مەعنای کۆی دوهەم چیەبائەویش بزانم؟ کابرا دەڵیْ ئەو خاکە وەسەر ئەوکەسەی سرڕی خۆی دە بەردەستی ژنیْ نا.

هەیاس سیرێکی دیکەشی دەرهێناو،وەکابرای‌داوگوتی مەعنای کۆی سیهەم چیە بابیزانم وبیْ خەم بم ودیارەبەخۆڕاییش ناچی؟!

کابرا دەڵیْ ئەو خاکە وەسەر ئەوکەسەی بێگانەی گرت و خۆیی‌بەردا.

بەڵیْ ٠ئەو سیْ قسەی زۆر جوان هەڵگرتن، ڕۆژێکی دەستی کرد بە تاقی‌کردنەوەی ئەو سیْ قسانە.چو بەرانی سوڵتان مەحمودی هێنا لە ماڵیْ شاردیەوەو،بەرانێکی خۆی کوشتەوە،لەکن ژنەکانی گوتی ئەوە بەرانی سوڵتان مەحمودیە کوشتومەتەوە.بەرانیان

کەوڵ کردودەگۆشت وردکردنیدا بەهانەی بەژنەکان گرت ودەگەڵ ژنەکانی بەشەڕهات، چونکەهەیاس دو ژنی هەبونە یەکیان خزمی خۆیبو ئەوەی دیکەش بێگانەبوە،

ڕەژنەکانی کەوت ژنە بێگانەکەی بۆئەوەی خەڵك بزانی وئەوکارەی لێ ئاشکرابێ لەنێو کوڵانی نەڕپاندی:خۆ ئەمەش بەرانی سوڵتان مەحمودی نین بنکوژیەوە. ئەو ڕۆیی، ژنەکەی خزمیشی بەبێ دەنگی چۆماڵەجیرانیکی؛هەیاس ئیێکیکی ناردەکن ژنەکەی خزمی و:پێیبڵێن کێردەکەلەکوێیە ئەوەبۆی مەحتەلم؟! ژنە کە: ئەوە لەنێو گەلاکەلەماندایە ئەوکەلەمەی لەبەر دەستندابو و وردن دەکرد، گۆشتی کردە کەلەم؛ گوتنی ژنەکەی زۆر پێ خۆشبو،بۆخۆی چوژنەکەی دڵخۆشی داوەو هێنایەوە ماڵێ و ژنە بێگانەکەشی قەت نەهێناوە؛خەبەربەسوڵتان مەحمودی گەییشتەوەکەهەیاس بەرانی تۆی دزیوەو کوشتویەتەوە،هەیاسیان هێناوحوکمی درا.دەبێ ئیعدام بکرێت چونکەخەیانەتی بەئەمانەتی شای کردوەلەبن داری ئیعدامیان ڕاگرت هەیاس خزمی زۆربون بەلام هات و چۆی لەگەڵ نەبون و نەیدەخوێندنەوە، ئەگەر خزمەکانی خەبەری ئەوەیان زانی سوڵتان هەیاسی لە سەر بەرانی ئیعدام دەکات هەموکۆبونەوە،هەرچی هەیان بوحازربون بیدەنە سوڵتانی لەباتی خوینی بەرانی هەتا لە هەیاسی خۆشبیت و بێگانەکانیش هەمو گیفەی سمێڵانیان دەهات، هەیاس کەئەوەشی تاقی کردەوە بانگی جەللادی کرد:بەرانی سوڵتانی ئەوەلەماڵێیەو ساغ وسلامەتە؛چون بەرانی سوڵتانیان هێناوە.هەر سێ کوی تاقی کردنەوەجا ئەوجارلەئەوداخە ی خۆی لە سوڵتانی ونکرد،وای خۆ لێ شاردەوە هەرچەندی گەڕان نەیاندیتەوە ئاخرەکەی ئەوتەگبیرەیان بۆ کرد، جا هێنایان هەردیێەی گیسکیێان بەکێشان تەحویل دان هەتاماوەیەکی دیاری کراو بەخێویبکەن، نابی نەکز بیت ونە قەڵەو.پاش ماوەکەی گیسکەکانیان هێنانەوە، ئی وابو دو سیێ زیادکردبو ئی وابو سێ سیێ کەم کردبو، هەیاسیش چوبولەدیێەکی چوکەڵە،ببوە ئاشەوان، گیسکیان هێنان و گوتیان نابی نە قەڵەو بیت و نە کز، ئاغای ئەو دیێەی زۆری فکر کردەوە دوایە عالەم بە ئاغایان گوت ئەو کارەکاری ئەو ئاشەوانەیە؟کەس نەیدەزانی ئەوەهەیاسە،گیسکیان

وەئاشەوانی دا. هەیاس دو فەرخە گورگی گرتن هەتا ئێواریٚ گیسکی زۆربەجوانی بەخێودەکرد و ئێواریٚ فەرخە گورگی پیٚ نیشان دەدان، وەکو خوٚی لیٚدەهاتەوە،

تەنیا گیسکی هەیاسی لە قەراری خوٚی مابو وەدەنا ئی منداربوشیان تێداهەبو، بەئەوجورەی هەیاسیان بوسوڵتان مەحمودی دیتەوە.

## هەیاس و نەججار

ڕوٚژێکی سوڵتان مەحمودی غەزنەوی دەگەلٚ هەیاسی لەنێوشاری دەگەڕان ؟ نەجارێك باسکی هەڵکردبون، دەستی دە کەلەکەی نابون و دەهات و دەچوو،دەیگوت ماشاالله خودایە ئەوەی دەیزانم هیچ هونەری نیەدەیزانم، ئەوەی نایزانم ئەویش هەر دەزانم! دەنکەجوٚی لە سەر نینوٚکی دەتاشی.

سوڵتان ڕوی دە هەیاسی کردوگوتی ئەوە بوٚوا دەڵیٚ ؟ بوٚ وا دەکات چیە؟!

هەیاس:قوربان ئەوە لە ماڵیٚ دڵی خوٚشە ژنی، ژنی چاکە، بوٚیە وایە!

سوڵتان:بزانەنایگوٚڕی هەیاس! بزانین ئەودەمی چوٚنە.

بەڵیٚ هەیاس چەندکەسی ناردن هەرجورێکی بو یا.هەرفێڵێك، ژنەیان لەخشتەبردو گوٚڕیان، ڕوٚژێکی دیکە سوڵتان دەگەلٚ هەیاسی بە بەردەرکی دوکانی نەجاڕیدا هاتن، باسك و قامکی هەمو بریندار ببون، بە پەڕوٚیان بەستبونی و دەیگوت ماشاالله خودایەئەوەی نایزانم، نایزانم، ئەوەی دەمزانی ئەویش هەرنازانم ولە بیرم چوٚ تەوە؟،

سوڵتان زگی پیٚسوتا گوتی هەیاس! زوٚر فەقیرە،بوٚی چاك کەوە.

هەیاس دەڵیٚ قوربان پێم خەرادەکەی وپێشم چادکەیەوە؟سوڵتان دەڵیٚ چارەنیە، ئەوجارهەیاس چوکوٚنەلولینیٚ کی دەست دایە،کوٚنەعەباومەبای دەبەرکردن و چوٚ ماڵە کابرای نەجاڕ، تاوێکی لەویٚ ماوە،دوایە لە ژنەکەی پرسی بچمە کویٚ برێکم کاری ئاویٚ هەیەو،دەست نوێژیش هەڵدەگرم، ژنەش کەلاوێك یاجێگایەکی نیشان‌دا،

هەیاس چو، لە گەڕانەوەیدا لولینەی شکاند ودانیشت ودەستی کرد بەشین وگریانێکی مەگەرئەوخودایەبزانی؛ ژنە هات وگوتی کاکە ئەوەبوٚدەگری چەبوە؟

هەیاسیش:لولێنەکەم شکاوە بۆلولێنەکەم دەگریم ژنە:جا ئەو گریانەی بۆ چیە؟ ئەوەت دوقران بچو لەبازاڕی لولینێکی تازەوجوان بکڕەو،وەرەوە. هەیاس بەگریانەوە گوتی های هو! های هو؟؟ ئەوە لە عەیب وعاری من بەڵەد بوە هەتا لولینێکی دیکەلە عەیب و عاری من بەڵەد دەبیت ئەوە زۆری دەکێشی؟؟

ژنە کەئەوقسەی گوێلێبوزویەکی سەری زبانی خۆی گەست وگوتی بەخودای ئەوە بێ ونەبێ هەیاسەودەگەڵەمنێتی ودیارەلەکارەکەی من ئاگاداربوە؟بەخۆڕایێ نیە، ئەمنیش ئەوەلەسەردەستی خوداو پیغەمبەران تۆبە؛ هەیاس هاتەوەوخەبەری بەسوڵتانی دا.

پاش ماوەیەکی دیکە سولتان دەگەڵ هەیاسی هەر بەئەو جێگایەیدا ڕۆییشتن هەتابزانن نەجاڕوەزعی چۆنەچەدەڵێ ؟چەدەکا؟نەجاڕیان دیت هەروەکو پێشو دەستی دە کەلەکەی نابون ودەهاتو دەچوو دەیگوت ماشاالله! خودایە؛ ئەوەی دەیزانم ئەوەدەیزانم هونەری نیە،ئەوی نایزانم ئەویش هەردەزانم، دیسانیش دەنکە جۆی لە سەر نینۆکی دەتاشی ئەوجارسولتان گوتی زۆرباشەبائاوا بمێنیتەوە.



**هەیاس**

سولتان مەحمود ڕۆژێکی لەدیوانێ دادەنیشی ودەڵێ هەیاس چ خۆشە هەیاس دەڵێ هێ(یەعنی هێلکە).چونکەوەک ئیستاخۆشت ئاوا زۆرنەبوەسوڵتان هیچ ناڵێ. هەتا چەند مانگان، ڕۆژێکی بۆزانایی ولێ زانی هەیاسی دەعەینی تالۆکەیدا دەڵێ هەیاس بە چی؟! هەیاس زوێکی وەبیری د ێتەوە کە فلآنە ڕۆژەی لێیپرسیوە چ خۆشە و ئەویش پێیگوتوەهێ؛ ئێستا دەڵێ بە چی ئەوە دەگەڵ هێلکەیەتی، ؟

دەگەڵ گوتی بە چی ،هەیاس گوتی · قوربان بە خۆی.



**گوێلکەسور**

دەڵێن کابرایەك بە خۆی و بە ژنیّ ،دەماڵیّداژیانیان ڕادەبوارد،ئەوژنومێردەلە سەروەت وساما نی دونیایەش مانگایەکیان بە گوێلکەوە هەبو، لەبەر بەدبەختیّ مانگایەکەیان مرد گوێلکەسور بۆدەردەسەریان ماوە، ئەو ژن ومێردە، گوێلکەکەیان پیّ بەخێونەدەکرا، هەموڕۆژی لەسەر ئاودانی ئەوگوێلکەی لیّیاندەبیّ بەهەڵلا.کابرابەژنەکەی دەگوت ئەوبەستەزبانەی ئاودە. ژنە:بۆخۆت دەبیّ ئاوی‌دەی ئەوەکاری پیاوانە.

بەڵیّ هیچیان ئاودانی گوێلکەسوریان وەستویّ خۆ نەدەگرت. ئاخیری لە سەر ئاودانی گوێلکەسوری قولّ و قەپیان کردوهەرچی دۆڕاندبای دەبا گوێلکەسوری ئاودابا.

ژنە تەشی دەست دایەو چۆماڵە جیرانیان، دەستی بە تەشی ڕستنیّ وقسەوباسان کرد، ماڵە جیرانەکەیان دۆکلیویان لیّنابو، قاپێکیان دوکلیوبۆمێردی پورئامینیّ ناردو، خاڵوش ئەوەلەماڵیّ لیّی دانیشتوەودەلەی میرە،ئەومنداڵەی دوکلیوی بۆبردبوهەربانگی دەکرد مامە:دوکلیوم بۆ هێناوی.کابرا هەرجوابی نەدەداوە.منداڵەبرێك سەرەسودرەو.. بەدفەڕبوچونکەئەویش هیچ جوابێکی نەداوە،لە سەرڕا دوکلیوی بە سەرو چاوی کابرای‌دا ڕشت وچۆوەماڵە خۆیان و باسی هیچی نەکرد پاشان کەچە سواڵکەرێك وەژوردەکەی و هەرچەند بانگی دەکاودەڵیّ دە ڕیی خودایدا خێرێکم پیّبکە کابرا هیچ جوابی ناداتەوە. سواڵکەر کە ئاوا دەبینیت وادەزانی ئەوەکەڕولاڵە.دێنی لاسمێڵێك و لابرویەك و لایەکی ڕدێنی کابرای دەتاشیت دیسان خاڵ مامەند وەجواب نایەت دەدڵی خۆێداگوتویەتی قسان ناکەم باتوشی ئاودانی گوێلکەسوری نەبم و هەر وەسەرەخۆشی ناهێنیت لەترسان ،

سواڵکەرکەئاواوەزعی کابرای زۆرخەراب دەبینیت،وەهەرچی هەبو بەوەزن سوك و بە قیمەت گران دەستێکی لەڕەنێوماڵی دەخاو لەکوڵی دەبەستی و لێدەدا دەڕوا؛

ژنی خاڵ مامەندیش ئەوەلەماڵە جیرانەکەیانەوئاگای لەهیچ کارەساتێکی نیە وەختێکی ئەگەردەگەڕێتەوەماڵیّ،چاوی بەمێردەکەی دەکەوی دەبینی لاسمێڵێك ولابرویەك ولایەکی ڕدێنی نەماوەوهەموگیانیشی ئەوەبەدوکلیوبووە:ئایاڕۆئەوەبۆ وای؟!کیّ وای لیّ کردوی؟

خاڵ مامەند دەست پێ دەکا ئەی! لێمنەبردیەوەبرۆ زوگوێلکە سوری ئاودە و جارێ لەئەو قسانە گەڕێ. پور ئامین:باشەباشە! دۆڕاندومەوگوێلکەسوریش ئاودەدەم، بەڵام پێمبڵی بزانم کێ وای‌لێکردوی؟ خاڵ مامەند بۆی‌گێڕاوە.ئەوجار پورئامین تەماشای ماڵێی کرد، چی بەکەلکیشیان دەماڵێ دانەماوەخێرا سوێنێکی ئاولەپێش گوێلکەسوری دانا.:ئەگەر خواردیەوە سوینەکەی لە پیش وەلابەرد هەتانەشکێت و،پیی‌گوت ئاگایەکیشت لە ماڵێ بیت هەتا دێمەوە.

خاڵ مامەند:دەچیە کوێ؟ پور ئامین:دەچم ئەوشمەکانەلەسواڵکەری دەستێنمەوە. نابی بەخۆڕایی بچن،پورئامین وەڕێ‌کەوت، لەنیزێکی دێیەکی دەیگاتی، سواڵکەر شتەکانی لە کوڵێ بەستبون.پورئامین شتەکان دەناسیتەوە،بەڵام نەێدەویست وابەسوك وسادەیی شتەکانی لێ بستێنێتەوەدەڵێ باپەندێکی بەسەربێنم.پورئامین لێی نیزێك بۆوە وردە وردە بەقسەکردن خۆی دەگەڵ ڕێك خست. سواڵکەر؟:ئەتۆکیێ چ دەکەی،پورئامین دەڵێ بێ‌کەسم.سواڵکەرم:مێردت نیە؟پورئامین:نانیمە مێردەکەم لەمێژەمردوەو دەبەرئەو خاکەی دەمرم ئەگەرعەبدولکەریمی تێدایەبڕێکیشی فرمێسك بەدرۆبۆهەڵوەراندو،

سواڵکەرئەگەرئاوای گوی لێ بو،گوتی بزانم فریوی نادەم ئەوەباشە بێ کەسەچاك ڕێك دەکەوین سواڵکەریش دەڵێ ئەمنیش ژنم نیە،جائەگەروایەبۆناییەی مێردی بەمن بکەی؟ ئەگەرپێن خۆش بودەست لەسواڵیش هەڵدەگرین وکارێك کاسپێکی دی دەکەین پورئامینیش ئەوقسانەی بۆیەکردن هەتاسواڵکەری فریودابپورئامین:پێمخۆشە، هەردوکن لەتەنیای وەدەردەکەوین، بەڵام جاری قەرارما ن ئەوەبێ هەتا لەکن مەلای مارەم نەکەی نابی دەستم لێ بدەی باتوشی بێشەرعێ نەبین هێندێك نەسیحەتانیشت دەکەم٠: ئەگەر گەییشتینەئەودییەی جارێ بۆخۆشم سواڵێ دەکەم، بڵێ لە شاری خانوبەرەودوکانم هەیە لەئەوگەورە دییەی کوڕێکم فەقێیە،شت ومەکی تازەم بۆبردون وئەوشت ومەکە کۆنانە دەبەمەوەماڵێ دەیان کەمەخێر ئەوجارئامین دەڵێ شەوێ نانی کەم بخۆ چونکەلەدێهاتی دەڵێن سابلاغی کەمخۆرن، هەر دو پاروان بخۆو بکشێوە، هەرچەندی پێشت بڵێن بخۆ،

مەخۆو بڵێ عادەتم نیە شەوێ نانی زۆر بخۆم، وەختی نوستنێش بڵێ هاوینەدەرێ لەژورێ خۆشترەشمەکی خۆمان پێیەو دەگەڵ خێزانم لە سەربانی دەنوین؛ ئەگەپور ئامین لەقسان بۆوە،کابرا لێیپرسی:ئەدی نیوت چیە؟ پور ئامین:وەللاهی دایك وبابم نێوێکی ئەوەندە خەراپیان لێناوم هەرچەندی دەکەم لەرووم هەڵنایەت بە سەر زاریدابێنم ئەوە عەبدولکەریمی ڕەحمەتیش هەردەیگوت گچێ کەمتەرنێوی هەڵدەدام. کابرا:نا نا! بێڵێ جاهەرچی بیت چارە نیە، دوایە ئەگەرێێت خۆشبو نێوت لێدەگۆڕم. پور ئامین:نێوم بڕیمە. بەڵێ گەیشتنە دیی و لەماڵێکی وەژورکەوتن :ئەوەلەکویڕا هاتون بۆ کوێ دەچن؟ سواڵکەرو پور ئامین:کوڕەکەمان لەئەو دێیەی سەرێ فەقێیە، نوێن و شتی تازەمان بۆ بردوە، دەگەڕێینەوە ماڵێ، ماڵمان لە شاریە وخانوبەرەودوکانمان هەیە. ئەو ماڵە زۆریان قەدرو ئیحتڕام گرتن. شەوێ کاتێك نانێان بۆ هێنان کابرای سواڵکەر هەردو پاروە نانی خواردو کشاوە، هەرچەندی خانەخوێ:بابم بخۆ، شێوەکەزۆر زەریفە·سواڵکەر: نا ناتوانم، هەر عادەتم نیە شەوێ نانی زۆر بخۆم. بەڵام پور ئامین بەکەیفی خۆی تێی ئاخنی و خواردی. وەختی نوستنێ هات، گوتیان لە سەربانی بەنوێنی خۆمان دەنوین هەوای دەرێ خۆشەهەوای ژورێ گەرمە.خانەخوێ زۆریشی پێ خۆش بو. چونەسەربانی، پورئامین لە گەڵ سواڵکەری لە سەربانی درێژبون بەڵام کابرا لەبرسان ولەتاوکاری دیکەخەوی لێنەدەکەوت، زۆری ئەولاوئەولا کرد بێفایدەبو،چونکەفێری مفتە خۆری و زۆر خۆرێش ببو ئەوجاربەپورئامینێ گوت چم لێدەکەی؟ پور ئامین:بۆ؟ کابرا:بەخودای ئەوەلەبرسان دەمرم! پور ئامین:جارێ دەنگێ مەکە باخەویان لێبکەویت، ئەودەمی بەئەوکولانە گەورەیدا ڕویەڵت دەکەم، بچو دیزەی ماستی لەبن کۆڵەکەیەو نانیش لە سەر پێڕکییە، خۆ ئەمنیش نانم نەخواردوە،ئەوەلەبرسان دەمرم.سەبریان گرت هەتا لێیان مەعلوم بوکە ماڵە کابرای نوستونە. پور ئامین دەڵێ جا ئێستا وەختیەتی. کابرای ڕویەڵ کردە خوارێ. سواڵکەر زۆر چونەتە ماڵان هەمو شتێکی پێدەزانن، چو نانی دیتەوەو نردوێکی نان دەبن هەنگڵێ گرت و دیزە ماستی دەستدایە وبە پشتێندێ سواڵکەری ڕۆهێشت بۆ خوارێ

پشتێندەکەی ڕاوەشاند، پور ئامین هەڵیکێشاوە، هەتا نێوقەدێ، لەنێوەڕاستێ عـەرزی و بـەری‌میچی، کـابرای ڕاگـرت،پێشـتردارێکی هێنـابو،پشـتێندەکەی لی‌گرێـدا، کابرابەحـەواوەمابۆوە، ژنەشـت ومـەکی دەسـتدانێ و گـسـەڕاوەبۆماڵێ وزوێکـی گەییشتەوەماڵێ لای خـاڵ مامـەندی کابرای سـواڵکەریش ئەوەهـەرخۆی ڕادەوەشـێنی وپشتێندێ ڕادەوەشێنێ و چ خەبەرنیە. دو سێ جاران لـەسەرەخۆ بـانگی دەکـات:بڕیم؛ بڕیم. بەلآم جواب نەبو. ئەوجار کابرابەحەوایەوە شل دەبیـت ودەنگـی هـەڵدێنیت ودەڵێ بڕییم؛ بڕییم! ساحێب ماڵ بەدەنگی سواڵکەری وەخەبەر دێت و دەڵێ کابرا! لێرە مـەڕی؛ کولانەیـە، بچۆو ئـەولای بـڕی وایزانـی لەسـەربانیەوخەریکە گـوی دەکـو لانـەی بکـات سـواڵکەرئاخری دەستی شـل دەبیـت، دیـزە ماسـتی لـە دەسـتی هەڵدەخلیسـەکێ و بەردەبێتەوەشلپەی دێ ودوایەنانەکەشی لێ بەردەبێتەوە، دەگەڵ دیزە ماسـت وەعـەرزی دەکەوێ ودیزەی گڵی دەشـکێ ودەبێتەشلپ وهۆڕکابرای سـاحێب مـاڵ هـەرای ژنەکـەی دەکات:هەستە؛ کابرا هێندەی ڕیوەهێندەی ڕیوە، چ ولآتی نەهێشتوە،پێی وابودەکولانەی ڕیوە چرایان هەڵکردەوە دیتیان کابرا لە نێوانی عەرزی و بەری میچی، هەلآوەسراوە، نان و ماستیش بەگۆڕێۆوەربوە، لێیان پرسی:ئەوە چیە کاکە؟! ئەتو بۆ لـەوێ ئەوەکێ هەڵی ئاوەسیوی؟!

کابرادەڵێ بۆخاتری خودای جارێ لێمگەڕێن هەتا لێرەم دەکەنـەوە جاهـەمو شـتێکو بۆدەگێڕمەوە پسام؛ چون لـە سـەربانیڕا کابرایـان لی‌کـردەوە. ئـەویش ئـەوەی بەسـەری هاتبو بۆی‌گێڕانەوە. چون چاویان لە سەربانی کرد نە شمەك مابون و نەپورئامین

ماڵەکابراش هێندێکیان سواڵکەرتف ولەعنەت کردوهەرنەبەئەوشەوەی وەدەریان نـا. بەڵێ؛ پور ئامین بەئەوجورەی کابرای سواڵکەری تەنبێ کردو شمەکیشی بۆ مـاڵێ بـۆ لای خاڵ مامەندی هێنانەوە ، بژی پور ئامین،،

## تاهیر بۆتە جوتێر

کابرایەك بەخۆی وبەخوشکی دە ماڵێدابون، خوشکەکەی برێك دەنێوەوە چوبوو بۆخوشی تەمەنی لە خوشکەکەی زیاتربو؛ کە هێشتا کاك تاهیر،نەبۆخۆی ژنی هێنابوونە حومەیڕای خوشکیشی،مێردی کردبو،دیارەوای بیرلێ دەکری کاك تاهیرچاوەڕوان بوەئەگەر ژن وپیاویکی وەدەستکەویت هاوتەمەنی خۆی و خوشکی بیت و ژنبەژنەی پێ (دەگەڵ) بکات، بەڵام بۆی پێك نەهاتبو ئاوا مابونەوەو (چاوەڕوا نی ئەوڕۆژەی‌بوە)

سەرە بەهارێ ئاو، عەرزی دەدڕری و عەرزیش نەرمترە، ڕۆژێکی تاهیر جوتی دەکرد لەناکاو کەللەسەرێك وەدەرکەوت دەستی‌دایەو تەماشای کرد بەئەمری ئەوخودابیەی لە نێوچاوانی کەللەسەرەکەی نوسرابوئەو ئینسانە حەفتا قەتڵی کردوە ؟

ئەگەرتاهیرئەوەی چاوپێ‌کەوت هەتاتوانی وبەهەموهیزی خۆی کەللەسەرەکەی لە بەردێکی داو کەللەسەر وردبوبەڵام شتێکی ڕون وجوان بەقەرای دەنکەموروێکی لەکەللە سەرەکەی هاتەدەرێ. تاهیر هەڵی‌گرتەوەوزۆری تەماشاکردوئەوجاردەباغەڵیی نابە فکری خۆی گوتی بچمەوە ماڵێ دەیدەمەحومەیرایەخوشکم.کەگەییشتەوەماڵێ لەبیری‌چۆوە هەتا ڕۆژێکی تاهیر پاتۆڵی داناخوشکی بۆی بشوات، دە پێش شیوکردنێ‌داعادەت ئەوەیە باغەڵان بگەڕێن، حومەیڕا ئەگەر لە باغەڵی کاکی ڕوانی و ئەو شتە ڕوناکەی چاوپێ‌کەوت ئەویش زۆری پێ جوان بو،لەبەر ون بونی لێرولەوێ دە زاری ناو بەهەردو لێوان گرتبوی وبەدەستان شیوی دەکرد لەناکاو چۆدەگەرویەوە،بێ ئیختیار قوتی دا،ئیدی کە قوتدرا خلاس کەس باسی هیچی نەکرد،نە تاهیر ونەحومەیڕا چونکەتاهیر،هەرلەبیری نەمابو وحومەیڕاش پیی شتێکی وانەبوباسی بکات ؟چوارمانگان دوایە حومەیڕا بە خۆێ زانی وتاهیریش چاوی پێ کەوت کە ئەوە وردە وردە زگی لەژێڵا دی وەکو مەسئەلەی کابرای شێوەکەئەوەندەسوێربوخانیش پێی‌زانی ؟!

ڕۆژێکی تاهیرئەگەر.دیسان چاوی بەخوشکی کەوت وردتری لێی‌ڕوانی؛دیتی بەڵێ! ئەرێ

بەخودای ئەوەخەونەچیە،خۆئەوخوشکەی من لەزۆرپیاوان پیاوتربو جارجاریش دەیگوت نا هەروەکوپێشینیان گوتویانە،ژن ئاقڵی دەکۆشی‌دایە.ئەگەرهەستالیی‌دەڕژێ خولاسەخۆی پی‌ڕانەگیرا گوتی هەتاعالەم نەیزانیوەباعیلاجێکی بکەم.خوشکی بانگ کردەژۆری:ئەرێ حومەیرا!خۆئەمن ئەتوم پێ لەزۆرپیاوان پیاوتربو،ئەووەزعەی ئەمن دەیبینم چیە؟! حومەیرا لەقسەی کاکی حاڵی دەبی ئەگەردەڵێ چی وەجواب دێت :کاکە!ئەوەی ئەتو دەیڵێی هەروایە،حازرم بەقورحانێ یابەهەرچی باوەڕیت پێی هەیەسوێندی بخۆم هەرچی نێرینەیە دەستی وەدەستی من نەکەوتوە،تەنیا ئەوەندەیە ڕۆژێکی پاتۆڵی تۆم دەشوشت باغەڵی گەڕام شتێکی زۆر جوانی تێدابو بەئەندازەی دەنکەمورویێکی،ئەمنیش دەرم هێناوبەهەردولێوانم گرت وشیوم دەکردلەناکاو چۆدەگەرومەوەو بێئیختیارقوتدرا،لەوەی زیاتر هیچی دیکەم پێشك نایەت ئەوەشم پێ شتێکی وانەبوهەتاباسی بکەم،جائەتوش ئیختیارت هەیە،دەمکوژی،زگم دەدڕی،یاهەرچی دەیکەی ڕاوەستاوم،

تاهیرکە ئەوەی گوێ لەخوشکی بو،ئەویش وەبیری هاتەوەکەئەو ڕوژەی کەللەسەرەکەی شکاند.ئەودەنکە یاقوتەی لێ هاتەدەرو قسەی حومەیرایەی پێ ڕاست بوله سەری ڕاوەستا هەتا باری حەملی داناوکوڕێکی بو،ئەوکوڕەیەك ڕۆژەی دوڕۆژەبو.هەتا بوبەچوار ساڵا نە ناردیانە حوجرەی فەقییان بۆخوێندنێ، ئەوەندە زیرەك بو ئەوەی پێیان گوتبا تەنیا جارێکی، تازە لە بیری‌نەدەچۆوەو زۆر شتیشی لەخۆوە دەزانی وای‌لێ هات بە پێنج شەش ساڵان هەمو مەلایان نەیاندەتوانی دەرسی پێ‌بڵێن، مەلای شارە گچکەلانەکەی خۆیان ڕای‌گرتبودەرسی پێ‌دەگوت، نێویان لەئەو کوڕەی نابو کامڕان لەنێوعالەمێ بڵاوببۆوەئەگەر ئەوکوڕە لەدەنکەیاقوتێکی پەیدابوە.پێیان دەگوت کامڕان یاقوتی،

نەزاندرا بو پێیان‌گوتبو؛ بۆیان گێڕابۆوە،بابی تاهیری کەدەبێتەباپیری کامڕانی بەفتوای قازی ئەوشارەی کوژراوەبۆچی وبەچەبەهانەیەکەی مەعلوم نەبو. ڕۆژێکی لە حوجرەی لە لای مەلای دەگەڵ موستەعیدوفەقێیان دەرسیان دەخوێند پیاوی پاشای هات و کاغەزێکی

وەمەلای‌دا، مـەلا کاغەزەکـەی خوێنـدەوەو زۆری پیٚ‌تێـك چـو، چونکەپاشـای ئەوشـارەی لەسەر ڕعیەت وبێدەسەلاٚتان زۆربەزاکون بوتەواوی خەڵکی شاری ودەوروبەری لیی تۆقـی بون ،کامران لەناڕەحەتیٚ مەلای حاڵی بوولیی‌ٚپرسی:ماموٚستا ئەوەچیەبوٚوا تێکچوی؟!

مەلاش کاغەزەکەی کردەوەوئاوا بەدەنگێکی بەرز ئەبەئەوجورەی بوٚیٚخوێندەوە ؟ : بە نێوی خوای مەزن، جەنابی مـەلا یاسـین! هەمومـەلاکانم کوٚکردونەتـەوە،جەنابیشـت بەگەییشتنی ئەوکاغەزەی تەشریف دێنی بوٚدیوانیٚ ئەگەرتوانیوئەومەسەلەم بوٚحـەل کـەن (ئەمەلەحەوزی حەسارێداماسـیمان زۆرن، خـانم چوٚتەسـەرحەوزیٚ وبەماسـیەکانی گوتـوە ماسینە !ئەگەر ئیوەنێرن نەزرتان لەمن حەڕامبێت وئەگەر مێن نەزرتان لەمن حەلاٚڵ بێـت، ماسیەکان بـەخانمیٚ پێکـەنیون) ئـەوە چاکـە دەناهـەرچی لییٚبپرسـم و نـەیزانیت سـەری دەبڕم؛ موستەعیدوفەقێیەکانیش ئەگەرگوێیان لەکاغـەز خوێندنـەوەی مـەلای بوئـەوانیش ترسان وچون خۆیان شاردەوە هەرچەند کەس کاری بەوان نەبو،بەلاٚم کامڕان لەمەلای چوٚ پێشیٚ:جەنابی ماموستا ی ئەوکاغەزەی وەمن‌دەو ئەوکارەبەمن جیٚ بەجیٚ دەبیٚ ئـەتوٚش بچوٚ دەجێیەوە وبلٚیٚ ئـەمن نەخوٚشـم جانـەمن دەچم لـەجیاتی توٚجوابیـان دەدەمـەوە؟ مـەلاش لەخودای دەویست لـەئەوبەلاٚیەی خلاسـی بێـت، کاغـەزی وەفـەقیٚ کـامڕانی دا وبوٚخوٚی چوٚوەماڵیٚ وخوٚی نەخوٚش کردو دەجێی کەوت،

پیاوی پاشای هاتەوە،گوتی جەنابی مەلای فەرموبودیوایی پاشای،

مەلاپێی‌گـوت ئـەمن نەخوٚشـم،ئەوەمـەلا کـامڕان لەحوجرەیـەدێت بوٚحـەلکردنی مەسئەلـەی پاشای؛پیاوی پاشای هاتەحوجرەی:کوا مەلا کامڕان کێیە ؟کـامڕان هاتـەپێش پیاوی پاشای؟:مەلاکامڕان ئەمنم.پیاوی پاشـای دەڵـیٚ پاشادەسـتوری‌داوە وەرەبـابرۆین بوٚدیوانیٚ.مەلا کامڕان:برۆوعەرزی پاشای بکەئەمن ئەومەسئەلـەی بوٚحەل‌دەکەم بەلاٚم ئاوا بەسوك وهاسانی نایم بوٚدیوا نی بوٚحەل کردنی ئەومە سەلەی واگەورە.

پیاوی پاشای:چ بکات؟چوٚن‌.دێیەدیوانیٚ؟!مەلا کامڕان دەڵیٚ دەبی پاشـا کاغـەزێکم بوٚبنوسی لەبارەی حەلکردنی ئەومەسئەلـەی هەرکارێکی بیکەم کەس حەقی نەبیت ڕێگام

پێبگریت ویالەقسەم بچێتەدەرێ پیاوی پاشای چۆەدیوانی ئەوەی بەپاشای ڕاگەیاندو پاشابەبێ بیرکردنەوەلەترسی خانمێ کاغەزێکی بەنێوی مەلاکامرانی نوسی،هەرکارێکی مەلاکامران بیکات هەتائەومەسئەلەی لەمەلایانم پرسیوەحەلی دەکا کەس حەقی نیە دەستی وەبەردەسی بێنی هەرکارێکی مەلاکامران بیکا،ئەمن کردومەو،بۆی نارد،

بەڵێ مەلاکامران کاغەزی خوێندەوەودەباغەڵی ناو.دوکەسی ناردن:بڕۆن قازی شاریم بۆزین ولغاوکەن وبۆم بێنن،حوکمی پاشای پێبو،کەس نەیدەتوانی بێقسەیی بکات،چون قازیان بۆزین ولغاوکردوهێنایان، سواری قازیبو،بەلەقەلەق چولەدەرکی پاشای دابەزی، جارێ لێرەتوڵەی باپیری لەقازی شاری کردەوەچابوقازی برەکی بەبەرەوەبووکامرانیش چوکەڵەدەناهەرلەوێقازی دەپسسا،چۆو ژوری،تەواوی ئەوهەمو مەلاو وەزیروناییب وکاربەدەستانە،لەوێ دەستەونەزەری پاشای ڕاوەستابون،هەموی سام گرتبونی.لەژورێ کەدانیشت،ئاوقاوەیان هەرچی بۆیان هێناخواردیەوەوڕوی دەپاشای کردوگوتی جەنابی پاشای! مەڵێ نازانی ،بەڵام پێمخۆشەلەمانای پێکەنینی ماسێ گەڕێ.

پاشا:نەخێر! لێیناگەڕێم دەبی بیزانم.

مەلا کامران ڕوی دە پاشای کرد:ئاخر پاشا پێمخۆشە باسی شتێکی دیکە بکەی وپرسیاری جوان وباشترم لێبکەن لە مانای پێکەنینی ماسێ گەڕێ.

پاشا:نەخێرئەمن مانای پێکەنینی ماسیەم دوێ. مەلا کامران لەپاشای حاڵی دەبێ چەندخوێرپەودەبەردەستی خانمێ داچۆن کوڵیووبێ دەسەڵاتە؟

دەڵێ پاشا!باب وباپیریشیت بەئەوکەریەتیەی چونە لییگەڕی؟

پاشا:نەخێر؛ لێیناگەڕێم، دەبی باسی باب وباپیرانیشم بزانم، بۆم بگێڕەوە، مەلا کامران:هەر لییناگەڕیی؟

پاشا:نەخێرلێی ناگەڕێم،بەڵام دەپێش دا دەبی باسی باپیرمم بۆبگێڕیەوە؟

مەلا کامران:پاشا! باپیرت زێدەلەپەلەوەران توتیەکی هەبوچونکەئەوتوتیە ئەوەندەزیرەك وزانایانەحەمایەت کرابو.توتیش لەماڵەباپیرت زۆر ڕازی بو،ئەوتوتیەساڵێ

جارێکی دەچۆوەهیندوستانێ ودەوەختی دیاری کرا ودا وبیێ دوا کەوتن دە هاتەوە؛ جارێکی توتی حازربو بچێتەوە هیندوستانێ پاشاپیێگوت توتی گیان ئەوجارئەگەر چویەوە هیندوستانێ دیاریەکم بۆبینەوەك د یاری کەس نەبیت؟

توتیش گوتی بەچاوان توتی چۆهیندوستانێ وهاتەوە،پاشالێیپرسی:ئەدی توتی خۆشە ویستم کوادیاریەکەی من؟توتی وەبیری هاتەوەگوتی ئەوەتالەبن بالم بەستراوەتۆوی جورەسێویکم بۆهێناوی،قولکەی بۆهەلقەنەوبی چێنەوڕۆژێ جارێکی ئاوبدە،شینئدەبێت و یەك سالەبەری دێنێ؟ئەتۆسێوی بەری ئەودارەی بخۆی،دبیەوەسەرحەدی چواردەسالێت،

؛ بەلێ؛پاشابەدەستوری توتیە، تۆوەکەی چاند، دار هەستا، گولی کردو چواردانە سێوی پێوەبو، سێوەکان گەورەبون، یەکیان سێوێکی سوروگەش وجوان بو،

پاشا تکایەلەمانای پێکەنینی ماسێ گەڕێ.

پاشا:نەخێرهەردەم هەوێ.بەلێ وەزیرئەگەرئەوەی زانی چونکە پاشا وەجاغکوێرو بەتەمای جێی پاشای بوگوتی بابمرێ، ئەمن سەرەك وەزیرم و دەچم لە جێی پاشای دادەنیشم؛ چو دەرمانی بۆدەنێو سێوەسورەکەی کرد، پاشاش بەیانی زوچوسێوە سورەکەی لێکردەوەو هێنایە دیوانی بیخوات؛ تەوا وی کاربەدەستانی پاشای مانع بون و گوتیان دەعبایەکە،قسەی ئیعتیباری بۆنیە بابیدەنەمالاتێکی پیر ئەگەرجحێلبۆوە،جا ئەوجار ئەتۆ سێوە کەی دیکەبخۆباسێوی سورنەبی زەرد بی ؟ بەلام سەرەك وەزیر بێ قسەوبێ دەنگ بو،بەلێ چون کەرێکی پیری پشت برینداریان دیتەوەو سێوەکەیان دایە خواردی دەست بەجێ کەرەکە تۆپی، دەگەل ئەو خەبەرەیان دا بە پاشای ئەویش بە بێ ئەوەی لێیبکولێتەوەیان لەتوتیەبپرسێ توتی گرت وسەری هەلپساندوفرێیدا ئیدی سیوەکانی دیکەی لەبیرچونەوە؛ ژن ومێردێکی پیرباغەوانی پاشای بون، ئەوخەبەرەیان زانی بوکە ئەوسێوەژەهری تێدابوەوکەری تۆپاندوە؛ ڕۆژێکی ئەو ژن ومێردەبەشەڕدێن. ژنە:دەچم ئەوسێوەی دەخۆم بابمرم ولەکولە تۆببمەوە.غاردەدا سێوەکەی دەخوات و دێتەوە سەرحەددی چواردە سالێ و،بانگی مێردەکەی دەکات: ئەتوش وەرەئەو سێوەی

بخو، ئەمن خواردم جحێڵ بومەوە کابراش هات سێوەکەی دیکەی خوارد، ئەوەیش جحێڵ بووە، سێوەکەی دیکەشیان لەترسی پاشای لەبەینبرد پاشا کە ئەوەی زانیەوەلەداخ و حەسرەتێ زیاتر هیچی بۆنەکراولەحەیفان دیقی کرد ..

پاشا تەکایەلەمانای پێکەنینی ماسێ گەڕێ زەرەرە.

نەخێر هەردەم هەوێ ،ئەوەبەسەرهاتی باپیرم بو،بەسەرهاتی بابیشمم جارێ بۆ بگێڕەوە.

بەڵێ بابت پاشابو پاشایەکی زۆربەقودرەت وبەزاکون بو،پاشا ڕۆژێکی وازی ڕاویێ هەستا، تەدارەکی ڕاویان بۆگرت ولەگەڵ چەندوەزیروکاربەدەستان ڕۆییشتن بۆڕاوێ، بازێکیشی هەبوبەدایمەهەرلەسەرپاشای دەگەڕا،دوای ئەوشاخ وئەوکێوگەڕانێ گەینەبەردەلانێکی ئیشکاروو پاشا تینوی بورزۆرگەڕان ئاویان وەدەست نەکەوت دوایە تەماشایانکرد لە ئەشکەوتێکی،ئاوێك تك تك دێتەخوارێ،قاپێکیان لەبندانا.پاش ماوەییەکی دییتیان قاپەکەنیوەبوە،چون بی هێنن پاشابیخواتەوە،ئەوبازەی کەهەمیشە دەگەڵ پاشای بو، باڵێکی لێداوئاوەکەی ڕشت، پاشا کەئەوەی زانیوەگوتی ئەمن ئەوەلەتینوان دەخینکێم ئەویش ئاوم لێ بڕێژی وەڵلاهی دەیخۆی بێ لێکوڵینەوەئەویش بازەکەی گرت و سەری هەڵپساند،جابەبڕیاری یەکێك لەگەورەپیاوانی شای چونکەئەوزانی ئەوبازەبەخۆڕایی ئەوئاوەی نەڕشتوە دوایەچون هەتابزانن ئەوئاوەلەکوێڕا دیت، تەماشایان کردئەوە هەژدیهایەك توپیوەو،ئەوئاوەژەرو زوخاوی ئەوهەژدی هایەیە دێتەخوارێ،وەختێك ئەو مەسئەلەیان بۆ بابت گێڕا وەو ئەگەرئەوبازەگیانی توی نەجات داوەلەحەسرەت خواردنێ زیاتروپەرۆشی بازەکەی هیچی دیکەی لەدەستنەهات وەهەربەئەوحەسرەتەی وەچەند حەسرەتی دیکەوەمرد،ئەوەش بەسەرهاتی بابت بو.

دیسان ڕوی دەپاشای کردوگوتی خواهیشم ئەوەیە؟لەمانای پێکەنینی ماسێ گەڕێ. ئەوەی ڕۆیشتوە.ڕۆیشتوەلێی گەڕێ زەرەرە؟

پاشا:نەخێر لێیناگەڕێم،هەردەمهەوێ.مەلاکامڕان دەڵێ هەردەتهەوێ؟!

:بەڵێ هەر دەمهەوێ؟ مەلاکامڕان ئەوجار:پاشا وەپێشمکەوە بۆ ئەندەرونێ.

پاشاوەپێشکەوت مەلاکامران لەدوی پاشای وەزیرونایب وچەندمەلایەك بەنوێنەرایەتی لەلایەن مەلاکانی دەدیکانە کەوتنەدویان.چونەحەرەمخانەی؟

مەلا کامران بەخانمیێ گوت خانم!تکایەلەمانای پێکەنینی ماسیێ گەرێ.

خانم:نەخێر، لێیناگەریم دەبێ بزانم ئەودەعبا بێ زمانە بۆبەمن پێ دەکەنی خۆئەمن شتێکی وام نەکوتبو.

ئەوجارمەلاکامران لێیانتورەبو.لەیەك دو وەزیروئەوچەند مەلایانەبەدەر هەموی بەپاشایەوە،وەدیوی دەرێ نان چونکەحاڵی بو دەئەوحاڵەتەیدا پاشا لەترسی خانمێ لەبڕیارەکەی خۆی پەشیمان دەبێتەوەوناردنێ دیوێکی دیکە،خانم چل قەرەواشی هەبون لەنێونەوچل قەرەوا شەیدا،قولەیەکی زەلام و مل ئەستوری بە خۆی فێر کردبو بەبەرگی ژنان ، ڕەگەڵێ قەرەواشانی دابو.ئەوجارمەلاکامران هێنای تەوا وی قەرەواشەکانی لەدیوێکی کۆکردنەوەو یەکە یەکە،ڕوتی کردنەوەو.تەماشای کردن دەگەڵێ مەلا کامران دەستی بەئەوکارەی کرد خانم لەرزی وزانی سیرڕی ئاشکرابوبەلام چی بۆنەکرا وپاشاش لەوێ نەمابوئەمری پێ بکا،ئەگەرگەییشتەقولەی. هەرچەندی خانم هاواری کرد لەوەیگەرێن ئەوەجێگای موتمانەی خۆمەولەکوێم ڕاهیناوەو هەرهاواری پاشای دەکرد وپاشاش لەوێ نەمابوئەمری پێ بکات بریارەکەی هەڵبوەشێنێتەوە،یابڵێ مانای پێکەنینی ماسیەم ناوێ مەلا کامران هەرجوابی نەداوەچونکە هیچ کەسی دی نەیدەتوانی لەقسەی بچێتەدەرێ.قولەشی لەپێش چاوی ئەوچەند وەزیرونایب ومەلایانەڕوتکردەوەو ئەوجاردەستوری دا؟پاشاوەهەموەزیرونایب ومەلایەکان بێنەوەژورێ ئەوانیش ئەگەرهاتنە ژورێ وەهەمودیتیان کەئەوەقەرەواش نیەونەوەپیاوەبەئەوجورەی بەرگری لەکوشتنی مەلایان کردو سرڕی خانمێشی بۆپاشاوەهەموعالەمێ ئاشکراکردبەلام پاشابۆخۆشی چونکەهەرهیچ دەسەلاتی خا نمێ نەبو،ئەویش هەربەداخ وحەسرەتانەوە مرد.

خانم قولەی بە خۆی فێرکردبو پێی نەزەر نەبو بە ماسیانی دەگوت ئەگەر نێرن نەزەرولەمن حەرام بێ ئەگەرمێن نەزەرولەمن حەلاڵبێ.

**باسێك لە مەلا ڕەسوڵی ئەدیب**

جارێکی مەلا رەسوڵی ئەدیب دەچێتە سێڵوێ ماڵە کاك حوسێنی حەمەدئاغای دادەنیشیت کاك حوسێن زۆری بەخێردێنی وزۆریش بەهاتنێ خۆشحالّ دەبێ چایەکی دەخواتەوەکوێخای مەزرایە وەژور وەتاغێ دەکەویت، ئێکی قوڵەی تێك سرماوەی مەچەك ئەستور؛ دیاربو.بۆخۆی موزەردبو.سمێڵی سپی ببون رەنگی کردبونەوەو لەبنەوەڕاسپیان لێ وەدەرکەوتبونەوە، سمێڵەکانیشی زەلام بون. مەلا ڕەسولّ ئەگەرچاوی بەئەوکابرایەی دەکەویت، قەڵەم وکاغەزی دەرد ێنێت ئەودو شێعرەی خوارێ دەنوسیت وکاغەزەکەی دە باغەڵی دەنێتەوە. کاك حوسێن ئاگای لەنوسینی مەلاڕەسوڵی دەبیت کوێخا وەزعی مەزرایەی بەکاحوسینی ئاواڕادەگەیێنی :ماڵە سوفی مستەفای توتنێ دەچەقێنن مام قادریش خاکاوی دەکرد، دودەستاویش ئاوبۆئەوبەری دەڕوا، کوێخا لەقسەکانی خلاس بو، هەروەدەرکەوت کاك حوسێن دەڵێ مەلاڕەسولّ ئەوە چبو نوسیت : مەلاڕەسولّ دەڵێ هیچ کاك حوسێن دەڵێ بەسەری من چبو؟!

مەلاڕەسولّ ئەوجارناچاردەبیت پێیدەڵێ ولێی ناشێریتەوە،کاك حوسێن دەڵێ وێمدە.بابیخوێنمەوە. مەلا ڕەسولّ دەڵێ بابەلێمخەرامەکەبابۆخۆم بۆت بخوێنمەوە:

ئەوەش شێعرەکانی مەلا ڕەسوڵی:

ڕەغبەت لە سەر ئەوجورە سمێڵانە نەماوە
وەك گوریەیی سورەکە بە دەم کەلبی سیاوە
نەمزانی سەری سورە بنی سورخونە مەنحوس
وەمزانی وەکی خۆیە سەگی تێنەڕیاوە

کاك حوسین زۆری پێیپێکەنی، پێی خوشبووزانایی ماموستای پەسند،دەکاوداوای لێ کردوەچەندڕۆژانی بەزیادیش لەلای بمینیتەوەوئەویش دڵی نەشکاندوە...

## کەچەڵی کەوان

دەگێڕنەوە کورە کەچەڵەیەك هەبوەبێکەس تەنیادایکیکی هەبودگەڵ خاڵێکی وخاڵەکەشی چی مەعلوم نەبوەچۆن بوتەخاڵ، کەچەڵ ،لەبەربێکەسیٚ و.. دەچوٚو بەر گوێلکان؛ هەمو ڕوژێ دوکەوی دەگرتن دەهاتەوەلەبەر ئەوکەوگرتنەی نێویان لیٚ نابوکەچەڵی کەوان.داروٚغەش کەوەکانی لیٚدەستاندن بەینێکی زۆر ئاوا ماوە لەدوایە، ولەداخی داروٚغەی ناچاردەستی لەگوێلکەوانی هەلگرت لیٚرولەویٚ دەخولاوە ئێواریەکی هەربەسەیر بەرگی کچێکی جیرانی دەبەرکرد،کەچەڵ دە دم وچاودا زۆر جوان چاك وشیرن‌بو، داروٚغەش وادەدەکەیٚ ژنی نەهیناوە،وئەوئێوارەی بەوێدا هات، کەچەڵ لە کن دایکی دانیشتبو، چاوی‌پیٚکەوت، عاشقی بو،هەربوٚیە ئەوێڕوژێ چاك وخوٚشی دەگەڵ پیرێژنیٚ کرد،دەنا قەت ...ی بەکلاوی نەپێوابو. دوایە گوتیٚ داپیرە !ئەوە کچی کیێە؟ کەچەڵ گوتی، بلیٚ کچی خوٚمەپێش کێشەوهیچ قسەوباسی دیکەت نەبیٚ ومتەقت لیٚ نەیە؛ پیرێژن گوتی ئەوەکچی خوٚمە،هەرلەماڵەخاڵی دەبوتازەهێناومەتەوە.پێش کێشە داروٚغە. ئیدی لەوەندەی زیاتربکوژبڕ پیرێژن هیچی دیکەی لەزاری نەهاتەدەریٚ داروٚغەش. گوتی ئەوە قبوڵم کردجیرانەکانیش لییان گوٚڕا وایان زانی ئەوەکچەوکەس حاڵی نەبووایان کردەپیس وگوریس کەچەڵ کەببوبەکچی پیرێژنی داروٚغە بەبیٚ لیٚ کو لینەوەناردی کەچەڵی مارەکردو گوتی هەتاکەس نەیزانیوەوکارەکەم لیٚ پوچەڵ نەبوٚتەوەو هەربە پەلەپەل بەرگ وشت ومەکی بوکڕی، کچە سوری گویستەوە.

### با بزانین کەچەڵ داروٚغەی چوٚن دەبەتلێنێ.

شەوێ پاش بلاوبونی عالەمیٚبوك لەپەردوی هاتەدەریٚ وبەناز خوٚی نشان دا،دوایە بەداروٚغەی گوت،داروٚغە ئەمن خێزانی توٚم،ڕوٚژێك دەبیت ئەتولەماڵیٚ نابی وپاشابوٚشتێکی دەنێریت یاکارێکی دەبیت، ناکریٚ هەتائەتودەگەڕییەوە هەرمەعتەل بن دەبی هەمو شتێکم نیشان بدەی. داروٚغە زوٚری پیٚخوٚش‌بو،بەلاٚم گوتی ئەوشوٚ ناکرێت،پاش دو سیٚ ڕوژی دیکە،بوك گوتی نەخێر! هەرئێستا دەبیٚ هەمو شتێکم پیٚ بلێی. بەلیٚ!

داروّغەناچاربو؛لای دیکەشی زوّری ئیشتیاچوّبوّ بوکــیّ وەپێشــیکەوت بــەتالّ تالّوکــە :ئەوعــەمباری گەنمیــە ئەوعــەمباری ئاردیــە،ئەوعــەمباری خواردەمــەنی وجووبــەرگ وسیلاح و.. بەئەوجورەی هەموی نیشاندان، دیوێك مابو،کەچەلّ دەیزانی ئەودیوەچەرخی تێدایە.بەداروّغەی گوت ئەودیوەچیەچی تێدایە؟!داروّغە گوتی ئەوە هیچی تێدانیە، بوك:نا! هیچ نابی، دەبیّ بزانم. داروّغە:ئەوە چەرخی تێدایە. بوك: ئەیەڕوّچەرخ چیە؟! داروّغە:ئەوەبەکاری توّنایە، ئەگەرپاشا رقی لەکەسێکی هەستا،دەینێرێت بوّ لای من، ئەمنیش ئەوی لەچەرخ دەدەم. بوك:دادەرکــەی بکــەوەبزانم چوّنــە،داروّغــە دەرکــی کردەوە.بوك چاوی پیّکەوت روی دەداروّغەی کرد:ئەوە چوّنی لەچەرخ دەدەن؟!

بوك شاقەلێکی خوّی وەبەردا، داروّغەبرێکی بادا هەتاکەمێك توندبو،بوك گوتــی ئەیەڕوکوڕەلەسەرەخوّ؛وەللاّ ئەوە شتی چاکەبەخوای دەبی کاری ئەوەم زوّربەجوانی فێرکەی ئەگەرئەتوّش لەمالّیّ نەبی ئەمن کاری پــیّ بکــەم دادەی جاریّ برێکم وێدەبزانم ئەمنیش دەزانم ئەتوّوەبەرچەرخی بدەم؛کەچەلّ زوّرزیرەك بوو.بوّیەشی ئەوکارەکردوخوّی کردەکچ بەهــەرجورێکی بی داروّغەی ببەتلّێنی داروّغەی بەدبەختیش وای لەخوّکردبو هەرچی کەچەلّ گوتبای دەیگوت بەچاوان،داروّغەشاقەلی خوّی وەبەردا.کەچەلّ بایداهەتا برێك توندبو،داروّغەهاواری لیّ بلّیندبو:کچیّ سەبر!کچی لەسەرەخوّ کچــی ...هەرداروّغە هاواری کرد وکەچەلّ هەلی بوّهەلّکەوت وبایدا هەتاهەموگیانی تیكشکاندوکردیەکەلاك. ئەوجار.کەچەلّ پێی گوت فێردەبی کەوان دەخوّی وحەقیان نادەی.کەچەلّ زوخوّی گوڕی وبەکەلێنێکیدا وەدەرکەوت چولە لایەکی دیکەوەدەرکەوت ودایکیشی ڕاگوێست وشاردێوە بوّخوّشی هێنای برێك دەرمانەسورەودەرمانی دیکەی دەتوّربەیەکی کردن،عەباومەبای دەبەرکردن وکەوتە نێوشاری، سیّ چوارمندالّی دەتوّقەوبەدفەڕی بانگکردن هەریەکەی دوشاییّ دانی وپێیگوتن وەدوامکەون وبلّێن مام حەکیم بوّکویّ دەچی؟!مام حەکیم چدەکەی؟!

ئەمنیش لێو تورە دەبم، بەردانیشو پیّدادەدەم لەدوام نەگەڕێنەوە ·ها،.

بەڵێ جاریٚ! کەچەڵ بەبەرگی حەکیمان کەوتەنێوشاری منداڵی وەدوکە وتن مام حەکیم چەدەکەی مام حەکیم ئەدی ئەوەدەچیەکویٚ کەچەڵ لێیان تورەدەبووبەردی پێی دادەدان ،ولە لای دیکەوە خەبەریان بەپاشای دا،مەعلوم نیەشەویٚ بوك یاکیٚ وچۆن بووە،داروٚغەی وەبەر چەرخیداوە هەموگیانی تێك شکاندوەوهەلاتوە.خولاسەبوکیش نەماوە.پاشا:دە بزانن حەکیمێکی پەیداکەن با دەرمانی بکات وەیان زانی بوکیش چۆتەوەماڵەکەی خۆیان ویالەکوێیە؛ وئەویش ببیننەوەچونەوەماڵەبوکیٚ نەپێرێژن مابونەکەسیش زانی لەکوێنە ئەودەستەی دیش گەڕان کەچەڵیان بەحەکیمی دیتەوەو بردیانە کن پاشای، پاشا پێیگوت ئەتوحەکیمی چی؟ کەچەڵ :حەکیمی نەخۆش برین و هەموشتێکی،پاشا: ئەمەبریندارێکن هەیەدەتوانی چاکیکەیەوە ؟حەکیم:با ببینم! حەکیمیان بردەسەر، داروٚغە ی، کەچەڵ:بەدەمان زەمان چاکی دەکەمەوە! پا شا:زۆر چاکە.

حەکیم بڕەدەرمانێکی لەقاچ وقولان هەڵسو، دوایەگوتی سێڵێکم بۆ بێنن دەگەڵ بڕێك داران،بەعزە دەرمانێك هەیە دەبی سوری کەمەوە دناکاریٚ ناکا. سێڵ و داریان بۆهێنا، هەروا وردەوردە خەریك بوخوی خافلاند هەتا شەویٚ، ئەوجار ئەوانەی والە دەورەی بون پێیگوتن برام! دوکتۆر برێك بیٚئینسافن، دەورەم چۆلکەن. دەورەیان چۆلکرد، پاشان قەلاشکەری وەبن سێڵیٚ دان و داروٚغەی لە سەر سێڵیٚ داناو پێیگوت فێردەبی کەوان دەخوی و حەقیان نادەی؛ دوایەبەکەلینێکیدا وەدەرکەوت و خوٚیشاردەوە چولەلایەکی دیکەی شاری وخەریکی کارێکی دیکە بووکەسیش نەی ناسیوە،

لای نیوەشەوی هەربوٚن چەك دەهات،چونەپشت دەرکەی هەرچەندی هەرایان کرد:مام حەکیم!دوکتۆر!کەس جوابینەداوەشائەمری کرد.دەرکەی بشکێنن بزانن چیە ؟ ئەگەردەرکەیان شکاند دیتیان داروٚغە سوتاوەولەسەر سێڵیٚ بەقەدئەوکەوانەی کەلە کەچەڵی دەستاندن ودەیخواردن بەقەدیەکێك لەوان مابوٚوە،هەرچەند دەورو بەری گەران

هیچ جێیەکی داروغەیان بۆهەڵنەگیرا.

بەڵێ! کەچەڵ بەئەوجورەی تۆڵەی کەوانی لەداروغەی کردەوە.

**دەداوخستنی کچی پاشای:**

پاشاخوی بەزۆردەزانی ودەشیزا نی ئەوەبوی دەبێتەدەردەسەرێکی زۆرگەورە؟ هەربویەکچێکی زۆرجوانی هەبولەدەرەوەی شاری خێوەتی بۆهەڵدا، وکێشکچی لەدەرەوەی دانان ئەوکچەچەندی جوان بوئەوەندش زاناووزیرك بو پاشا لەگەڵ کچەکەی ڕا وێژێ کردو بۆئەوەی ئەوکابراسەر بزێوەتەماحی تێ بکابەڵکوبەداوێ وە بی وچی دی گەورەنەبی کچەش بەقسەی بابی کردوهاتەدەخێوەتەکەی وهاتوچۆی دەریێ دەکرد ودەگەڕا ؟ کەچەڵیش ئەوکارەی بەدەستەوەهات فکری دیکەی چۆدەسەری چاوی بەکچی پاشای وکێشکچی وخێوەتێ کەوت، زانی تەڵەیان بۆداناوەتەوە،ئەویش دەستی کردبە دارشتنی گەلاڵەی کارەکەی وبیری کردەوەچەبکا،بەکۆلانان داهاتەخوارو هاواری کرد:کێ قەرزی لەسەربابم بوە هەتابیدەمەوە.کوڕەجولەکەیەك دەنێوئاودەستێداهەرای کردوگوتی بەحەزرەتی موسا(ع) ئەمنم.کەچەڵ:کوا دەستت بێنەهەتابتدەمەوە،کوڕەجو،نەچۆدەرێ وگوتی موفتەیەبانەم ناسیتەوەبیخۆم دە ستی بەقەڵشتەدیواری دادرێژکردکەچەڵ گوتی وەرە پێش، دوایە دەستی گرت وکێشای هەتابن هەنگلی وەدەرکەوت،لەبن پیلیڕا بەگوێزانێ، خشت دەستی کوڕەجویەی بڕی وهەڵات بردی چوپیلی خۆی لەبنەوەقایم کردو پیلی کوڕەجوی لەسەرەوە.وەدەرنا وشەوێ هێدی هێدی پارێزی بۆکچی پاشای برد پاش قسەکردنێ پێك هاتن. کچی پاشای گوتی هەڵدیێ؟! کەچەڵ:نا هەڵنایەم، ئەگەرلەهەڵاتنێم دەترسێی، ئەوەتادەستم ببەستە.دەستی کوڕەجوی وێداو بەستی وبەئەوجورەی خۆی گەیاندە کچی پاشای.چونکەکچی پاشاش سوێندی بۆخواردبوهەتاکاری دەگەڵ جێبەجێ نەکات؛ هاوارێ نەکا،ئاخرئەگەرکچی شای سوێندی بۆنەخواردبائەویش دەستی بۆبەستنێ وێ نەدەدا، هەرکاریان خلاسبوهاواری لێ بلێندبو؛ کەچەڵ تەکانێکی دا خۆی، چونکە پیلی کوڕەجوی هەربەحاستەم قایم کردبوو،هەربەئەوتەکانەچوکەی، بەنەکەی

پساو.وبەجێماوکەچەڵ بۆخۆی هەڵات، کێشکچی هاتن ودیتیان پیلێکی تەواوبەجێماوە بەیانی ئەوخەبەرەشیان دابەپاشای، دەستوریدا، خێوەت وبارەگای بێننەوەو بزانن کێ بێدەستە، بیگرن؛ پاش گەڕانیکی زۆر کورەجویان دیتەوە دەینالاند لەتاوی دەستی؛ کورەجویان گرت،بەبریندای پاش زۆر لێرولەوێ دانێ مەعلوم بوکاری وی نیە،کورە جوویان بەرەڵلا کرد.

بەڵێ ئەویش واهات؛ کچی پاشای ئاوس بو، پاش وەختی خۆی کوڕێکی بو. کورە زەلام بو پێی هەلگرت بو؟بەڵام لەئەو بەینەیدا بزانین کەچەڵ چی کردوە.

## کەچەڵ و بەسەرهاتی خاڵی

پاش ئەوکارانەکەچەڵ چۆماڵەخاڵی (ماڵە خاڵیشی هەرلەئەو شارەی بو)غەرەزی کۆنی لەخاڵی بویاچۆن وچی بەخاڵی گوت خاڵەوەرە بچین هەرچی هێلکەن لەقەلێ دزی؟ (خاڵی کەچەڵیش کاری هەردزی بوە)گوتی زۆرچاکەبابچین!کەچەڵ دەگەڵ خاڵی چون بۆ دزێ هەتاخاڵی هێلکەی لەقەلێ دزی، کەچەڵیش پاتۆڵی لەخاڵی دزی.

خاڵی گوتی بمناسەکەچەڵ بزانەچۆنم هێلکەلەقەلێ دزی ها !کەچەڵ گوتی وایەبەڵام هەتا ئەتۆهێلکەت لەقەلێ دزی ئەمنیش پاتۆڵم لەتۆدزی خاڵەگیان.خاڵی ئەگەرئاوا تەماشای خۆی کردو:کورەخۆپاتۆڵم دەبەردانەماوە.کەچەڵ:خاڵەجانەوجار وەرەبابچینەدزێ.

خاڵی کەئەودزیەگەورەی بەکەچەڵیوەدیت ڕەگەڵی کەوت، ڕۆییشتن بۆدزێ ئەوێ شەوێ،چون لەخەزێنەی پاشای دوتێلەکەیان دزی ،بەیانی خەبەریان بەپاشای دا :پاشابەرگی نوێت لێ مەبارەك بێ ئەوشۆدوتێلەکەیان زێڕلەخەزێنەی دزیوە.

پاشابەیانی دەگەڵ چەندکەسی دی چوتەماشای کردوگوتی ئەوکونەی مەگرنەوە تەماعیان ڕەبەردەکەویت ودێنەوە؛بێنن خەندەکی لێدەن، ئێوارێ خەندەکەکەی پڕکەن لە قیر، ئەمری پاشایان بەجێگەیاند.کەچەڵ،لای ئێوارێ لەنێو شاری دەسووڕاوەوچاوێکی بە کونەکەی داگێڕادیتی کونەکەنەگیراوەتەوە،بەڵام زانی حیلەیەك دەئەوکارەیدا هەیەهەربەخۆڕای نیە؛ هاتەوەماڵێ گوتی خاڵەکونەکەی خەزێنەی پاشای هەروا ئاواڵەیە

پێم وابی هەرنەیان زانیوە. شەوێ دیسان بەخاڵی گوت بائەوشۆش بچین نەردێکی بێنین. خاڵی قبوڵی کرد وەڕێکەوتن، کەچەڵ هەتا نیزێکی خەندەکێ وەپێش خاڵی کەوت،لەنیزێکی خەندەکێ لەفێڵەکەی حاڵی بو.وەك شوێکی لەدمی دەی گەڕاوە. خاڵی گوتی ئەوە چبوکەچەڵ! بۆ گەڕایەوە؟! کەچەڵ:هیچنەبو، ڕاستی ئەمن زۆرنەزانم چۆن دەبێ پیاو وەپێش خاڵی کەوێت، خاڵەگیان فەرمو! بەئەوجورەی خاڵی وەپێش خویدا. دوسێ شەقاو ڕۆییشتن خاڵی دە قیرێ کەوت وگەرمای ئاخری بەهارێی وقیر شل هەتا دەجولاوە پتردەچۆخوارێ. کەچەڵ پیێ لەسەرشانی خاڵی داناوچوتێلەکێکی لە خەزێنەی هێناو.ودوایەگەڕاوەبولای خاڵی تێلەکێکی دیکەشی هێناوچەقوی لەخاڵی هەڵکێشا، خاڵی گوتی ئەوە چ دەکەی؟! کەچەڵ دەڵێ سەرتدەبڕم!خاڵی فەقیر: کوڕە ناکرێ! نابێ.کەچەڵ :خاڵە، ناکرێ، نابێ نیە؛ سبحەێنی ئاشکرادەبیت وئابڕوم دەچیت؛ سەری خاڵی بڕی ودەگەڵ تێلەکەی خاڵی بردیەوەماڵێ وگوتی هانێ خاڵۆژن. خاڵۆژنی گوتی ئەوەچیە؟کەچەڵ:ئەوەسەری خاڵمە.خاڵۆژنی دەستی کردبە هاوارو بەسەری خۆدادانی ئاياڕوقوڕم وەسەری و...بابانم خەرابوو..کەچەڵ گوتی تازەکارە هاتوەبێ دەنگەی لێ بکە،دەناچارەم نیەدەنگت لەبەربێتەدەرێ وەکوخاڵم سەری تۆش دەبڕم.

بەڵێ! خاڵۆژنی بێدەنگ بو. بەیانی خەبەریان بۆ پاشای بردکەئەوشۆ دوتێلەکەی د یکەشیان لەخەزێنەی بردوەو حیسانێکی بێسەریشی لێ بەجێماوە. پاشادەستوری داجارێ کونەکەی بگرنەوەوئەوکەلاکەی لەسەر.ڕییەکانی ژنان کانیەکە،لەئاوەدانیە یالەشاری بڕێك دوربوهەلاوەسن، هەرژنێکی دیتوبوی دەگری بیگرن وبیهێنن بوئیرە، چل کەسیشی کێشکچی لەدەورەی دانان؛ کەچەڵ چاری پێکەوت لەداوەکە ی حاڵی بو. چوگەڕا، کابرایەکی دەوڵەمەند کەرێکی پێبوتازەزابو،پاشوی جاشکەکەی بەپەڕۆی بەستبون؛ چوکن کابرای وگوتی ئەوکەرەت بەچەندی؟ کابرا:نایفرۆشم؛ کەچەڵ:ئاخر لێت دەکڕم.کابرا:نایفرۆشم بابم.کەچەڵ گوتی کوڕەئاخرلێتدەکڕم لێ.کابراگوتی بەپینج قرانان.کەچەڵ دەڵێ ئەوەت شەش قران.پولەکەی دابەکابرای وکەری بەجاشکەوە

هێناوەماڵێ جاشکەکەی لەتەویلەی بەجێ دەهێشت، کەرەکەی دەبردەدەرێ، بەدوسێ ڕۆژان تەوا وی کوچەوکوڵانی شاری بەئەوکەرەی شارەزا کردو.لەهەرجێیەکی شاری بەرهەڵلات کردباتەقڵەکوت دەهاتەوەماڵێ بۆسەرجاشکەکەی.ئەوجاربەخاڵۆژنی گوت :خاڵۆژن پێت خۆشەبۆخاڵم بگرێی.خاڵۆژنی بەترسەوەگوتی ئا.

کەچەڵ چودوگۆزەی نوێی بۆکڕی وبەخاڵۆژنی گوت بچۆکانیەئەوەمەیت خاڵم بەدارێ وەیە لەئەوسەرەی ئاوڕان مەدەوەدەگەڕانەوەیدالەبن دارەکەی کەلاکی خاڵمی پێوەیەگۆزان لێکدە وبیانشکێنەجابەتەواوی شینێ بۆخاڵم بگێڕەئەگەر لێیانپرسی بۆدەگری،ئەو کەلاکە چی تۆیە؟بڵێ کەلاکی چی دەدمی بابی کەلاکی ڕیم ئەمن خەسویەکی بێحەیام هەیەبچمەوەلەبەرئەوگۆزانەشکاون ڕامناگرێتەوە.بەڵێ،خاڵۆژنی وەکی کەچەڵ بۆیدانابو چۆ سەرئاوێ ولەگەڕانەوەیدا گۆزەی لێکدان،گۆزەشکان جاوەرەبگری وقوڕێ وەسەری خۆکە بەبیانوی گۆزان تێرتێر بۆمێردەکەی گریا، کێشك چی لێی خڕبونەوە:دایکم بۆ دەگریی؟!چبوە؟!ئەوپیاوەچی تۆیە؟!کارەڕوی داوە.ژنەپیاوی چی؟!گۆبەدمی بابی ئەو پیاوەی،ئەمن خەسویەکی بێحەیام هەیەبچمەوەڕامناگریتەوە،دەڵێ گۆزەت شکاندون! کێشکچی زگێیان پێیسوتا،تەوجێیان بۆکردپوڵیان بۆخڕکردەوەودایانێ وبەڕێیان کردەوە؛خاڵۆژنی کەچەڵی هاتەوەبۆماڵێ. کەچەڵ:خاڵۆژن! تێر گریای؟ :ئەریوەڵلا تێرتێرگریام. کەچەڵ بڕێکی دیشی تەمرین بەکەرەکەی کردوهات وچۆیی پێکرد.ئێوارێ لای ڕۆژپەڕێ بڕێکی کونەسیپاڵ وکەچەدەفەیەکی لەکەرەکەی بارکرد،بەخاڵۆژنی گوت ئەوشۆچاوەڕوان بەکەلاکی خاڵم دەنێرمەوە،ئەوەی گوت وجاشکەکەی لەماڵێ بەستەوەو بەبەرگی دەروێشان بەکن کێشکچیاندا،وەڕێکەوت کە ئەنەهودەڕۆم لەشاری وەدەردەکەوم.

## دزینەوەی کەلاکی خاڵی:

کێشکچیەکان لەمێژبولەجێگای دیکەولەوێبون وەڕەز بیون، گوتیان ئەرێ

ئەوشوبانەودەروێشەی لەکنە خۆمان ڕاگرین وبرێك سەیروسوحبەتی دەگەڵ بکەین. بەڵێ هەموڕازی بون ودەروێشیان بانگ کرد، ئەوەش قسەکانی(دەروێش) و کێشکچیەکان.
:دەروێش؛ بابم ئەوشوێلەنێوەمەبە.دەروێش :دەڕوم،کارم هەیە !
:کارت چیە ؟ !کارت هەرگەڕانە،چەندی دەلێی دەتدەینێ؛ئەوشولەنیومان بمێنەوە.
دەروێش:دەی باشە، چەندم دەدەنێ؟ قەراریان دانا هەر کەسەی پەناتێکی بدەنێ، دەروێش ڕازی بوو،بارەکەی ئێخست وکەرەکەی بەستەوەوهات دانیشت، وردەوردە تەماشای دارەکەی کرد(وای چاو لێکردکەئەننەهوچمەدیوەوئاگام لەهیچ نیە)هەتاگەییشتە کەلاکەکەی،کەلاکی دیت وگوتی ئەوەچیە ؟کێشکچیان گوتیان چ کارت بەوەی داوەئەوە کەلاکە. کەچەڵ (دەروێش) هەستا شت وەکی دەستدانی لێان پرسی.چ دەکەی؟ !
:بەخوای بابم ئەوکەلاکەکەرەکەم لێدەدزیت؛دەڕوم.کێشکچی:کوڕەوانیەکەلاکی مردوچۆن کەرێ دەدزی،دەروێش:دەیدزیت؛ ئەمن دەزانم لێرەنابم!
گەورەی کیشکچیان هات وگوتی ئەوەچیە ؟
ئەوانیش بۆیان گێڕاوەگوتیان ئەوەدەروێش دەلێ ئەوکەلاکەکەرەکەم لێ دەدزی گەورەی کێشکچیان:کە لاکی مردوچۆن کەرێ دەدزی کەچەڵ :بەلێ دە یدزی :زۆر باشە ئەگەرئەوکەلاکەکەری تۆی دزی ئەمن دەقرانت دەدەمێ دەروێش :باشە.قاقەزم بۆ بنوسە،گەورەی کێشکچیان چونکەقەتی شتی وانەبیستبو.کاغەزی بۆنوسی وئیمزای کردو وێیدا، ئەوێ شەوێ بەزمێکی بۆسازکردن ئەوەندەپێکەنی بون کەهەمولەخۆبونەوەو هەتالای ڕۆژی نەیەێشت کەس بنویت، ئەوی درێژ ببابپێلاقەیەکی پێدادەداوهەلیدەستاند ئاخر ی هەمو میلاك ببون هەرایان دەکردێ:بابە دەروێش بۆخاتری خودای! ئاخرکوێر بوین لەسویێ خەوێ لێن گەڕێ با بنوین. بەلێ ئاخیری دەستی لێ هەلگرتن؛ دەگەڵ سەری وە سەنیری کرد پرخەی لێ بلێندبوخۆی دەخەوکرد.لەبەربەزم و پی کەنینی لەبیریان چوبوگێشکچیان دانین،کەچەڵ وای خۆبێ نمودوپیس کردبوهیچ بیرێکیان لێ نەکردەوە،هەموخەویان لێکەوت، کەچەڵ هەستاکەلاکی لەدارێ کردەوەلەکەریێ قایمکردو

وشەپێکی لەکەرێ داوگوتی برووەبومالێ؛ ڕەژێاوی گرتەوە، دم و لوتی خوێ وهەموانی ڕەش کرد، دەرویش دوایەلییێنوست.تاوهەلاتێ بەپێکەنین وفرق وهوڕی کێشکچیان وەخەبەرهات، خوێ لەداری نەزانینێ دا :ئەوە بە چی پێدەکەنن؟! ئاوێنەی لەباغەلی دەرهێناوتەماشای خوێ کرد، دم و چاوی هەمو ڕەشکرابو گوتی ئەوە کێ وایلێکردوم؟! ئەلحان دەچم شکایەتێ دەکەم. گوتیان کوڕە شکایەتی چی؟! هەمومان وەکو توێین.دەرویش کە تەماشای کردن ئەوانیش وەکو خوێ دم وچاویان ڕەشببو. دەنگی نەکرد بڕێك ڕاوەستا.لەناکاو:ئەدی کەرەکەم کوانێ؟ بەلایەکی دا هەلات هیچی نەدیتەوە،گەڕاوە،ئەوجاربوڵای دیکە هەلات دیسان کەرەکەی نەدیتەوە، گەڕاوە تەماشای کردکەلاکیش نەمابو:ئاها !نەمگوت ئەوکەلاکەکەرەکەم لێ دەدزیت ئەگەردەرویش گوتی کەلاك کەرەکەی لێ دزیوم جاکێشکچیان زانیان کەلاك نەماوە؟! دەڵێ بێنن پوڵەکەم دەنێ دەی؛بەڵێ؛بیست قڕان حەقی شەولەوێمانەوەی ودەقرانیشی پوڵی کەرەکەی لێئەستاندن.(چونکە کاغەزی لێئەستاندبون نەیاندەتوانی پوڵی نەدەنێ) دەرویش کونەشمەکی بەکوڵێ داداان وبەرەومالێ وەڕێکەوت کەگەییشتەوەماڵێ گوتی خالوژن !کەلاکی خالم هاتەوە؟!خالوژیی:بەڵێ هاتەوە.:جاتێری بوبگری.جارێ با لێرەبیت دوایەدەیبەم دەینێژم. بەیانی کەکێشکچیەکان چونەوەبوکن پاشای پێیان گوت قوربان؛کەلاکیان لێدزیوین.پاشا هەموی دەحە پسێ کردن ئەوخەبەرەش ئاوابلاوبوەوە.

ئەو پاشایەبرایەکی هەبولە شارێکی دیکەڕالەسەرێك لەسەریك لومەی دەکردو قسەی دەنارد:ئەوە هەرئێکێکە ئەوکارانە دەکات. جاچوَن ئەتو پاشایەکی، کابرایەکی برەڵلات بوناگیرێ وبوت تەنبێ ناکرێ.

## با بزانین وشترێ سپی چاوڕەش چوَن دەکوژێتەوە

پاشا،وشترێکی هەبو، ئەگەرلەسەرکویەزێڕی لەوەڕاباکەس غیرەتی نەبودەنگی دات کەچەلێ چوباقەیەکی وینجەکڕی وبەبەردمی وشترێدا هات، ئەگەر کەس دیارنەبا بانگی دەکرد ئەگەر خەڵکیش دیاربا دەنگی دەداولەخوێ وەدوردە خستەوە.وردە وردە

هێنایەبەردەرکێ، پاش نوێژی شێوان وشتری کوشتەوەلەت لەت وپیل پیلی کردوبردیە ژوری ماڵێ هەمو.ولاّتی خاوێن کردەوەونەی هێشت هیچ شوێنێکی لێ بمێنێ تەوەخەبەریان بەپاشای دا،ئەگەروشترێ سپی چاورەشیش نەماوە ! زۆرگەڕان، خەبەرێك نەبو، پیرێژنێك هەبونێوی سوری عەیێاربو ئەوپیرێژنە وەکونێوی خۆی بگرەزیاتریش عەیێاربو، بانگێیان کرد پاشاپیی گوت سەرێکت بەزێڕی هەڵدەکێشم وسەری دیکەشت بەزێوی؛ ئەگەروشتری سپی چاورەشم بۆ ببینێ وە.

پیرێژن:قوربان!سەرێکم بەورکەنانی هەڵکێشەوسەرێکیشم بەورکەپیوازی،بوّت دەبینمەوە.

وا وێدەچی ئەوقسە،رەسم وعادەتی ئەوجورەجاسوس وسیخوڕانەبوە.

## نۆرەی سورێ عەیێارە

سوری عەییار.وەنێوشاری کەوت، دەستی بەگەڕانێ کرد زۆرسوڕاوە هەتاگەییشتە ماڵەکەچەڵی هەروەژورکەوت دەستی کردبەپاڕانەوەی کەچەڵیش لەماڵی نەبو،بەقوربانت بم ئەوەبوکێکی سەڵیتەم هەیەمەگیرانێ لەگۆشتی وشترێ دەکات، ئەگەرهەتانە هەرچەندی بێ لە رێی خودای‌دا بمدەنێ. خۆپوڵیشم نیەلەبازاڕی بۆی بکرم خالۆژنی کەچەڵی فریوی خواردو لای دیکەشی زۆری زگ پێ سوتاو گوتی ئەوەلەبازاڕی کڕیبویان هەرئەوەندەشمان ماوە، بەقەراپەنجەدەستێکی دەبوویێداوسوری عەیێارڕۆییشت دەدەرکێ‌دا کەچەڵ گەییشتەوە،گوتی ئەوەچیەداپیرە؟ پیرێژن دەڵی داپیرەت سەدجاردەسەرگەڕێ بوکێکی سەڵیتەم هەیە.مەگیرانیەلەگۆشتی وشترێ دەکاجانەوژنەنازانم چتەخودائیمانی بەنسیب کات، ئەوەندەی داومەتێ دەچم بوێ دەبرژێنم؟

.کەچەڵ زانی ئەوەکارێکی بەدەستە:وەرە.وەرە داپیرە! کۆڵەپاشام کوتاوە.وشترەکەم کوشتوّتەوە وەرە لاپیلێکی بەرەوە هەموتان بیخۆن دەرێیەخودای دا.

.سوری عەیێارتەماعی رینیشت وبەخۆی گوت باشەهەتازۆرتربی چاکتر. ئاشکرادەبیت، دەگەڵ کەچەڵی چۆزۆری هەتاسەرکەلاکی وشترێ وکەچەڵ دەڵێ! ئەوە کەلاکی وشترێ پاشایە!سوری عەیێارچۆ ژوری کەلاکی دیت، کەچەڵ ڕۆبۆپیلی پیرێژنی،لینگی

دەبەرلینگی ناکردێەدوپیرێژن وهاویشتیەسەرگۆشتی وشترێ وگوتی ئەوەهاتوی سیرپی کەچەڵی ئاشکراکەی.کەچەڵ چوبەخاڵۆژنی گوت ئەوجارمسقاڵەگۆشتێکی بدەیە هەرکەسێکی وەك سوری عەیێاردولەتت دەکەم و دەتەهاوێمەسەرکەلاکی وشترێ ..ها.

خاڵۆژنی زۆری لێ ترساوبریاری دا لەقسەی دەرنەچی.

خەبەریان بۆپاشای بردکەسوری عەیێاریش بێشوێنە. هەرچەندگەڕان هیچ خەبەرێکیان وەدەست نەکەوت.

**با بزانین کەچەڵ کوڕەکەی چون دەدزێتەوە**

پاشاهەموحەولەکانی بۆ.وەدەست هێنانی ئەوکابرابەدفەڕەی بو؟

ئەوجارهێنای میوانێکی گەورەی ڕێك خست،هەموخەڵکی شاری بانگ کردوهەرجاڕیان ڕاهێشت کەچەڵ زانی چ باسەوچودوفەرخەکەروێشکی کڕین وعەباو شرۆشالآتی وەخۆ خستن وکەروێشکەکانی دەبن عەبای نان ورۆییشت بۆمەجلیسێ،کوڕەکە(کوڕی کچی پاشای ئەگەرکەچەڵ چۆبۆکنی و ...) گەورەببو، هێنایان لەنێومەجلیسی بەرهەلآیانکرد، گوتیان خوێن دەبزوێ، بزانین بۆلای کێ بچێت، ئەوبابی ئەوکوڕەیە؛ پاشاش دەیزانی ئەوەهەرئێکێکەو ئەوکارانەدەکات،کوڕەکە یەك دوجاران بەتەمابوبۆ لای کەچەڵی بچیت، بەلآم کەچەڵ کەروێشکەکانی نیشان دەدان ئەگەرچاویان زەق دەچوکوڕە هەڵدەهات، شەویش بەسەردەستان داهات،لەناکاوکەچەڵ کەروێشکی بەپشتەوەدابەردان، کەروێشك کەوتنەنیومەجلێسی. بوبەهەراو هوریاو ... چرا کوژانەوە و ...، کەچەڵ بەفورسەتی زانی ورۆبۆکوڕەکەی ڕفاندی وبردیەوەماڵێ (چونکە ماڵیان لەوی نیزێك بو) بەخاڵۆژنی ئەسپاردوگەڕاوەمەجلێسی، د یتی خەڵکەکەئاهۆن بونەتەوەوهەرکەسەلەسەرجێگای خۆی دانیشتۆتەوە. هەرچەندی گەڕان کوڕەکەنەمابو، خەڵکەکەشیان کەبژاردن هەمویان تەواوبون. گوتیان کەس نەچۆتەدەرێ، کەچەڵ بەئەوجورەی کوڕەکەشی لەپاشای دزییوە وکوڕەی چاك تاقەت کردو کەوتەپێ‌وشوێنی پاشای کەلەسەرێك لەسەرێەك خەبەری دەنارد هەی عەمری نەمێنێ جاچۆن کابرایەك ئەوەهەموخەراپەی دەگەڵ بکاناژانیت و

نایبینێتەوەئەوەبۆنامری.

## با بزانین کەچەڵ برای شای چۆن دەداوەخات

کەچەڵ کەوڵەمەڕێکی کڕی، هەرلیسەپەی زەنگوڵێکی وێخست، کەوڵی دەستدایەو ڕۆییشت بۆشاری برای پاشای چولەوێ بەپرسیاران چوارباغی پاشای دیتەوەپێیان گوت پاشاچ ڕۆژێکی دەچێتەچوارباغی. کەچەڵ چودەنێوچوارباغیداخۆیشاردەوەو کەوڵەمەڕی بەخۆیداداچونکەئەوچوارباغەی شای چوارباغێکی گەورەوزۆریش خۆش بو، پاشا هاتە چوارباغی، لەنێوچوارباغی دەستی کردبەگەڕانێ لەبەربۆنی گوڵەکانی چوارباغی مەست ببوو لەبۆنکردنی ئەوگوڵ بۆبۆنکردنی گوڵێکی دیکە،ئاو.خواردنەوەوحەسانەوەولەبن سێبەری شوڕەبیەکان ئەوەندەدڵخۆشبوکەهۆشی لەخۆی نەبو هاتبۆ لای نوێژێ شێوان لەناکاوکەپاشادەوپەڕی خۆشی ودڵ خۆشیدابوشتێکی زۆربەسام خۆی ڕاوەشاندو بوبەزەنگەزەنگ پاشاکەدیتی ناچاردەستی بەهاوارکردنێ کرد:بۆخاتری خودای ئەتۆچی ؟ کەسیشی لەدەورەی نەمابوهاواری بکات؟!

کەچەڵ:ئەمن؟! حەزرەتی قابیزم وهاتوم ڕوحت بکێشم! پاشاهیچی پێنەما، دەستی بەپاڕانەوەی کردوگوتی ئاخرئەمن پاشام ئیجازەم بدە بچمەوەماڵێ وخوداحافیزێ لەمنداڵەکان بکەم.

کەچەڵ دەنێوکەوڵەمڕی دا،دەڵێ مردن پاشاوفەقیری نازانێ. پاشازۆری لەبەرپاڕاوە. کەچەڵ پێیگوت باشە! ئیجازەت دەدەم بەلام بەشەرتێك! هەرچی پێت بلێم قبولی بکەی و ئەنجامی بدەی ولەقسەم دەرنەچی.

پاشا:هەرکارێکی پێمبلێی جێبەجێی دەکەم. پاشازۆرچکوڵەببووە. کەچەڵ گوتی ئەمن دەتۆربەیەکت دەنێم ودەتبەمەماڵەپاشای برات لەوێ لەبنەخۆمت دادەنێم دەتکەمەبن قون و لەسەرت دادەنیشم داوای ماڵاڵلەی لەپاشای دەکەم، پاشاش داوا دەکات :شتێکم بۆبڵێ، ئەمنیش دەڵێم چ نازانم، دوبارەدەڵێ شتێکم بۆبڵێ، ئەمنیش دەڵێم پاشابەخودای هیچ نازانم، ئەرێ بن قونی من ئەمن هیچ دەزانم! ئەتوش دەڵێی بە

خودای پاشا، دەروێش فـەقیرەوچ نـازانێت، ئەگەرئـەوەی قبـولْ بکـەی بـەێنیکی دیکـەت مولـەت دەدەم. پاشاناچاربوولەمردنێش زۆردەترساقبولّی کردوئەوجێگایەی کەچەلْ بـۆی دیاریکردبوچولـەویْ چاوەڕوانی کەچەڵی بو.

## با بزانین لە ماڵە پاشای چ ڕوودەدات

کەچەلْ گەییشـتەلای پاشای‌پاشـای دەنێوتۆربـەی نـا کەچـەلْ زەلامێـك وپاشـاش چوکەڵەوچۆدیوانی پاشای وداوای مالّاڵلـەی کرد؛ پاشا:دەروێش شتێکم بۆبڵێ. دەروێـش دەلّیْ بەخودای پاشا چ نازانم پاشا:دەی‌دەی شتێکن بۆبڵیْ!دەروێش چۆن چ نازانم؟!

دەروێش:بەخوای پاشاچەنازانم؟ئەریْ بن قونی من ئەمن چ دەزانم؟!

پاشادەبن قونیْ کەچەڵی‌داوەجواب دیْ ودەلّیْ،پاشابەخودای دەروێـش فـەقیرەوچ نـازانیْ پاشاوئەهلی مەجلیسی ئەودەنگەیان بۆناسیاربوو زۆریان پـیْ عـەجایب وسـەیربو،دوبـارە پاشابۆڕون بونـەوەی ئەودەنگـەی؟داوای لەدەروێشـی کـرد:شـتێکم بۆبلّـیْ؛دیسـان دەروێش:بەخودای پاشاچ نازانم؛ ئەریْ بن قونی من ئەمن چ دەزا نم؟!پاشای برای لـەبن قونی کەچەڵی ئەوجاریش گوتی بەخودای پاشادەروێش فەقیروەچەنازانی!

پاشا گوتـی ئەودەنگەچیـە؟! کیێـە؟! کەچـەلْ دەلـیْ ئەوەپاشـای براتـە! پاشـا بلّیندبو:بیگرن،بیکوژن، پاشا ی برای لەبن قونـی کەچـەڵی وەجـواب هـات!!!پاشـا:نـا! ڕاوەسـتن، جـاریْ ئـەمن بێننـەدەریْ. دەسـت مـەبزێون بـەلّیْ چـون پاشـایان لەتۆربـەی هێنادەریْ. پاشاڕوی دەکەچەڵی کرد:ئەتو کێی؟ کەچەلْ دەلّیْ ئەمن دەلـەیْ مەردانـەپێت دەلّێم وجائەتۆش مەردا نـەکارەکانی دیکـە بەئـەنجام بگەیەنـە ئەوپاشـایەزۆرعاقلْ دەبـی وقەولی پیْ دەداو؟ئەوجارکەچـەلْ دەلـیْ لەسـەرویژدان وشـەڕەف تۆئـەمن ئەوکەسـەم کـە تـەواوی ئەوکارانەئـەمن کردومـن چونکەئـەتولێکدا.لێکدابەسەرپاشـای بـرات دەزۆێشـتی ودەتگوت چون کابرایەکی بەرلّات بۆناگیری؛ هاتم ئەتۆشم ئاوابەردەست کردوگرتومی ٠

پاشادیسـان هـەرای کردبیکوژن، پاشـابرای گوتـی نـا! وانـابیت کوشـتنی چـی؟! ئەگەردەتهـەویْ ولّاتەکـەت ئـارام بیتـەوە.بێنەکچەکـەتی لیْ مارەکەوبیکـەوەزیری دەسـتە

ڕاستیٚ چونکەئەوکچەی تۆتازەبۆکەس نابی ودەنا ئەوەی دەکوژی دەشتوانی بیکوژی بەلاٚم دەڕۆژی دیکەی پیٚناچیت، یەکی دیکە پەیدا دەبیت لەئەوەش خەرابتروبەدفەڕتر. کەچەلیان چەندڕۆژان ڕاگرت وپاش برێك بیرلیٚکردنەوە، قسەی پاشای برای قبولٚ کرد، کچەکەی لیٚ مارەکردو؟کردیەهەمەکارەوکردیشیەوەزیری دەستەڕاستی ئەگەرلەشاری و دەوروبەری میٚشولیٚك جولاٚباوە، کەچەلٚ دەیزانی وریٚگای چارە ی بوٚدەدۆزیەوەئەوان خەریکی خۆشگوزەرانی بون وئەمنیش بەزمی کەچەل وکیٚشکچیکانی کەلاکم پیٚ لە هەموان سەیرتر بو.

## کەچەلی کەوان ( شیٚعر )

کەچەلوٚکیٚك بو بیوٚ هگویٚلکەوان | نیٚویان لیٚنابو کەچەلی کەوان
هوٚی نیوٚلیٚنانی:گشت ڕۆژ دو کەوی | دەیگرت بە تەپکە و بە دار و دەوی
کەوی لیٚدەستاند داروغەی شاری | بە خوٚشی بایە یان بە زۆرداری
چەندسالاٚ ن کەوی بوٚ داروغەی گرت | ناچاربو دەستی لەوکارەی هەلگرت
ئیٚوارەی ڕوٚژیٚك دانیشت لای دایە | بە بەرگی جوانی کچی هاوسایە
دەسەر و چاودا کەچەلٚ زۆر جوان بو | کیٚ جوان نەیدیبا بوٚی پەشیوانبو
داروغە ڕیٚگا یی دەو کوچەی کەوت | لە نەکاو چاوی بەو جوانەی کەوت
کەمابو شیٚتبی هەر ڕیٚی دەرنەبرد | هات چاك و خوٚشی دەگەلٚ دایە کرد
لەگەل پیریٚژنی ئەو ڕوٚژەی وابو | دەنا بە کلاٚوی قەت نەپیٚوابو
پرسی:داپیرە:ئەم کیژە جوانە | کچی کام بەگە و کام خانەدانە؟!
کەچەلٚ فیٚری کرد بلٚی تاقە کچەکەم | پیٚتخوٚشە هەتا پیشکیٚشی توی کەم
داپیرە ئاوای بە داروٚغە گوت | داروٚغەش زوٚر زو بوٚ خوٚشی بزوت
داروٚغە ناردی، مارەیکرد کەچەلٚ | بوٚ بوکی کڕی تەواو کەل و پەل
بوکیان بوٚهینا بوٚ داروٚغەی پیر | با بزانین چوٚنە تەقدیر و تەگبیر

هەرکەس بو ماڵی خوی گەڕانەوە تەنیا زاوا و بوك لەوێ مانەوە

***

## با بزانین، کەچەڵ، داروغەی چوّن دەبەتلێنی

داروغە ویستی پێك بێ مەبەستی بچی بوّ لای بوك وبیتە بەردەستی
هات بەرەوپیری بوك بە غەمزە و ناز لەنجەی کوّترانی و چاوی وەکو باز
پێی گوت داروغە گوێ بدە فەرمانم چی لە لای تویەو دەبێ بیزانم
:ئەوهەمو کارە ناکرێ بەوشەوە ئیستا جێی خوّشی و دستبازی و خەوە
پاشی چەند روّژێك ووچانێك دەدەم چی بەردەستی منە نیشانت دەدەم
:هەر ئەوشوکانە بە بێ ووچان‌دان دەبی بیسان‌بینم چی لە دەستت دان
ناچار وەپێش‌کەوت هەموی نیشان دان غەزنە و جێ بەندی هەتا دەغلٚ و دان
هەر دیوێك مابو گوتی با ئەوە تەماشا بکەین و جا وەختی خەوە
داروغە پێی‌گوت چەرخی تێدایە بوچیە؟! لێی‌گەرێ بەکارت نایە
تایبەتی منە لای من روّنراوە بوّ تەنێی‌کردنی مسکێن دانراوە
:من دەبی بزانم خوّ چەرخ چییە؟! بە کاری چی‌دێ و یان کاری چییە؟!
دەرکەکەی دیوی چەرخی کردەوە کەچەلٚ خوّی ساز کرد بیری کردەوە
پێم‌خوّشە کاری ئەو چەرخە فێربم بوّ کاروبارو بوّ توّش بەخێر بم
بەڵکە روّژێکی توّ لە ماڵ نەبی مسکێنێك بێنن شا لێی تورە بی
من لە جێگای توّ دەبی تەنێی‌کەم شا لێن رازی بی ئاوا کارێ بکەم
داروغەش ئەوەی بە دلٚ پێ خوّش بو هەم بەتالوکەو زوّریش لەجوّش‌بو
شاقەلت دانێ زوّر بە وشیاری جا تەماشای کە و ببینە کاری
شاقەلی دانا کەچەلٚ بە بێ هەست چەرخەکە سورپا کاری کەوتە دەست
چەرخەکەی بادا کەمێك لێی توند بو بە ئەیرۆ ئەیرۆ هەرای لێ بلێند بو

کەمابو پشت و لاقم لەتبکەی        دەبی کاری وەم زۆر جوان فێریکەی

وای خۆ سازکردبو داروغە بۆ ڕاو        کەچەڵ چی گوتبا، دەیگوت بە سەرچاو

دا کورە گیان ئەتۆش شاقەلت بخە بەر:        داخوا وەك هی تۆ دەسوڕێن تەگەر

داروغەش ئاوا داینا سەر شاقەل        کەچەڵ توندی کرد هەڵکەوت بۆی هەل

بە بێ ڕاوەستان، کەچەڵ دەیسوڕاند        داروغەش هەروا کەمکەم دەیگوڕاند

گیانی تێکشکاند کردی شەق و پەق        گوتی فێردەبی کەو دەخوی بی حەق

لەسەرڕا دەرچو خۆی لۆەشاردن        شا بەیانی زو چەند کەسی ناردن

دا بچون دە بزانن دەنگ و باس چییە        بو بوك و زاوا باسیان لێ نییە؟!

هەروا بێ هەست بون چی بانگیان کردن        ناچار ئەمری شا دەرکیان شکاندن

خۆ هەمو گیانی داروغە شکاوە        لە چڕە و گوڕەی هەر ناڵەی ماوە

شایان تێگەیاند هەر زو بەیانی        زۆری پێ تێکچو ئەگەر پێی زانی

ئەمری کرد زۆر زو حەکیمێك بێنن        ئەوبرینانەی بۆ وەبر ژێنن

کەچەڵ خۆی گۆڕی پاش ڕزگاربونی        بە تۆربە و دەرمان بە هات و چونی

چەند منداڵێکی توقەی بانگ کردن        پولێکی دانی و جوان حاڵی کردن

بڵێن مام حەکیم ئەرێ دەچیە کوێ؟        هەرچەند من بڵێم قرو تێبکەوێ

بەدوامدا وەرن جنێوو پێبدەم        لێو تورە بم یان، بەردو پێدابدەم

مام حەکیم بە خۆو بە عەبا و تۆربان        دەرۆیشت ڕێگاو بۆ خۆ نشان دان

منداڵ لە ڕێگا و کوچە و لە سەر سوێ        ئەرێ مام حەکیم ئەوە دەچیە کوێ؟!

منداڵی ئێستا هێندە زۆرزانە:        پیاو لە دەستانیان چەند هەراسانە

ئاوڕی وێدەدان حەکیم چی چبکا؟!        دەگەڕێ نەخۆش و زامدار چارە بکا

چەند پیاوی پاشای پاش کەم گەڕانێك        توشی حەکیم بون لە نێو کۆڵانێك

پرسیان تایبەتیت لە چ ئیش و کار     وتی تایبەتیم، زامە و بریندار
دەی باشە دوکتۆر ڕێکەوین وبڕۆین     لە بریندارەکەی خۆمان خەم بخوێن
حەکیم گەییەجێ و چو وەژورکەوت     پاشا هات چاوی، بە دوکتۆر کەوت
:برینداریکمان، هەیە بێحاڵە     لە دەست هاواری ژینمان لێ تاڵە
ئایا دەتوانی بیکەی تەبابەت     هەتا غەنیت کەم لە ماڵ و دەوڵەت
:نەخۆش نەبینم جوان لیێ نەڕوانم     ئاکامی کار و دوارۆژ نازانم
مام کەچەڵیان برد ببو بە دوکتەر     زامی چۆماغچی بکا چارەسەر
دیتی و بەخۆیگوت دەی کاری کراوە     هەر هەناسێکی دەبەردا ماوە
پیێگوت بە پاشا هەر زۆر بە جوانی     چاك دەکەمەوە برینەکانی
هێندێك دەرمانی کردە لاق و دەست     بە مقاشیش وابو جیێەکی دەگەست
بە ڕاشکاوی بویان هەرنەهێنی     نابی لە لای مە هیچکەسی بمێنی
ئێوە دەزانن، بۆ نەخۆش دوکتەر     بێئینساف نەبێ پیێ نانا زەفەر
بەلاَم سێڵێك و چوار پێنج لەتکەدار     بۆم بێنن داینێن لە قولینچکی حەسار
چۆ لای داروغە بە گوییێدا بخوێنی     فێردەبی کەوان بێ حەق دەستێنی
سێڵ لە سەر کوچکان، ئاوری کردەوە     داروغەی لە سەر سێڵ کۆ کردەوە
لە کون و دەرزێك خۆی لێ دزینەوە     وای خۆ شاردەوە هەر نەیبیننەوە
هەرچەند بانگیان کرد دەرگاکە بکەوە     دیاربو کەس نەبوتا جوا ب داتەوە
بۆکرۆز و بۆچەك دایگرتبو ولاَت     دەرکیان شکاندن دیتیان کارەسات
لەشی داروغەی هێن جوان سوتابو     هەر بەقەد کەویك لە سەر سێڵ مابو
ئەو خەبەرەشیان ئەگەر دا بە شا     لە ترس و خوفان هیچ هۆشی نەما

*** 

## دە داوخستنی کچی شای

پاشا کچی خۆی ناردە ئەونێوە دایِنا بۆ تەڵەی ئەو سەربزێوە
بۆی ڕازاندەوە چادر و چیغ و کوێن لە جێگایەکی، زۆر خۆش و بژوێن
هەڵیاندا لە سەر کانیەکی پڕئاو هەتیو کە دیتی زانی بۆ ویە ڕاو
لە کوچە و کوڵان دەڕۆیشت کەچەڵ بە هەراکردن دایمەزراند گێچەڵ
لە جێی باوکمم بە کێ قەردارم؟ بێ بیدەمەوە زۆر شەرمەزارم
کوڕە جویک ئەگەر بیستی ئەو قاوە لە کونی ئاودەستێ وڵامی داوە
ووتی بەڵێ دەی بە من قەردارە خۆ هێنند لەمێژە کوا ئەوە کارە؟!
کوا چەندە پوڵت دیتمێ وە چابو دە قران، خۆ دەنا، کەمتر نوسرابو
دەستت بێنە پێش فەرمو ها قەرزت سوپاست دەکەم بۆ وورەی بەرزت
پیلی لەبنیڕا، گرت و بڕی خشت بردیەوە ماڵێ و گەلاڵەی دارشت
پیلی خۆی لە بن شت و مەك ونکرد پیلی دی بە دو تەقەڵ قایم کرد
شەو داهات کەچەڵ پارێزی بۆ برد کچی پاشای دی و قسەی لەگەڵ کرد
وتی، تۆ هەڵدێیی بەقات پێناکەم ووتی نامەردم ئەگەر من ڕاکەم
ئەگەر تۆش وەك من دانیێ قەرارێ کار تەواو نەبی نەکەی هاوارێ
قەرارێ هەتا کار خەلاس نەبی کارم بە دەنگ و هەرا و باس نەبی
دەزانم ئەتۆش ئەوەت مەبەستە دەی باش بگرەدەستم وبی بەستە
دەستی سەرەوەی کەچەڵی توند بەست دەگەڵ کچەی نوست کەچەڵ بەبێ هەست
خەلاس بو کاری پێی گوت هەراکە زوێکی بەنی پساند کەچەڵ جا ڕا کە
تا حەرەس هاتن خۆ کەس نەمابو بەلام پیلێکی ساغ بەجێمابو
کچ ئاشکرای کرد وام خۆدا دەستی ئەمنیش زۆر مەحکەم بی بەستم دەستی

ئێوەش دەبینن دەستی بەستراوە　　پیلی لەبنی را، هەڵقەندراوە
خەیمە و خەرگایان بۆ کۆ کردنەوە　　زۆر زو بۆ ماڵی شایان بردنەوە
شا ئەمری پێ دا ن ئەو شارەی تەواو　　زۆر ورد یبگەڕێن با بخرێتە داو
جا بگەڕێن بزانن هەرکەس بێ پیل بێ　　فەقیربی و یاغی یان زۆر زەلیل بێ
لە سێدارەی دەن ئارام بێ ولآت　　تێفکرن بزانن چۆن دی کارەسات
کوڕەجو بە داد و هاوار دەینالآند　　گرتیان، بە لێدان گشت گیانیان شکاند
زۆر لە بەرپرسان،هێند پرسیاریان کرد　　بێ‌تاوان دەرچو زو ئازادیان کرد
ئەوەش بێ‌ئاکام بۆی وەدەرکەوت　　بەردێکی دیشی وە خاڵگەی کەوت

* * *

## کەچەڵ و بەسەرهاتی خاڵی

کەچەڵ خاڵێکی هەبو زۆر وشیار　　تای نەبو بۆ دزی لە دێهات و شار
چو بە خاڵی گوت کەچەڵی دەغەڵ　　کێیە دەتوانێ بدزێ هێلکەی قەل
تا خاڵی هێلکەی لە قەلێ دزی　　کەچەڵ پا تۆڵی لە خاڵی دزی
کێ هەیە وەك من بڵێ من دزم　　کوێرە وەجاغم لە قەوم و خزم
کەچەڵیش پێی‌گوت وتەت بەجێیە　　خاڵە پاتۆڵت کوانێ لە کوێیە؟!
ئاوا ڕوانیە خۆی دەرپێم دزراوە　　تا دزیم لە قەل کرد دزیم لێ کراوە
مەڵێ وەجاغم نەما خۆ من هەم　　هەر دزیەکی بڵێی دەگەڵت دەکەم
خەزێنەی پاشای با ئەوشۆ ببڕین　　بە بریك لەو گەنجە بژیوێك بکڕین
شەو داهات ڕۆین بۆ زگ خەزێنە　　تۆربە و تورەکان جا پڕکە و بێنە
شەوێ خەزێنە بڕا بو بەیانی　　پێیان ڕاگەیاند زوتر تا بزانی
پاشا ! مەجلیست پڕ تەدارەك بێ　　بەرگی تازەشت لێ مەبارەك بێ
دز هاتون کەمێك غەزنە دزراوە　　شوێنیشی ماوە،دیواری بڕاوەو

شا برایەکی بو گەورەتر لە خوێ      هەر لێکدا لێکدا نامەی دەنارد بوێ
بە ڕاسپاردان گەپی پێ دەدا      سەرکۆنەی دەکرد تەعنەی لێدەدا
تو نابی بڵەی شام بوختان بەخوێکەی      نەتوانی ڕێگەی درێك نغرۆبکەی
:لە دەورەی غەزنە خەنەدەك هەڵقەنن      پڕی بکەن لە قیر دەورەی لێ بتەنن
کەچەڵ هەرگەرا تا نوێژی شێوان      بە قەدەم لێدان، یابە ڕێ پێوان
کونەکەی خەزێنەی دی ئاوەلایە      زو زانی فێڵێك لەوکارەی دایە
هەرگەییشتەوە بانگی کرد خاڵە!      کونەکەی خەزێنەی هەروا بەتاڵە
پێمخۆشە ئەوشۆش نەردێکی بێنین      جیا بە یەکجاری وازی لێبێنین
کون نەگرابۆوە وەکی خوێ مابو      خەندەك لە دەورەی پڕ قیر کرابو
کەوتە پێش ڕۆیی ئاوڕی نەداوە      تا سەر خەندەکی و یەکجێ گەڕاوە
:بو گەڕایەوە؟! خاڵی لێیپرسی      من دەڕۆم دیارە خۆ تۆ دەترسی
:نەخێر ترس و مرس لە لای من نیە      بەلام من ئابڕووهیچ حەیا م نییە
چۆن دەبێ خوارزا پێش خاڵی کەوێ      من خەجاڵەتم عەفوم لێت دەوێ
خاڵە گیان فەرمو، خاڵ وەپێش‌کەوت      چوار شەقا ڕۆییشت دە قیرێ کەووت
خاڵ دەچۆ خوارێ چۆن دەجولاوە      کەچەڵ تێلەکێکی بردو گەڕاوە
سەرشانی خاڵێ کردبۆ بازگە و پرد      هەتا خەلاس بو هەر هات و چۆی کرد
هەڵیکێشا کێرد، خاڵ:ئەوە چ دەکەی؟      سەری تو دەبڕم، کاری وا نەکەی!
دەڵەی چی خاڵە هەی بێبەلا بی      سبحەی دەنگرن لێن ئاشکرا بی
دەبێ من بڕۆم تەرکە دنیا بم      خۆ تازە بۆ نێو چ پیاوان نابم
بە کێردێ سەری خاڵی بڕی بێ هەست      تۆربەی لە شان کرد و سەری گرتە دەست
گەییەوە ماڵێ، خالۆژنی بانگ کرد      مەوزوع هەرچیبو زو بۆی بەیان کرد

خالۆژنی ویستی شین و هەرا کات — کەچەڵی توشکا و کاری خەرا کات
خوێ لێ تورە کرد هوێ کوتە ماکەر! — هەر سوزنێك ئە لەو ماڵەی بچێتە دەر
وەك سەری خالم سەری تۆش دەبڕم — زۆر بە بێڕوحمی هەر تێتنافکرم
خالۆژنی ترسا؛ وابو گیژ و کاس — کەچەڵ نەیگوتبا هەر قەت نەیبو باس
دیسان بەیانی وایاندا خەبەر — قیڕ تییدا ماوە پیاوێکی بێسەر
شا دەستوریدا دارێکی بێنن — لە ڕێی کانیە ژنان قیت بیچەقێنن
کەلاکیش بێنن بیخەنە سەر دار — جا بزانم چۆنی لێدەبن وشیار
ژنی ئەو پیاوە خۆی پێڕاناگرێ — بیبینێ حەتمەن بۆ مێردەی دەگرێ
لە دەورەی کەلاك کێشکچی دانان — بە نەزم و نیزام شەوتا بەیانان
کێشکچی دیتن و کەلاك لە سەر دار — زانی تەڵەیە بۆی هۆنراوە کار
بە خالۆژنی گوت، کەچەڵی زاڵم — پێت خۆشە تێرتێر بگری بۆ خالم
ژنە گوێی لێبو واقی بردەوە — گوتی پێمخۆشە! زۆر بە ترسەوە
دوگۆزەی بوکرێ وهینای دایەدەست — بڕۆ بۆ کانی لەو سەرەی بێ هەست
هەر گەڕا یەوە و گەییشتیە لای دار — گۆزان بشکێنە و بیکە بە هاوار
چەندی دەتوانی بگری و ڕۆڕۆ کە — چی گڵ و قوڕێ وەسەری خۆ کە
بەو گریانەوە کێشکچیەکان دێن — لە بارەی کەلاك لەگەڵت دەدوێن
چی تۆیە خوشکێ ئەو سەڕبڕاوە — بە خوای وا دیارە زوڵمی لێ کراوە
من چیم نەدیوە کوانێ سەر بڕاو — ئەدی چیە؟ چۆنە وا دەگری بەتاو؟!
چم لە کەلاکی هۆشم لێبڕاوە — لە ترسی خەسوم گۆزەم لێ شکاوە
لەبەرێ‌شەرمی وحەیای خەسوەکەم — بۆ کوێ بڕۆم ئەیرونازانم چبکەم؟!
لە شکانی گۆزان ئەو ئاگادار بێ — ڕام ناگرێتەوە دنیاش بە دار بێ

بەوجورەیٚ کەچەلٚ کە بوٚی دانابو ئاوای بوٚ پێك هات موی لانەدابو
کێشکچی تێکچون، ژنە قسەی کرد کوەبون تێگرا تەوجێیان بوٚ کرد
پولێیان وەدەست دا هەر زو گەڕاوە بوٚ کەچەلٚ قسە و باسی گێڕاوە
کەرێکی زابو چلٚکن دەولٚەمەند پەڕوٚی لە پاشوی جاشکی کردبون بەند
کەچەلٚ خێرا چوو لای دەولٚەمەندی پێیگوت ئەو کەرو جاشکەت بە چەندی
بیفروٚشم باریەر چوٚن لە خوٚم ببڕم کەچەلٚ گوتی خێرٚ ئاخر لێتدەکرم
لە پینج قرانان هیچ کەمتر نابیٚ ئەوەت شەش قران با ئیك ئاوا بیٚ
پولیٚ دا کەرو جاشکەکەی کڕین بەرەو تەویلە بە جوت لییٚخوڕین
جاشکی بەستەوە و کەری کردە دەر زوٚر زو بەلٚەد بو ئەوسەر تا ئەوسەر
وای لیٚ هات لە کوێی لەنێو ئەوشارە دەهاتەوە مالٚ بە یەك ئێشارە
بوٚ دزینەوەی کەلاك خوٚی ساز کرد جوانی تیٚگەیاند خالٚوژنی گاس کرد
وشیار بە ئەگەر کەر گەیشتەوە بیبە تەویلەی زو بیبەستەوە
کەلاکی خالٚمت بوٚ دەنێرمەوە جا د وا یەبوٚخوٚم دێم دەیشێرمەوە

✽ ✽ ✽

## دزینەوەی کەلاکی خالٚی

ڕوٚژێك کەوتەڕیٚ وەختی ڕوٚژپەڕی لای کێشکچیەکان ویستی تێپەڕی
دەمێك بو دەستەی ئەو کێشکچیانە ماندوو وەڕەزبون لەو بیابانە
ئەوشوٚ دەروێشی ڕاگرین لای خوٚمان بەزم و ئاهەنگیٚ بابگێڕیٚ بوٚمان
گوێولیٚ بیٚ لەقسەی سورداش ودەروێش بانگیان کرد دەروێش دا برێك وەرە پێش
ڕاوەستا کەچەلٚ هوٚشی لە کەر کرد گەورەی کێشکچیان باسی لەسەرکرد
مام دەروێش ئەوشو لامان بمێنەوە مەجلیسی شادین بوٚ برازێنەوە
دەڕوم، ناتوانم کارم بەدەستە کارت گەڕانە کوا چیت مەبەستە؟!

دەتدەینێ نەڕۆی ئەوشۆ لەلان بی
کوا چیم دەدەنێ با لێم عەیان بی

حەقت بیست قران لامانبە ئەشۆ
مەرد و مەردانە بارت بخە و مەڕۆ

کەچەڵ ڕازی بو هات بارەکەی خست
خێرا کەریشی دە پچکێکی خست

جوان دانیشت جیێ خۆش بەر پالینگانی
دارەکەی کەلاکی لە بنیڕا ڕوانی

هەر کەلاکی دی هەستا کەوتە کار
زو حازری کردن کۆتە و کەرو بار

پرسیاریان لێ کرد چبوە.؟ چ دەکەی؟!
لە چی نارازی بۆ کوێ باردەکەی؟!

شەو ئەو کەلاکە حالی بوم لە خۆم:
کەرەکەم دەدزێ بە خوای من دەڕۆم

کەلاکی مردو دەی چۆن کەر دەدزی
کێ بیستویەتی کوا لە سەر عەرزی

بە خوا باوکە گیان من زۆر زەنینم
هیچ ڕوناکایەك لێرە نابینم

گەورەی کیشکچیان گویێ لێ بورۆهات
حالی بێ وبزانێ چە بوە کارەسات

لەدوری دیتی گێشەی مام دەروێش
بووباس وخواسە ی زوێکی هاتەپێش

دەروێش لەسەرچی لەچی تۆرەبویی
کێ چی پێ گوتوی یالەخۆڕاهەڵچوی

حالیا ن کرد،دەروێش تورەبوەلەچی
هاتەپێش پێی گوت سەرکارکێشکچی

گەراوم دنیام خۆ زۆر دیتوە
ئەوەی تۆ دەڵێی کەس نەیبیستووە

ڕاست دەکەن ئێوە بنوسن قاقەزی
کە هات و کەلاك کەرم لێبدزی

دەقرانم دەوێ، لە تو پولی کەر
دەی هەریۆخۆشت دەبیە دەستەبەر

زانیان ئەوکارە ئە لەودنیایە
نەبوە، نەکراوە، کاغەزیان دایە

شەوێ هەر پاشی نان و چا خواردن
بەزم و ڕەزمێکی وای بۆ ساز کردن

نەیەێشت کەس بنوێ تا لای بەیانی
فرقە و پێکەنین، قاقا و گۆرانی

جارێك پاشا بو دەرۆییشت بۆ ڕاوە
دادیان لێ دەخواست ئی زوڵم لیکراو

دەمێك داروغە و جارێکیش وەزیر
لە خوێ دەبەستن قایش و قرۆش و شیر

چی سەیربوبوی بەڕێوە بردن    هەتا خەو هەموی لابەلا کردن
خەوتبون هێندێک هەروا بەپێوە    لە هات و چوندا یا هەر بەڕێوە
چەندجاریان بانگ کرد،دەروێش ڕەجایە    هەمومان کوێر بوین تۆ خەوت نایە
لە پێکەنین و بەزم و هەڵاّ و چی    لەبیریان چوبو دانێن کێشکچی
لەبەر بێخەوی هێند شەپرێو ببون    دە ڵێ جا ئەوجار پێۆخۆشبێ بنون
هەر سەری دانا خۆی لابەلاکرد    شکی هەموانی لە سەر خۆی لابرد
یەکجێ کێشکچی خەویان لێ کەووت    کەچەڵ قیتبوۆوە و لییۆەخۆکەووت
کەلاکی داخست قایمی کرد لە کەر    پێی گوت دەبڕووۆە؛ بۆ ماڵێ یەکسەر
ڕەژیاوی هێنا هەرئاوای بەش کرد    کەپو و لوتی خۆو هەموانی ڕەش کرد
جا ئەوجار بێخەم تەخت لیێخەوت    نوست هەتاکوتاووەکەڵلەی کەووت
بە فرقە و هۆڕ و بە پێکەنینان    شین دەبونەوە هەمو کێشکچیان
سەلأتان لە خۆو لە ئیش نەزانین    ئەمنیش با بزانم، وێگرا پێبکەنین
حاڵیان کرد دەری هینا ئاوێنە    جوان لە خۆی ڕوانی و دیتی ئەو وێنە
کوا چ خەراپێك لە من ڕوی‌داوە    ئەو دەردەو بە سەر، من بۆ هێناوە
دەچمە لای حاکم شکایەت دەکەم    کێ ئەوەی کردوە، وای تەنبێ دەکەم
هەمومان وەك توێین، ها تەماشا کە    ئەگەر دروێبو بۆ لای شا ڕاکە
وا تێیان فکری گویا نەمدیبون    بۆ چەند دەقیقێك هەمو بێدەنگ بون
دانیشت تا دەمیك چ بیرکاتەوە    لەناکاو کەری وەبیر هاتەوە
بەربوە ڕۆیشتوە، کوانێ کەرەکەم؟!    ماڵم وێران بو خوایە من چیبکەم
لابەلا هەلأت هەتا ماندو بو    ئەوجاریش بەغار بۆ سەر تی هەڵبو
هاتەوە ئەوجار لە داری ڕوانی    کەلاك نەمابو؛ بەڵێ پێیزانی

کاکە زوم زانی خۆ ئەو کەلاکە    کەرم لێدەدزێ دڵی من پاکە
بێنن بمدەنێ پوڵی کەر و خۆم    با بە تاڵوکە لە لاتان بڕۆم
سێ قران تەواوی پوڵ لێوەرگرتن    دەفەکەو شڕەی بە کوڵ هەڵگرتن
هاتەوە ماڵێ زۆر بە خۆشحاڵی    دزیبوشیەوە و،کەلاکی خاڵی
جا کێشکچیەکان زۆر بە ترسەوە    بۆ ئاگاکردن وەربە پرسەوە
شا زانی کاری ئەو بێ عوورزانە    بە گەورەکەی گوت زۆرباش بزانە
هۆی سور و سورداش! هێندە بێخێرن    خوێڕی و لات و لوت پێتان دەوێرن
یان سەر برینە یان بەندیخانە    بۆ ئێوە هەردوی چاوەڕێتانە
دیسان برای شا خەبەری ناردبو    زۆریش بە ووردی سەرکۆنەی کردبو

*** 

## با بزانین کەچەڵ وشتری سپی چاوڕەش چۆن دەکوژێتەوە

با بزانین کەچەڵ چ دێتە بیری    هەتا کوێ دەبا ئاوی، هەویری
شا وشترێکی بو نێوی سپی چاوڕەش    لە سەر کوێ زێڕیا بە بێ غەل و غەش
لە ترسی پاشای دەریان نەدەکرد    چەند ساڵێك ئاوا ڕۆژگار ڕادەبرد
باقە وێنجێکی زۆر جوانی کڕی    بە پێش وشتردا سەبرێك تێپەڕی
وەختی ڕۆژ پەڕێ بۆ ماڵ ڕێی داگرت    وشتر قەپاڵتە ی لە وێنجەی داگرت
کەس دیار نەبایە، وەدوای خۆی دەدا    دەنا زیپکێکی بێ هەست لێدەدا
هەر سەبر سەبرەوشتری هێناوە    زۆر جوان بۆی پێك هات، دیسان ئەو داوە
ووشتری ئێخست بە کێرد کردی تیل    لە حەوشەی کردی لەت لەت و پیلپیل
لە دەوروبەری نیشانەی نەهێشت    جا بخۆ گۆشت وشتر بە برژیوی و چێشت
ئەو خەبەرشیان، پێ گوت تا بزانێ    ئا وەکیل، وەزیر، شا لە دیوانێ
ئەورۆ دو ڕۆژە ووشتر دیارنییە    خوایە من چیبکەم؟!دەی کواچارچییە؟!

ئەوکارە و هەرچی کارێکی کراوە — هەر کاری یەکە پاك ئەو روداوە
دا فەرراشباشی بۆم جار و قاورکەن — سوری عەنیارم زویەکی بۆ بانگ کەن
کوا سوری عەنیار؟ لێمان تۆراوە؟! — یا دەنا مردوە بەشیشی براوە
دەبرۆن بۆم بانگ کەن ئەگەر کو مابێ — بە بی مەعتەلی بون بۆ لامان با بێ
سوری عەنیار هات پاش عەرزی سەلام — هەمو شتی پێگوت:خولاسەی کەلام
بۆم ببینێوە ووشتری چاورەش — لە ملك و ماشم دەتکەم بە هاوبەش
ووشتریٚ سپیم بۆ ببینێوە — عومرم لە نەبو بۆ دەژینیەوە
لێکۆڵینەوەم با کام بۆ بگێرِی — هەڵت دەکێشم سەرێك بە زیری
بە راست و دروستی بێنێوە خەبەر — سەری دەیکەشت بە زێو سەربەسەر
سوری عەنیاریش تا خۆ بداد یاری — نەیدەزانی چیە ئاکامی کاری
پاشام هەر خۆش بی لێم ببی رازی — با هەڵم کێشن هەر بە پیوازی
سەری دیکەشم با ورکەنان بێ — بۆت دەبینمەوە لە بن هەوران بێ

✻ ✻ ✻

## نۆرەی سوری عەنیارە

پورە سور رۆیشت ووشتریٚ وەبینیٚ — بزانین چ خۆشیان لە خۆی دەبینیٚ
هەستا ماڵ بە ماڵ گەرا لە شاری — بە پارانەوە و زۆر بە عەنیاری
هەر ماڵیٚ چوبا دەمێك دەگریا — کاری وی هیچکەس نەیدیبا بریا
ئاخری رۆژێکی وەختی ئێواریٚ — ماڵی دیتنەوە زۆر لە لایٚ خواریٚ
هەر وەژورکەوت بە نوکەنوکی — لە مەگیرانی گۆشت و شترو بوکی
پێیگوت خوشکیٚ گیان، دەسەرتگەرێم — چەند رۆژە لە گۆشت ووشتریٚ دەگەرێم
خێری ئیمانت ئەگەر هەتانبیٚ — پەنجێکم دەنیٚ هەر ئاوەدان بیٚ
بوکەکەم خودا چاکەی بۆ نەکا — خۆ مەگیرانیٚ لەو گۆشتەی دەکا

زو فریوی خوارد خاڵۆژنی کەچەڵ
گۆشت وشتری دا بە سورەی دەغەڵ

ویستی بە فکر و گۆشت بڕواتەوە
گەییە نێو دەرکێ کەچەڵ هاتەوە

داپیرە شەوە دەبێ میوان بێ
سەدجار داپیرەت هەر بە قوربان بێ!

سەری دە قوڕێ نێ یاخوا ئەو بوکەم
هاتوم بۆ گۆشتی، سوالێشێ بو بکەم

ئەو ژنە نازانم چی تۆیە و کێیە؟
خۆ ئینشائاللە بەهەشتی جێێنە

بڕێکی داومەتێ بۆی ببرژێنم
ئیشتیا و ئارەزوی یەکجێ بمرێنم

کەچەڵ زو زانی ئە ئەو سەکسارە
کاری بە دەستە و زۆریش وشیارە

هاتووە سیرڕی من یا ئاشکرا کا
ماڵە خۆی دەنا یەکجێ خەراکا

نانا داپیرە؟ خۆنات کەم بێبەش
ببینە گۆشتی ووشتریّ چاوڕەش

ئەو دوە هەردوکیان لێك لە فیڵێ بون
سور بۆ گۆشتی زۆر، کول لەبەین چون

لای خۆی وای‌دانا هەتا زۆرتر بێ
رونتر و هەروا با سبوت تر بێ

تا سەر کەلاکی بردیەوە ژورێ
چەندی پێتخۆشە بەرەوە پورێ

داهاتە سورەی وای‌دا بە ئەرزی
کۆڵەکە و دیوار دەرکەی پێلەرزی

پێی نا سەر لاقی و کردیە دو عەیار
هەردوکی وێکڕا ناردن بۆ نەدیار

ئەوجار ڕوی کردە خاڵۆژنی بێ هەست
لە داخان لێوو، زمانی خۆی دەگەست

چی بێتە سەرتۆ لەو ڕۆ بەولاوە
یا نیسکە گۆشتێك بدەی بە لاوە

وەك ئەو پیرێژنەی دولەتت دەکەم
هیچ تێبینیەك و ڕوحمەت پێنەکەم

شایان تێگەیاند لەو بڕوو بێنە
کوا سوری عەیار ئەویش بێشوێنە!

ڕەنگ و ڕوی تێك چو، شا کە ئەوەی بیست
تۆزی نەهاتی و بەدبەختی لێ نیشت

لەو چەند ساڵەی‌دا چی حەوڵ‌دابو
بەشی تێشکان و سەرکۆنە مابو

هەر تەگبیرێکی کردبای ئەو شایە
هەر بەراوەژوی، دەهاتە کایە

وای لێ تێك چوبو خۆ گریژنەی كار — سەركۆنەی پاشای براشی سەربار

* * *

## كەچەڵ كوڕەكەی چۆن دەدزێتەوە

گوللەی ئاخیری شا كە پیێماوە — سەركەوتن دەبی یا دیسان داوە
كەچەڵ ڕێی هەمو فێڵانی لێبەست — شا زیافەتێكی گەورەی گرتە دەست
پێشتریش پاشا كچەكەی كە بۆ داو — دانابو كەچی كچە كەوتە ڕاو
چاو پێكەوتن و پێك گەییشتنی وان — بو بە كوڕێكی زۆر ژیكەلانە و جوان
چی خەڵكی شاربون لە چوك و گەورە — هەموی بانگ كردن كۆبن لەو دەورە
كەچەڵ كە بیستی ئەوجاڕ و قاوە — زانی ئەو داوە بۆ ئەو دانراوە
چو دو كەروێشكی كڕین لە نێو شار — عەبا و مێزەری دیسان خستنە كار
كەروێشكەكانی لە بن عەبا ی نان — نەیەێشت بە هیچ جور، تا خۆ بدەن نیشان
بۆ ئەو بانگ هێشتنە، هاتن خەڵكی شار — كوڕەشیان ئەوجار هێنا خستە كار
خوێن دەبزوێ، بگەڕێ دەی بەڵكو وابی — ویستی دو سێ جار بێ بۆ لای بابی
چاوی كەروێشكی دی وا سڵەمێوە — بۆ لایەكی دی ڕێگای تەنیوە
دەگەڵ كەروێشكی بەرهەڵلا كردن — بو بە غارغاردین و فیتە و ڕا كردن
كوژانەوە چرا هەركەس دەیگورانـد — كەچەڵ چو كوڕەكەی خێرا یەكی ڕفاند
داینا و هاتەوە هەر لەو جێگایە — لیێدانیشتەوە تا پێی بلێن وایە
كە دانیشتەوە هەروا كڕ و كاس — وەكی هیچ نەبێ و نەبێ دەنگ و باس
بە تێفكرین و ئەژمار تەواوبو — دەگەڕان زۆر ورد كوڕەش نەمابو
هەرچەند هاتن و چون گزیر و سورداش — دزیشیان لیكرا و خەرجەكەش بە لاش
كەمكەم خەڵكەكەش لەوسەر و ئەوسەر — هەركەس بەرەومالڕێیان گرتەبەر
شا ئاخر داوی كە دانابۆوە — لیێپساند ئەوجار لە كوڵی بووە

## بزانین کەچەڵ، برای ئەو شایەی چۆن دەداو دەخات؟

ئەوجار کەوتەدوی برای ئەوشایە      چۆن ئەوی بگری و پێی‌بکا کایە
کەوڵە مەڕێکی گەورەی وەدەستخست      لیسپەی زەنگوڵێکی چوکەڵەی وێخست
خۆی لێ‌شاردەوە لە نێو چوارباغی      شای تێک وەرپێچی و لێی ببی یاغی
ڕاوەستا هەتا ڕۆژی دیاری‌کراو      گەلاڵەی دانا چۆنی بنێتە داو
شا لە لای وابو کە ئەو چوار باغە      جێگای گەڕانە و کەیف و دەماغە
ئەو ڕۆژەی گەڕا تا نوپڕژێ شێوان      تاربو، لێی‌تێکچو لەمپەر و نێوان
کەوڵە زەنگوڵەی دەبەرکرد بێ‌دەنگ      کە خۆی ڕاوەشاند وابوە زەنگە زەنگ
شا لاقی سست بو لەوێ لێی‌کەوت      تو خوا ئەتو چی نێوک و دڵم کەووت
من عیزرائیلم وای ولام داوە      ڕوحت دەکێشم عومرت تەواوە
ئاخر من پاشام ساحێب ولاتم      چۆن نابی بزانم من کات و ساتم
پێی‌گوت بۆ مردن ئەو ڕۆژی ئاخیر      هیچ فەرقێکی نیە، خونکار بی و فەقیر
خۆ ئاخیر ڕێگاهەر حاڵیت دەکەم      هەروا ڕێک و پێک ڕێنوێنیت دەکەم
لە قسەم دەرنەچی هەیە ڕێگایەک      :بۆم‌دانیێ چۆن و شوێن و جێگایەک
ئەوەی بۆت دانام کە بە قسەت نەکەم      دیارە خەیانەت من بە خۆم دەکەم
زۆری پێ‌خۆش بو پێک هاتن و یەک بون      دەتنێمە تۆربە و دەتکەم بە بنقون
یەک سەر دەچینە ماڵە شای برات      داوای ماڵلا دەکەم یان خێرات
پێم‌دەڵێن دەروێش کوا هەرچی بزانی      شێعر بێ لێ‌لێ، حەیران، گۆرانی
شتێکمان بۆ بڵێ؛ من هیچ نازانم      وانابی، دەی‌دەی؛ هیچ هەر نازانم
شاهیدە بۆ من جێ دانیشتنەکەم      هەر بە گوێی ئێوەی دەگەڵ باس دەکەم
تۆ ولام دەوە من کە نازانم      هیچ هەر نازانێ وەک من دەزانم

ڕازی بوو داینا یەکتر دیتنەوە        شا زۆر ڕازی بوو بەو خۆ کرینەوە
عەبا و عەمامە بۆ ئاخیر دوا جار        کەچە دەفەشی، هەمو خستنە کار
گەینەوە یەکتر ڕۆییشتن وێگرا        تا لای ماڵی شا، بێ کێشە و هەرا
پاشا لە ترسان هیند چوک ببوۆوە        لە نێو تۆربەکە جوان جێیببوەوە
نایە نێو تۆربەو خستیە سەر پشتی        چو وەژورکەوت بە قشت و گشتی

## با بزانین لە ماڵە پاشای چ ڕوودەدا

پاشامان هەروا بە عەیش و نۆش بێ        ماڵەڵڵای دەروێش ولاتمان خۆش بێ
شتێکن بۆ بڵێ و ماڵەڵڵاش هەیە        من هیچ نازانم خۆ بێ فایدەیە
دەی دەی بۆن بڵێ، چون هیچ نازانم!        نازانم، بن قون! من هیچ دەزانم؟
شا کوتی خەلاس بێ ئەو هەراو کێشە        خۆ هیچ نازانێ ئەو مام دەروێشە
ئەو دەنگەیان بیست عەوق مان هەمو        داوایان لێ کرد هەروەکو پێشو
تا بۆی مەعلوم بێ ئەو دەنگە کێیە        دیسان دا و ا ی کرد بیڵێ چی پییە
هەروەکو پێشو من هیچ نازانم        دەی دەی بۆن بڵێ، چۆن هیچ نازانم
ئەی بن قونی من تۆ باش دەزانی        :دەروێش فەقیرە و نا چ نازانی
دیسان کە بیستیان ئەو دەنگی ناسیار        شا زۆر تورەبو کە لێی کرد پرسیار
زوبە پێم بڵێ ئەو دەنگە کێیە؟!        :پاشای براتە زۆرم کار پێیە
:بیگرن بیکوژن با نەڕوا لە دەست        مام شا بانگی کرد کەس نەبزێوی دەست
ئەمن بێننە دەر بەسیەتی هەدەر        چەند کەس غاریاندا، شایان هێنا دەر
پرسی ئەتو کێ پێمبڵێ بزانم        چت کردوە لێرە و لە نێو خزمانم
پێی گوت چەندساڵە هەرچێکی کراوە        داروغە و وشتر، یا غەزنە براوە

کارەســـاتی دیـــش هـــەرچی ڕوی‌داوە جویَ لـە مـن کیَبـوە بیَتـە ئـەو ئـاوە
هەرچەند من زۆرجار بۆم هەڵکەوتوە بـاو ئوکـەس خوێـڕی بـوە، خـۆی خسـتوتە داو
چـون گزیـر کچـی پـیرێژنی بیَکـەس هـەروا دەخـوازی و ناپرسـیَ لـە کـەس
مەجلیسـیَك گـیرا بـە ڕاوو تـەگبیر کەچـەلّ، پاڵـەوان وەکیـل چـەند ئـەمیر
دەڵـەی بیکـوژن، بـەڵیَ! پیـَت دەکـریَ کەچـەڵی بکـوژی کـار چـارە دەکـریَ؟!
ئەوەی کە دەکـوژی، تـا چـەند ڕۆژی تـر زۆر پـەیدا دەبـی لـە وەی خـەرابتر
دەت هـەویَ ئـارام بیَتـەوە شـارت بیَتـەوە دەسـت خـۆت گشـت کـار و بـارت
دەت هـەویَ یـەك جـار کـارت بـۆ چـابیَ ئـەو کچـەت تـازە بـۆ هیـچ کـەس نـابیَ
کەچـەلّیَ بیَنـە، بیکـە زاوای خـۆت بیکـە بـە وەزیـر یـا غـەمخۆری خـۆت
پاشـاش بـیرێکی زۆری کـردەوە ڕازی بـو بـە زمـان و کـار و کـردەوە
بە ئـەمری مـام شـا و وەکیـل، زۆر ئـەمیر کچـی دا کەچـەڵ وکردیشـیە وەزیـر
زۆر بـە ئیحـترام ئـەو مـام پاشـایە دوایـیَ پـیَ هێنـا ئـە بـەو هەڵلایـە
کەچـەلّ زاوای شـا، یـان هەمـە کـارە مێشـولێك کوژابـا لـە نێـو ئـەو شـارە
دەیزانـی کێیـە، بۆچـی کـوژراوە کـیَ کوشـتویەتی وچیـە ئـەو ڕاوە
ئـاوا پێـك هـاتن، کەچـەلّ شـا و وەزیـر چـی هاتبـا پیشـیَان بـە ڕاوو تـەکبیر
چارەیـان دەکـرد ویَگـرا پێکـەوە لێرەبـا و لـەویَ و لـە لای دیکـەوە
تـەگبیری مـام شـای، شـاری دا نـەجات چـەند سـالّآن ئـاوا ڕایـانگرت وڵات



## سلەمان بەگ

مام خاڵند پیاوێکی زۆربەڕوحم وفەقیروباشبو، ئەودەمی هێشتا نەچۆبۆ حەجیْ، زۆریش بەدین بو،عەیبەکەی ئەوەبو زۆرلە ئاغای دەترسا ؟بەکوردی دەوڵەمەندێکی خوێڕی وترسەنۆك بو، ماڵەکەشی لەئەو دێی ئاغای لیْ بو، زۆردور نەبو.

ڕۆژێکی مام خاڵندقرتاڵێك هێلکە ودۆدانێکی پڕی ماست لەکەریْ قایم کردوپێنج گیسکەنێرێشی وەپێشەخۆدان وکەوتەڕیْ بۆ ماڵەئاغای، چونکە دەیزانی ئاغا سلێمانبەگ سیرو ماست وبەربەسێلی زۆر پیْخۆشە. هات، گەییشتە دەرکیْ ماڵە ئاغای. ئاغا لەسەرپلیکانان ڕا وەستابو، مام خاڵند ئەگەر چاوی بە ئاغای کەوت، هیندەی دیشی سەرلیْشێواو،لەجێی ئەوەی بڵیْ سەلاموعەلێك،گوتی(سلێمان بەگ )

ئاغالێیحاڵیبو.وڵامی داوەگوتی عەلەیکە سەلام. بەخێرهاتنی کرد ڕوی دە مام خاڵندی کرد : ئەوەگیسکەکان چەندیان نێرن؟

مام خاڵند لەباتی ئەوەی بڵیْ هەر پێنجیان نێرن ئەویشی هەرلیْ تێك چو،گوتی (هەر نێرێان پێنجن)ئاغا ئەوجار برێك پێکەنی و دیسان ڕوی دە مام خاڵندی کرد

:ئەدی چیدیشت بۆهێناوم؟:

مام خاڵند دەڵیْ وەڵلا ئاغا ئەوەتا( قرتاڵێك ماست و دۆدانێکم هێلکە) بۆهیناوی. ئەوجار ئاغا هێندەی دیش پێکەنی و.زانی مام خاڵندەەموی هەرلیْ تێك چوونەو هێنای برێکی لاواندەوەو بردێە وەتاغیْ، بەچاپەزی گوت مام خاڵند ماندووبوە برێکی ئاوی سارد بۆبێنە،پاش ئاوخواردنەوەی ئاغاگوتی چایەکی جوانیشی بۆتێکە،مام خاڵندچای خواردەوەوبرێك حەساوەوهاتەوەسەرەخۆو،ئەوجاربەرەومالْ ڕێی داگرت وڕۆیشتەوە بەسواری کەرەبۆزی؟



**ماڵە کەڕان**

کاحەمە ساڵحی جوڵا بەخۆی و کەجانێ خێزانی و حەمەڕەسوڵی کوڕی و خەجوڵی کچی و ڕابیعای خەڕەك ڕێس، دەئەو ماڵەیدا هەمویان کەڕبون،

ڕۆژێکی پیاوی ئاغای هاتە سەرکولانەی، بێگارێکی بەجوڵای ئەسپارد،کەچی مام حەمەساڵح لەقسەی پیاوی ئاغای حاڵی‌نەبو،ژنەکەی لیی‌پرسی:پیاوێژگە ئەوە پیاوی ئاغای چی‌گوت؟ مام حەمە ساڵح زۆر لە خۆی نیگەران بوئاغا.لەخانوی دەرکات لە ولأم دا گوتی بە خوای حافرەت پێم وابی لە خانومان دەردەکەن!

کچەکە گوتی ئەرێ دایە دەگەڵ بابم ئەوە باسی چیتان دەکرد؟ ژنەکە زۆری ئیشتیا لە گۆشتی بوو زۆرلەمێژ بوگۆشتی نەخواردبو؛ گوتی بابت دەڵێ گۆشتم کڕیوە لێت نەناوە! کەنگی وابوە بابت هێندە بەدڵ ودەرون بێ،گۆشتی کڕی بێت و ئەمن لێم‌نەنابی!

ئەوجارکوڕەکەلەخوشکی پرسی:ئەوە دەگەڵ دایکم وبابم چتان دەگوت؟ کچەش لەکەم هەتازۆر لەدایکی حاڵی نەبوچی گوت بەلأم دایکی چەندی ئیشتیالەگۆشتی بوئەویش ئەوەندەی ئیشتیاله مێردی بو؟

گوتی ئەوە دایکم وبابم دەڵێن، بەمێردن‌داوی مێردت نەکردوە!کەنگی ئەمنیان بەمێردداوە ئەمن مێردم نەکردبێت کواداویانمتەکێ مێردم پێ نەکرد وە!!

ئەوجارخەڕەك ڕێس ئاگاداری ئەوگوفت وگۆیەی وان بو،بەحەمەڕەسوڵی گوت چونکەلییێ نیزیك بو ئەرێ ئەوەئەتۆدەگەڵ(بابت و دایکت و خوشکت) باسی چی دەکەن، ئەویش لەهیچ حاڵی نەبوبەلأم زۆری ئیشتیای لە خەڕەك‌ڕێسی بو، گوتی ئەوانە دەڵێن چویەتە زگ خەڕەك ڕێسێ!ئەوەڕوێکی من وروێکی تۆکەنگی ئەمن کارم بەتۆبوە، یاهاتبمەزگەتۆ؟

ڕابیعاش بەقەدمام حەمەساڵحی لەدەرکردنێ دەترسا،داخواکەنگی دەری دەکەن گوتی جابۆ دەرم‌دەکەن سێ مانگە کارێ دەکەم، مانگێ بە سێ پەناباتان، دەکاتە، چوار قڕان و پەناتێك، پوڵەکەم بدەنێ بۆخۆم دەڕۆم.بەکورتی کەس لە کەس حاڵی‌نەبوە!

### حەزرەتی موسا( ڕ ) و کرم

دەڵێن حەزرەتی قابیز ڕۆژێکی، دەچێتە خزمەت حەزرەتی موساو عەرزی دەکا ئەمن قابیزم؛هاتوم ڕوحت بکێشم،حەزرەتی موسا.موڵەتی لێدەخوازی،چونکەئەمری خوای بوە لێی قەبوڵ کرد وەوحەزرەتی موسا دەچێتە حزور باری تەعالا و پاش هەزار و یەك کەلیمە، عەرزی خوای تەبارەك و تەعالا دەکات:یا ڕەبالعالەمین لەخۆت عەیانەکە حەزرەتی قابیز بۆڕوحکێشانی من هاتبو؛ جا نازانم ئەومندالآنەم چلێ بکەم چونکە زۆر وردن و کەسی واشم نیە کاسپێان بۆبکات ویابەخێویان کات،خوای تەعالادەفەرمویت یاموسا..بچو لەفلآنە دەریایەی عەسای لێدە، ئەگەر دەریا شەقبو؟بەردێکی سپی تێدایە، عەسایەکیش لەبەردەکەی دە بزانەچی تێدایە؟

حەزرەتی موساچولەجێگای دیاری کرا و،عەسای لەدەریایە دا؟دەریاشەق بو.، بەردەکە وەدەرکەوت، وعەسایەکی لەبەردەکەی دا، بەردەکەش لەت بو، دە نێو ئەو بەردە ڕەقەی داله بن ئەو دەریاشینەی داکرمێکی تێ دابو گیایەکی شینی بە دمیەوەبو و دەیخوارد،

حەزرەتی موسابەدیتنی ئەو کرمەی، ڕوی دە ئاسمانێ کرد و فەرموی یا ئیلاهی! گەورەیی لایەق بە تۆیە، زانینو قودرەت و ڕوحم هەر بۆ تۆ باشە و بەس.



**مەلا سێمان**

دییّشێلم جاڕان وەکوئەوچەنددێیەی ١ـ گردکسپیان٢ـ پەسویّ ٣ـ جەڵدیان و٠٠ هەر لە قەدیمەوە ئاوەدان بوە،مزگەوت وحوجرە ومەلا وفەقێی هەبونە.

ئەو دییە پیاوێکی دەوڵەمەندوگەورەی لێبوە بە نێوی مەلا سێمان،

وابزانم هەرئەومەلاسێمانەبوەدوایەبۆتەگەورەی مەلاسێمانیان؟

مەلا سێمان مریشکی زۆر بونە. نازانم جیرانێکیشی لەبەر فەقیرێی یا ؛٠لەئەومریشك وپەلەوەرانە غافلّ نەبوە، هەر لیێدەدزین، مەلاسێمان شکی لە کابرایەکەی دەبێ بەلاّم نەدەکرا بێ بەلگەبلّێ فلانەکەسەمریشکی مـن دەدزی. ڕۆژێکی جومعەی، هەمو خەڵکی شێلم جاڕان ولەدێیەکانی دیکەش ڕاهاتبون لە مزگەوتێ کۆدەبنەوە بوبەجی هێنانی نوێژی جومعەی. مەلای ئاوەدانیە چاودەگێڕی و دەڵێ ئەوەمەلاسێمان بۆدیار نیە، چونکەعادەت وابو مەلای ئاوەدانیەلەئەوجورەکەسانەیان دەپرسین؟

زۆری لەسەرمەعتەل دەبن.خوتبەی دەخوێنێتەوە دوایە پیاوێك دەڵێ مەلا سێمان ئەوەهات! مەلا دەڵێ قامەتێ بکەن. قامەت دەکرێ ومەلا سێمان وەژور مزگەوتێ دەکەویت تەواوی خەڵکەکەی بەپێوە ڕادەوەستن،مەلادەڵێ خوّاعافوت کامەلاسێمان ئەوعالەمەت بۆمەعتەل کردوە، هەرکەسە، کارێك و دەرد ێکی هەیە.

مەلاسێمان:ماموستا بۆبەمن دەڵێی، کابرا مریشکەکانی منی دزیون وهەموی خەلاّس کردوون دەستی بۆلای جەماعەتێ ڕادەدێری:ئەوەتاپەڕەمریشکەکشی هەربەسەرێ وەیەو وهاتولەسەڤ جەماعەتی ڕاوەستاوەونوێژی جومعەی دەکات هەمان کابرای ئەگەرلێی زەنین بوو،دەستی بۆسەری برد پەڕەمریشکێ لەسەری خۆی کاتەوەو هەموعالەم چاویان پێکەوت.؟

مەلاسێمان دەڵێ ئەوەتادزی مریشکەکانم، ئیدی ؟

بەڵێ مەلاسێمان بەئەوجورەی وبەزانای خۆی دزی مریشکەکانی دەبینێتەوە.



## عەرەبی چاك دەزانێت

کابرایەك کوڕەکەی دەبەر خوێندنێ نابو، چەندوەختان هەربۆی خەرج کرد، ڕۆژێکی مام فەقێ بەخۆوبەمەندیلێکێ وە.بوسەردانێ دایك وبابانی دیتەوەماڵێ، بابی لێی دەپرسی ودەڵێ کوڕم ئەتو ئەوەچەند وەختە دەخوێنی پێمبڵێ بزانم چ فێربویە؟

فەقێ دەڵێ بابەگیان عەرەبێ فێربومە.بابەکەی:یانی عەرەبێی بەتەوا وی فێربویە؟!

فەقێ :بەڵێ بەڵێ بابەگیان عەربێ بەتەوا وی فێر بومە!

باوکی دەڵێ باشە کوڕم ئەگەروایە بایەك دو عەرەبیانت لێبپرسم بزانم چۆنی؟

کوڕە دەڵێ فەرموبابەگیان؟کابرادەڵێ عەرەب بەکەڵی دەڵێ چی؟

فەقێ :بابەئەوەزۆرگەورەیە.بابەکەی:باشەباوابیت؟ئەدی عەرەب بەکێچی دەڵێ چی؟

فەقێ:بابە! ئەوەش زۆر چوکەیەکابرا: ئاخربڵێم چی:باشە، یەکیان گەورە و یەکیان چوکەیە؛ ئەدی بە عەرەبی بەبزنی دەڵێن چی؟ فەقێ:

وەڵڵابابەنازانم بەبزنێ دەڵێن چی بەڵام نێوێکی زۆرسەیریان لەمەڕێ هەڵدەدن.

## عەرەبیزانێکی دیکەش

ئەو کابرایەش کوڕەکەی دەبەر خوێندنێ دەنێ و ماوەیەکی زۆر خەرجی بۆکێشا هەتاڕۆژێکی لەدوای ناردو هێنایەوە ماڵێ؟پاش نان وچاخواردنێ شەوێ قسەخۆش بون و مەجلیسیش گەرم، بابەکەی پیاوێکی زۆرزان بو،بانگی کوڕەکەی کرد:دەوەرە ڕۆڵە! ئەتۆ ئەوە چەند وەختەدەخۆێنی دەبابزانم چ فێر بویە؟!

مام فەقێ دەڵێ بابەگیان عەرەبێ فێربومە.بابی:یانی عەرەبێ بە تەواوی فێربویە؟!

کوڕە بەڵێ بابەگیان، عەرەبێ بە تەواوی فێربومە.

چونکەخویندنی ئەوزەمانی بەتایبەتی لەنێو فەقییان هەرعەرەبی بو.

:باشە؟جا ئەگەر وایە، عەرەب بە شێوی ساردبۆوە دەڵێن چی؟ کوڕەکە مەحتەلما ئاخر شتێکی وای لێ نەپرسی بودەکتیب ونوسرا واندا هەبێت ناچار فکرێکی کردەوەو گوتی عەرەب قەت ناهێڵن شێویان سارد بێتەوە؟ هەربەگەرمی دەیخۆن!

## سوڵتان مه حمود هەیاس ونه سمه رێ خاڵ بارامی

سوڵتان مەحمود ڕۆژێکی لە دیوانێ دانیشتبو لەعەینی کەیفخۆشیێدا لەناکاو بانگی کرد:هەیاس لەهەمولایەکی ڕا بانگ کرا:هەیاس! هەیاس! دیوان دەنگیداوەو هەیاس گوییێلێبو، ولامیداوە. گوتیان، سوڵتان بانگت دەکات، هەیاس چوێ خزمەت سوڵتانی، سلاوی لێکرد، ولامی داوە؛ سوڵتان ئەمری کرد هەیاس دانیشە.

بەڵێ هەیاس دانیشت. سوڵتان دەڵێ هەیاس! ئەوچەند کارانەم بەتۆ هەن بۆماوەی دو ساڵان، دەبێ بۆم جێبەجێ بکەی هەیاس:فەرمو. قوربان.

سوڵتان مەحمود دەڵێ:

١ـ کوڕێکم دەوێ کوڕی خۆم بێت و نەمزانیبی.

٢ـ ئەسپێکم دەوێت لە ئەسپی خۆم بێت و نەمزانیبێت.

٣ـ تاژیەکەم دەوێت لە تاژی ڕستەی خۆم بیت و نەمزانیبێت.

٤ـ بەرماڵێکم دەوێت، ڕیسەکەی نەبرابیتەوە ونەهەڵیشقەندرابێتەوە.

هەیاس برێك داما، دوایە سوڵتان پیێگوت بۆ داماوی نازانی د وساڵانم موڵەت داویی ٠، هەیاس :بۆ داماوم، یان خەڵاتە یان بەراتە.

هەیاس پاش دەمێك بیرکردنەوەوەدەرکەوت، برێك لەنێو شاری گەڕا،دەئەو فکرەیدابو،خوایە ؟کێ پەیدا بکەم ئەوکارەم زۆر موشکیلە ئاخر ئەوەچۆن دەکرێ. چاوی بە ڕێگایەکی کەوت،ئەوڕێگایەی گرتەبەرو بەفکرەوەڕۆییشت،دەگەڵ پیادەیەکی کەمێك ڕۆییشتن، هەیاس سەبردەڕۆییشت وکابراش توند،هەیاسی بەجێ هێشت،

سوارێکی گەییشتی لەگەڵ سوارەکەی برێك ڕۆییشتن،سواروپیادەهەر.ڕەفاقەتیان نابی. سواریش ڕکێفی لەماینێ دا و هەیاسی بەجێ هێشت؟ ئەوجار کابرایەکی ڕوتەڵەی لێ پەیدابو،ماندونەبونیان لێك کردو هەرچەند هەیاس خۆی مەعتەل کرد بە بیانوی چونە سەراوێ و ... بەجیێهەرنەهێشت، هەیاس دە دڵی خۆیداگوتی ئەوە ڕەفیقمە!

لیێپرسی:خاڵەنێوت چیە ؟کابراڕوتەڵە:نێوم خاڵ بارامە.هەیاس:خەڵکی کوییێ؟

ئەورێگایەیەك سەرەدەچێتەدێیەکەی مەئەگەرگەییشتینەدێیەکەی نێوی دیەکەشت پیٚدەلێم.زۆرپۆیشتن وگەییشتنەچۆمێکی بیٚ پردوبازگـە،هەیاس:خالْ بارام بالێرەپردیٚ دروست کەین. خالْ بارام کە گوییٚ لە کەلیمەی پرد دروست کردنیٚ بو دەدلّی خویٚ دا گوتی ئەو کابرایە ئەوە دەلّیٚ چی؟ چۆن لێرە پردیٚ دروست کەین.

بەلّیٚ! یکیان ئەوی دیکەی لەکوڵیٚکرد ولەچۆمەکەی پەڕاندەوە، ؟ زۆر نەڕۆییشتن گەییشتنە هەورازێکی دورو درێژ. ئەوجار هەیاس گوتی خالْ بارام با لەئەو هەورازەی پێپلیکانان دروست کەین. خالْ بارام ئەوجار گویی لە قسەوباسی پلیکانان دروست کردنیٚ بو گوتی بەخوای ئەوە شێتە، دەنا ئەو هەورازەو پلیکان، یان چۆم و پرد دروست کردن وابەتالّوکە،

بەلّیٚ وردە وردە بەقسە کردن و نەزیلەگێڕانەوە، وەسەرکەوتن وگەییشتنە ئاوایەکەی مالّەخالْ بارامی لیٚبو. لە قەراغ دییٚ خالْ بارام نێوی دێیەکەشی پیٚنەگوت، لەجیاتی ئەوەی بلّیٚ میوانبە یافەرموبچینەمالّیٚ ؟لییٚپرسی ئەریٚ کاکەدەچیەکوٚی هەیاس ولاّمی داوەوگوتی ئەتوٚ نا مزگەوت.

هەیاس چوٚ مزگەوتیٚ و خالْ بارامیش چووّە مالّیٚ خالْ بارام کچێکی هەبوبە نێوی ئەسمەر،کچێکی زۆروشیاروزرینگ بو٠ خالْ بارام چوٚباهەرجێگا وسەفەرێکی ، کەدەگەڕاوەمالّیٚ،هەرچی دیبای وبەسەری هاتبابوٚئەسمەریٚ کچی دەگێڕا وە؟

ئەوڕۆژەی هەرگەییشتەوەمالّیٚ،بانگی کرد:ئەسمەر!ئەسمەر!وەرەئەوڕوٚکابرایەکی زۆرسەیرم دیت دەئەوسەفەرەی‌دا.ئەسمەرهات لەتەنیشت بابی دانیشت:دەی بابەگیان بوٚمبگێڕەوە.خالْ بارام جاچت بوٚبگێڕمەوە؛کابراشێت بوشێت؛هەرقسەی هاتەران،پاتەرانی دەکردن، ئەسمەر:چۆن چی دەگوت :گەییشتینە چۆمی کەندەسوری، دەیگوت وەرەبا لێرە پردی دروستکەین:دەی بابەگیان خوٚئەوچۆمەبازگەوپردی نیە ئەدی چۆن لە چۆمەکەی پەڕینەوە؟!جاچۆن پەڕینەوە؟!ئەوکەمێك لەمن جحێلّتربو،ئەمنی لەکوڵیٚ کردوپەڕاندمیٚ وە.ئەسمەر بڕێکی فکرکردەوە وگوتی،نا ئەوە شێت نەبوە بابم تێی

نەگەیشتوە.ئەسمەر :دەی بابە گیان چی دیکەش؟

:ئەوجارگەییشتینەئەوهەورا زەی بەردێیەکەی خۆمان دەیگوت بالەئەوهەورازەی پلیکانان دروست کەین؟:

دەی بابە ئەدی لەهەورازەدوورودرێژەی چۆن وەسەرکەوتن جاچۆن وەسەرکەوتین هەربەسەرهات ونەزیلەی گێرانەوە،نەمزانی چۆنیش وەسەرکەوتین!

ئەسمەردەدڵی خۆیداگوتی،بەخودا ی ئەوە واوێدەچێ ئینسانێکی زۆرتێگەییشتو بوبی لەوانەیە هەیاس بێت.:دەی ئەدی دوایە:دوایە گەییشتینەقەراغ دێ، پێم گوت ئەدی کاکەدەچێە کوێ؟!هەروەکوشێتان گوتی،ئەتۆنا مزگەوت!

ئەسمەردوبارەپاش برێك بیرکردنەوەی هێنای دوازدە هێلکەی کوڵیوو نانێکی وەبابی دابۆ تاقیکردنەوەی، گوتی بابە گیان ئەو نان وهێلکەی بۆئەو کابرا فەقیرەی ببە مزگەوتێ، بەلام، کابرا هەرچی گوتی، وەرەبۆم بگێرەوە.

خاڵ بارام نان و هێلکەی دە ست دایەو.وەرێکەوت بۆمزگەوتی، لە رێگایە ئیشتێای چۆیە، هێلکێکی خوارد، ئەگەرنان وهێلکەی لەمزگەوتێ، وە هەیاسی دا هەیاس تیێفکری نانێك و یازدە هێلکە، لیێوەرگرت وگوتی خالۆ،بەئەو کەسەی بلێ کەئەونان هێلکەی بۆمن ناردون، چما لەلای ئیوەسالێ یازدە مانگە؟!

بەلێ، خاڵ بارام هاتەوە مالێ وئەسمەر لیێپرسی:بابەگیان؛نان وهێلکەت بۆئەوکابرا فەقیرەی برد.خاڵ بارام:بەلێ بۆمبرد.ئەسمەر:ئەدی چیگوت؟

خاڵ بارام:هیچ.ئەسمەر :هەر هیچی نەگوت؟خاڵ بارام:نا هەرئەوەندە گوتی بەئەوکەسەی بلێ کەنان وهێلکەی بۆناردوم چما،لەلای ئێوەسالێ یازدەمانگە؟ئەسمەربیری کردەوەوزانی بابی هێلکێکێ خورادوە؟!ئەسمەر:بابەگیان!بوهێلکێکت خواردبو.

خاڵ بارام:ئەرێوەلڵازۆرم ئیشتێا چۆبۆیە،ئەوە چونت زانی؟! ئەسمەر ئەوجار لیێ عەیان بوکە ئەوەهەیاسەوکارێکیشی لێ قەوماوە؛ئەسمەر.زۆربە بێدەنگی ونەهێنی چۆ مزگەوتێ وهەیاسی هێناوە مالێ،پاش خواردنێك و چایی یا ... خواردنەوەیەك

لیێ پرسی:هەیاس ئەوە چۆنە لێرە پەیدابویە، چت لێ قەوماوە؟!

هەیاس گوتی ئەتوچۆن دەزانی ئەمن هەیاسم؟ ئەسمەر برێك لەقسەكانی ئەگەربابی بۆی گێڕابووە،گێڕایەوە وگوتی بەئەوقسانەت ڕادەزانم ئەتوهەیاسی.

هەیاس:ئەمن دەردی خۆم بەكەسێكی دەڵێم كەبۆم دەرمان بكات. ئەسمەر:كاك هەیاس؛ ئەگەر دەردی تۆبەمن دەرمان نەكرێ، بە كێ دەرمان دەكرێ. هەیاسیش ئەگەر ئەوەی گوێ لێبو دە هەیبەت و ئاكارو زرینگی وزانایێ ئەوكچەی فكری.بۆخۆشی دەدڵی خۆیدا گوتی،ئەوكارەئەگەربەئەوكچەی نەكرێ، بەكەس ناكرێ! بانگی ئەسمەریی كرد، لەكنە خۆی دانا، ئەوەی سوڵتان مەحمود لیێویستبو بۆئەسمەریێ گێڕا وە. ئەسمەركچێكی كەمێك دەنێوەچوبوبەلاّم جوان وكارجوان وكارنەخشین بۆ،بۆیەش مێردی نەكردبوومابۆوە خۆی ڕاگرت بوخۆلاسەچاوی لەسەرەوەبوو؟!بیرێكی لیٚ كردەوەوئەوەشی بەهەل زانی وخەریكی ڕێك خستنی گەلاّلەكارەكەی خۆی بوە.

گوتی كاك هەیاس:ئەتۆ بچۆوەتەنیانەوەندەم لەتو دەوێ،ئەگەرسوڵتان مەحمود چوۆڕا وێ، وبۆهەرجێگایەكی چوئاگادارم كەوجالێم گەڕێ.

هەیاس:بەچاوان.هەیاس گەڕاوەبۆدیوانی سوڵتان مەحمودی.بەلیٚ!پاش بەینێكی، سوڵتان ئەمری كرد تەدارەكی ڕاوێم بۆبگرن، دەچمەڕاوێ وهەتادوحەوتوانیش ناگەڕێمەوە.هەیاس ئاگاداری شوێنی ڕاوگەكەی بوزانی كەدەچێتەكوێ لەئەوەلٚ ودوهەمی مانگی بانەمەڕێ وزوێكی خەبەری بۆئەسمەرێ هێناكەدەچێتەكوێ وگەڕاوەبۆماڵەخوی یادیوانی سوڵتانی ئەسمەرلە سواری ولەهەموكارێكی وریابو.وهەموجورەبازیەكیشی زۆربەباشی دەزانی.بەلیٚ:خێوەت وئەسبابی ڕاوێ سازكرد،لیٚی سواری ماینێكی شێی عەڕەبی بو، دوسێ تاژی وتولەی وەدوای خۆی دان،چەنددەستە بەرگی ژنان وپیاوانی نۆی وتازەدەگەڵ خۆی بردن بەینی شەوو.ڕۆژان،لەبەرانبەری خێوەتی سوڵتان مەحمودی كە هاتبۆ ڕاوێ،خێوەتی هەڵدا .جارێك بەبەرگی ژنان ودو سێ جار بەبەرگی پیاوان هاتەدەرێ وسەری ماینە شێیدا وهەرواهاتوچوییٚ دەكردبۆدەرێ، سوڵتان كەچاوی بەئەو

کچەی کەوت وچۆۆەژوریٚ وئەوجار لاوێك هاتەدەریٚ، گوتی بچون ئەو کورە جحێڵەم بوٚ بانگکەن. پیاوی سوڵتانی چون لەدوی وئەویش دەستبەجیٚ، بە دەستوری سوڵتانی هات پاش ئەحواڵپرسی، ئەمری کرد، دانیشت،پاش قسە وگوفتوگوٚیەکی،وای داناهیچم نە دیوە،لییٚپرسی:هەربەتەنییٚ؟! ئەسمەر:نەخێر قوربان! دەگەڵ خوشکم هاتومەسەیران وراوێ.پاش قاوەخواردنەوەیەك لییٚپرسی:چ بازیان نازانی؟

ئەسمەر:بەڵیٚ قوربان.:چ دەزانی؟:چی بفەرموی.:تاوڵەی دەزانی؟:بەڵیٚ قوربان. دەستیان بەتەختەی کرد.سوڵتان لیٚی پرسی:لەسەر چی بێت؟ئەسمەر:سوڵتان دەزانیت.سوڵتان لەدورراکە عاشقی خوشکی ببوهەربوٚیەش پێی خۆش بوبازی دەگەڵەویٚ بکا خۆدەنازۆری دەدیکانەهەبون بازیان دکەڵ بکات، گوتی بالەسەردڵخواز بێت.

ئەسمەر:بەڵیٚ بالەسەردڵخوازبێت.زۆر زوتەختەی لەسوڵتانی بردەوەسوڵتان :داوابکە. ئەسمەر:ئەمربفەرمومایەنکەم بەتەڵەبەلە ئەسپی خوٚت بوٚم چاکەن! :بەڵیٚ دوٚڕاندومە،بادایبنیێنەوە.ئەسمەر:فەرمو.سوڵتان:ئەوجارلەسەرچی بێت؟

ئەسمەر:سوڵتان دەزانیت.:باهەرلەسەردڵخوازبیٚ.:ئەمری سوڵتانیە.دەستیان کردەوەبە تەختەکردنیٚ،دەعەینی بازیٚدا،لییٚپرسی،ئەدی ئەوەچوٚنەخوشکت لەخێوٚەتی نایەتەدەریٚ؟:قوربان عادەتی مە ئاوایە،هەتانەچمەوەماڵیٚ،خوشکم نایەتەدەریٚ. ئەگەر بانگیشی کەن ولاٚم ناداتەوە هەتا بوٚخوٚم نەچمەوە.سوڵتان :وەڵلاٚ ئەوەعادەتی چاکە.؟

بەڵیٚ دیسان سوڵتان تەختەی دوٚڕاند،روی دە ئەسمەریٚ کرد :تەڵەب کە.ئەسمەر دەڵیٚ ئەمربفەرموتاژیەکەم بەبایەلەتاژی ڕستەی خوٚت بوٚم چاکەن!سوڵتان:ئەی بەچاوان بەچاوان، دوٚڕاندومە. دەستوری دائەومایەن وتاژیەی بوئەوکوڕەجحێڵەی چاکەن شەهوەت وای غەڵەبەبوٚهێنابو.ئەودەستورانەی تازەبەهەیاسی دابولەبیری نەمابو،چومایەن و تاژیەکان بێنیت. بوٚ ئەوەی سوڵتان پتری ئیشتیا بچیتیٚ، ئیك، دوجاران بەبەرگی ژنان هاتەدەرو چوٚوە ژوریٚ،بەرگی پیاوانی دەبەرکردنەوەوهاتەوەدەریٚ،مایەن وتاژی هێنان، هەردوکی چاکردن وبردنێوەلە جییٚ خوٚیٚ بەستنەوە، هاتەوەو پاش نەهاریٚ،

دەستیان‌کردەوەبەتەختەی دیسان لەسەردڵخواز،ئەوجارعەمدەن پێی دۆڕاندو. ڕوی دەسوڵتانی کردوپێی‌گوت تەڵەب کە.سوڵتان تێی‌ڕاماوگوتی بەڕاستی،لیاقەت وزانایی تۆبوۆەی دەبێت کەپیاولێت نیزێك بێتەوە،ئەگەرلێم‌قەبولکەی،ئەمن داوای خوشکت دەکەم وخوشکتم دەوێ!

ئەسمەر:قوربان! جێگای شانازیەبۆمە،دومەمیش ئەمن دۆڕاندومەهەرچی داوابکەی حازرم دەتدەمێ، دەچمەوەخێوەتێ دەگەڵ خوشکم قسان دەکەم چونکەئەمە ئەوڕەسمەشمان هەیە،کچ بۆشوکردنێ دەبێ بۆخۆی ڕازی بیت، ؟

چۆوە دەخێوەتێ وزویەکی بەرگی گۆڕی ودوجاران بەبەرگەجوانەکەی هاتەدەرێ و چۆوەژورێ ودوایەبەرگی پیاوانی دەبەرکردەوەوپاش ماوەیەکی هاتەدەرێ،ڕیێ‌داگرت وهاتەوەخێوەتێ سوڵتانی،دانیشت وگوتی قوربان خوشکیشم ڕازیەوئەمنی کردوتەوەکیل لە جەنابتی مارەبکەم،سوڵتان مەلای بانگ کردویەئەمری شەرع، خوشکی کەبۆخۆی بو.لەسوڵتان مەحمودی مارەکرد، دوای شامێ گوتی قوربان؛ ئەمن بەیانی دەڕۆم دەچمەڕاوێ و هەتادو ڕوژی دیکەنایەمەوە،جەنابیشت دەگەڵ چەند پیاوی باوەڕپێکرا وی خۆت دەتوانی بچی بۆلای خوشکم چونکە تەنیایەوحەلاڵی تۆیە، ئەوکاتەی ئەسمەر چومایەن وتاژی جێ بەجێ کردن وهاتەوەخێوەتێ، ؟

سوڵتان سبحەینێ‌لای نوێژی شێوان دەگەڵ چەندباوەڕپێکراووقەراوڵان چۆ خێوەتی کچەی.تادو سێ شەوان لەلای‌بو، سوڵتان چووەبارەگای خۆی، ئەسمەرشەوێ ئەسپی کەوتەدەستی وخێوەتی بەلادامیناو چۆوەماڵەخاڵ بارامی بابی.بەیانی سولتان وهاوڕێیانی کەهەستان تەماشایان کردچەتەماشاکەن نەخیوەت ماوەونەکەسیش دیارە،

هەرچەند سوڵتان پیاوی ناردن وگەڕان، هیچ ئەسەرێکیان وەدەستنەکەوت، چونکەدەگەڵ هەیاسیش قەراریان دانابو. هەتائەوکارەی بۆجێبەجێ نەکات، حەقی نەبو دا وای هیچ کارێکی دیکەی لێبکات ،باکارومشکێلی زۆریش گەورەبایە. ؟

سولّتان لەبەر داغداری ونارەحەتیانی کەئەوتولەنەمامەی بێ هودەلەدەست چۆدەرێ هێندە نارەحەت بوو،ڕاوی بەتاڵ کردو گەڕاوە بۆ ماڵێ. ئەسمەریش چۆ بازاڕی چەند بزنە مەرەزی کڕین و هەموڕۆژی بە شانەی دەکردن وەتابەشی بەرماڵێکی لێ پەیداکردن، کردیەبەرماڵ.ئەوجارپاش وەزعی حەملی، کەحامیلە ببو،کوڕێکی بووکوڕەکەی دابەدایانێ دایان زۆربەجوانی کوڕەکەی بەخێوکرد، ماین وتاژیەکەشی دەوەختی خۆیان دا زان، پاش دو ساڵان،هەیاس، یاغریاغر،چوبوّلای ئەسمەرێ هەتابزانیت بڕیاروقەولەکەی چی لێ هاتۆتەوە،ئەسمەرکەئاگاداری هاتنی هەیاسی بو،بەپیرێوەهات ومام هەیاس چۆماڵە خاڵ بارامی، پاش چاك وخۆشی و حەسانەوەی لێپرسینێکی گەرم وگوڕ، ئەسمەرگوتی، مام هەیاس، ئەوەت ئەسپەکە چۆنە؟ هەیاس:ماڵم قەبرە، هەریەکن دەگەڵ ئەسپی سولّتانی، جا چوتاژیەکەشی لەتەویلەی بۆدەرکرد، هەیاس، چاوی لێ کرد و:بە خوای دەڵەی لە تاژیە ڕەستەی سولّتانی دزراوە، ئەوجار بردیەدیوی ژورێ، کوڕەکەشی نیشان‌دا، پیێ‌گوت ئەوەشت کوڕەکە.هەیاس بڕێکی تەماشای کوڕەکەی کردکەبەجوانی شبی سولّتانی دەهاتی، ئەوجار گوتی ئەوەشت بەرماڵ، هەیاس سواری ئەسپێکی بو، جانو ئەسپی لە دوا ی خۆی ڕادەکێشاو تاژیەکەشی دەڕەستەی کرد، کوڕەکەشی لە پێش خۆی دانا، بەرماڵی بە سەرشانان داداو بەرەو دیوانی سولّتانی کەوتەڕێ،

کەدورونیزێك بو خەبەریان دابەسولّتانی:هەیاس هاتەوەو سواری ئەسپێکی بووەو جانو ئەسپێکی لەدوای خۆی ڕادەکێشی و تاژیەکیشی دەڕەستەی کردوە، منداڵێکی چوکەشی لە پێشەخۆی داناوە، سولّتان کەچاوی بەداخوازیەکانی کەوت، زۆرخوشحاڵ بو، بەخێرهاتنەوەێ هەیاسی کردو یەلەیەك تەماشای هەموانی کرد، جانوئەسپەکە لەبەر منداڵیی نەبا دەگەڵ ئەسپی سولّتانی دەگۆڕا. تاژیەکەشی هەروابو. ئەوجار تەماشای کوڕەکەی کرد ئەویش زۆربەڕونی شێوەی سولّتانی دەدا. بەرماڵەکەشی لە پیش داناوحاڵی کرد چۆن دروست کراوە، ئەوجار سولّتان ڕوی دەهەیاسی کرد و پیێ‌گوت هەیاس! بەڕاستی ئەوەی دەئەوعەسرئیدا بەتۆ دەکرێت، بەکەس ناکرێت، خواستی

ئاخیرم ئەوەیە، ئەمن ساحێبی ئەوانە شم دەوێت، هەیاس کە زۆری زەحمەتی فکری کێشابو، گوتی قوربان! ئێمە قسەی ئەوەمان نەکردوە، پاش بڕێك جەفەنگ لێدانی وقسەی دەخۆش،گوتی ئەمن ساحێبی ئەوانەشەت دەدەمێ، بەڵام ئەوت بەکەیفی خۆم دەدەمێ. سوڵتان گوتی ئەمن هەرچی لەتۆم ویستووە،هەموت جێبەجێ کردونەو چتنەگوتوەئەمنیش لێرە هیچ ناڵێم چۆنی ئەتۆبڵەی وادەکەم،جاهەیاس هینای دوبارە ئەسمەری لە سوڵتان مەحمودی مارە کردەوەو بە مدعای دڵی خۆی بە سوڵتانی ڕا زا ندەوە وبەچەوروشیرنی بوکێان بۆ سوڵتان مەحمودی غەزنەوی دابەزا ند. ئەو هەمو کەروێشکەیان لەڕاوێ گرتن هەر سەنگەسیرێکیشیان نەداینی شیرنێ بوکێ.

**(شیعری )باسی سوڵتان مەحمود و هەیاس و ئەسمەرێ کچی خاڵ بارامی**

سوڵتان مەحمودی خۆشبەخت و ئیقباڵ ... شاد و بەکەیف و بێخەم و خەیاڵ
ڕۆژێك دانیشتبو لەو سەراپەردە ... جیێ تەگبیر بگوژە، بگرە یان بەردە
هەر کە گوتی هەیاس! لە نیزێك و دور ... بە بێ مەعتەلبون، زو هات بۆ حزوور
:من ئەو چەند کارەی کە بە تۆم هەیە ... هەرتا دو سالیش مولەتمان هەیە
ئەسپێکم دەوێ لە یەختەخانەی ... ئەسپەکانی خۆم، نەگری بەهانەی
تاژێك لە ڕەستەی تاژیەکانی ڕاو ... بە ڕەنگی و ڕەسەن نیشانەی تەواو
دەتەوی سوڵتان کە لێت ڕازی بێ ... کوڕێك لە خۆم بێ ونەشم زانیبێ
بەرماڵێك ریسی نەبڕابیتەوە ... نابی وا هەڵیشقەندرابیتەوە
هەیاس وا کەوتە نێو هێند فکر و بیر ... کوا؟بە کێ پێکدێ ئەوخواستەی ئەمیر
سوڵتان پیێدەڵێ بۆ وا داماوی؟! ... دو ساڵ مولەتەدەی بوم داناوی
پاش ئەوەی کەمێك گەڕا دەوروبەر ... ڕێگای گرت ئەوجار لە شاری چۆدەر
لەگەڵ پیاوێکی بەینێکی ڕۆییشت ... بەتاڵوکەبو، بەجێی هێشت، ڕۆییشت
دوای وی هاوڕێکی سواری گەییشتێ ... چەندی توندڕۆیی هەرنەی گەیشتێ

ئەوجار گەیشتە هاورێکی زۆر باش | بەجێی هەرنەهێشت بونە دو یوڵداش
دەڕۆیین هەروا بە قسە و زۆر ئارام | پرسی نێوت چیە؟! گوتی خاڵ بارام
خاڵ بارام ئەدی ماڵت لە کوێیە؟! | بگەینێ پێت دەڵێم ماڵم لە دێیە
گەیشتنە چۆمێك بە بێ بازگە و پرد | بۆ پەڕینەوە ئاوای بیر لێکرد
پێیگوت خاڵ بارام با پردێ سازکەین | با لە لەم ئاوەی خۆمان دەربازکەین
کەمێك لەو قسە بیریکردەوە | کوانی چۆن دەکرێ دەڵێ چی ئەوە
یەك یەکی لە کوڵ کرد پەڕینەوە | کەوتنە ڕێ بە قسە و پێکەنینەوە
گەینە ڕێیەکی زۆر دەستەو هەوراز | ناخۆش بو، بۆ پیر نەخۆش و بێواز
دەیگوت پلیکانان با سازکەین لێرە | ئە لەو هەورازە، خۆم لێ مەبوێرە
هێندە پلیکانان جا چۆن دروست کەین | تا چەند ڕۆژ دەبێ لێرە کارێ بکەین
بۆخۆی بە خۆی گوت نابێ تەواوبێ | ئەو پیاوە بەش قەم حاڵی هەر وابێ
هەورازیان بڕی، بە بێ ماندوبون | هێندەیان قسە بۆ یەك تەرکردبون
هەر وەسەرکەوتن، گەینە ئەو دێیە | ماڵی خاڵ بارام هاورێی ڕێ لێیە
نێوی دێیەکەی پێنەگوت و دەڵێ | دەچیە ماڵە کێ؟! دادەی پێم بڵێ
زانی ڕەفیقی لە حاجەت کەوت | پێیگوت ئەتۆ نا؛ دەچمە مزگەوت
ئەوەشی کە بیست دوای هەمو قسانی | ئەوجار هەر تەواو بە شێتی زانی

**خاڵ بارام کە چووە ماڵێ، بۆ ئەسمەرێ کچی چ دەگێڕێتەوە؟!**

با بۆت باسبکەم، نەقڵی خاڵ بارام | کچێکی هەبو، عاقڵ، زۆر بەفام
کچەکەی نێوی، لێنابو ئەسمەر | پوخت و پاراوێك، جوانێك وەك گەوهەر
جوانێکی تا بڵەی شیرین و لەبار | تەعریفی بە کەس نەدەکرا بە زار
ئەو کچە ئەسمەر نێوی نرابو | بەڕاست ئەو نێوە، خەسار نەکرابو

هیچ کارێك نەبو کە نەیزانیبا ‌ ‌ ‌ ‌ با بلێین ئەو شتەی قەتی نەیدیبا
باشی دەزانین گشت کاری پیاوان ‌ ‌ ‌ ‌ لە کاری ژنانیش تا پنج و بناوان
بۆ هەرکوێ چوبا و کە دەگەڕاوە ‌ ‌ ‌ ‌ چی دیبا بۆ کچەی پاك دەگێڕاوە
هەر گەیشتەوە بانگی کرد:ئەسمەر ‌ ‌ ‌ ‌ وەرە هێناومن هێند باس و خەبەر
ئەسمەر خێرا هات، دانیشت لای باوە ‌ ‌ ‌ ‌ جا بۆم بگێڕەوە هەرچی ڕوی‌داوە
توشی پیاوێك بوم قسەی وای‌دەکرد ‌ ‌ ‌ ‌ پردی لە چۆمی زو دروست دەکرد
:چۆن پەڕینەوە ئەدی لەو چۆمە ‌ ‌ ‌ ‌ ئەمنی لەکۆڵ کرد بە کۆمە کۆمە
دەی چی دیش بابە بۆم بگێڕەوە ‌ ‌ ‌ ‌ هەموانم پیێ‌بڵێ، لێم مەشێرەوە
دەی‌ویست پێپلیکان ئە لەو هەورازە ‌ ‌ ‌ ‌ دروست کا ونێوی بنێ‌کاری تازە
لە هەورازەکە چۆن وەسەرکەوتن ‌ ‌ ‌ ‌ بە قسە و نەزیلە حەکایەت گوتن
ئەسمەر بە خۆی گوت، نەخێر وانییە ‌ ‌ ‌ ‌ ئەو قسە جوانانە لەخۆڕا نییە
دەی بابە ئاخر چۆ کوێ ئەو پیاوە ‌ ‌ ‌ ‌ هەر گەینە نێو دێ لە دوام گەڕاوە
گوتم دەچێە کوێ لە ڕۆیین‌کەوت ‌ ‌ ‌ ‌ ماڵە تۆ نەبی ودەچمە مزگەوت
زو دوازدە هێلکەی هینا بۆ کوڵاندن ‌ ‌ ‌ ‌ لەگەڵ نانێکی، هەموی بۆ ناردن
نانی بۆپیاوەی بەرەوبێرەوە ‌ ‌ ‌ ‌ هەرچی گوتی بەڵام بۆ منی بگێڕەوە
بابی بۆی بردن لەم هات و چۆیە ‌ ‌ ‌ ‌ خواردی هێلکێکی واکەیفی چۆیە
نان و هێلکەکەی ئەگەر بۆدانا ‌ ‌ ‌ ‌ لێیانخوردبۆوە هەیاسی زانا
کی بۆی ناردومە پیی‌بڵێ لە ڕێوە ‌ ‌ ‌ ‌ بو یازدە مانگە ساڵ لە لای ئێوە
بابی هاتەوە باسی چی نەکرد ‌ ‌ ‌ ‌ ئەسمەر بانگی کرد، پرسیاری لێ کرد
نان و هێلکەکەت بردن بۆو پیاوە ‌ ‌ ‌ ‌ چی‌گوت؟! کوا خۆ تو چت نەگێڕاوە
بۆم بردن بەڵام ئەو هیچی نەگوت ‌ ‌ ‌ ‌ خۆش‌بی، ماڵئاوا، دەستخۆشی نەگوت

کێ ناردویە تی پێی بڵێ لە ڕێوە: بۆ یازدە مانگە ساڵ لە لای ئێوە
بیری کردەوە و ڕوی کردە بابی ئەوە تۆ دەبی هێلکێکت خواردبی
جا چون نانێك و ئەو هەمو هێلکە دەی ئەتۆش وەرە گاڵتەمان پێبکە
عەقڵ و زانا یی ئەو کچە بناسە لەو قسە و باسانە، زانی هەیاسە

**با بزانین ئەسمەر لەگەڵ هەیاسی چ دەڵێ و چ گەلاڵەیەکی دادەڕێژێ**

ئەسمەر چو هەیاسی هێناوە بۆ ماڵ ڕوون وبە وردی لێی پرسی ئەحواڵ
پێیگوت مام هەیاس! چت لێقەوماوە دەردت چیە؟! چۆنە کەوتویە واوە
تۆ چۆن دەزانی ئەمن هەیاسم: لە قسە و زانینت ئەتو دەناسم
هەیاس پێیدەڵێ ئەمن دەردی خۆم پێی دەڵێم کێبێ زۆرغەمخور بێ بۆم
بە کەسێك دەڵێم کارم بۆ چا کا نەك بمخافڵێنی و لێشم خەراکا
پێی گوت کاری تۆ بە من چانەبی دەی چاوەڕوانیت لە کەس هەرنەبی
هەیاسیش ئەگەروا بیری لێ کرد ئەویش قبوڵ قسەی ئەسمەریێ کرد
ئەو کارە ئەگەر بە ئەو کچە نەکرێ چاوەڕوانیم کوا بۆ لە کێ دەکرێ
ئەو هەمو عەقڵ و هۆش و زانینە ئەسمەرێك هەبو لەو سەرزەمینە
پێیڕاگەیاندن خواستی سوڵتانی یەلیەکە هەموی ورد و بە جوانی
جا گوتی مام هەیاس! کارێکم بۆبکە شا چۆ کوێ بۆ ڕاو ئاگادارم کە
دەڵێ بە سەرچاو، ڕاوگەی سوڵتانی پێت دەلێم بۆخۆم، دێم بە پەنهانی
هەیاس گەڕاوە دایانا قەرار تا شا ئەمری کرد بۆ ڕاوو شکار
هەر ئاواش هەتا دو حەوتوی تەواو بمینێتەوە لە جێی دیاریکراو

هەیا س هات پێی گوت جیگا که کوێیە؟ | بۆخۆی بەشداری، کردبو لەو جێیە
کەوتنە ڕێ بوڕا وسولتان وەز یر | گەینە ئەو شوێنە ی بە ڕاو تەکبیر
دابەزین سوار و پیادە دامەزران | لە چەند لاوە ڕیك خێوەت هەلدران
لە بەرقەدی چیا، ناو گول و گولزار | لە مانگ گولان دالە ئەوەل بەهار
ڕازاندیاننەوە خێوەت هەموجور | زەرد و شین و سور دەبینرا لە دور
تاژی چوارپەل سور شینەیان گەوزاند | بە سەختەداران کەبابیان برژاند
بلەیێن کەیفك وهیندخۆشیان ڕابوارد | چی بەزم و شادی لە هیچیان نەبوارد
ئەسمەردەست بەکاردەبی

---

تەواوی شمەکی،زوحازرکردن | چی لازم باوبۆ،دەگەل خۆی بردن
سێ چوار دەست بەرگی زۆر جوان ژنانە | هەموی نمونەیا بلەیێن شاهانە
دو دەستیش بەرگی پیاوانەی لەگەل | تێکینان ئەشیا و هەمو کەل و پەل
سواربو لە ماینێك ئەو شێی عەڕەبی | تاژیەکی دێلیش دەبی دەگەل بی
نێو شینکەی بەهار نیزێکی کانی | هەلیدا ڕۆژێك زۆر زو بەیانی
خێوەتێکی جوان سەر بە ژەنگا ری | تا لە دوری ڕا باخوبدا دیاری
شا هەستا چاوی بەو خەیمەی کەوت | ڕەنگاوڕەنگ و جوان، وا بە هەلکەوت
مەگەر دیترابا لە مالی گەورە | ئەسمەرکەتەکارگێڕای ئەوەدەورە
هاتەدەر خۆی نواند هێند بە عیشوە و ناز | نێوقەدوەك شمشال،چا و یش وەکو باز
وای لەخۆ کردبو ئەسمەر، هەر بۆیە | زیندوهیچ، مردوش، ئیشتیای دەچوێیە
چەند جاران ئاوا کە هات و چوێی کرد | ئەوجار چو بەرگی کاکی دەبەرکرد
هاتەدەر ماینی هێنا سەر ئاوێ | تاقەتی کردن ئیتر پێی ناوێ
سولتان کە وای دی کەم ما بو شێت بێ | گوتی دا ئەوکوڕەم بۆ بانگ کەن با بێ

سولتان توی د ە و یٚ گزیر پیی دەلٚـیٚ — زۆر بـە ئیحـترام گوتــی دێـم بـەلٚیٚ

قولینچکی خێوەتــی هـەلٚد ا وەوو بـەلٚیٚ — قسێك یا شتێکی بە خوشکی دەلٚـیٚ

چوٚ ژور بە دو دەنـگ کـەمێك قسەی کرد — بـەلٚیٚ ئەننـەهو خوشـکم حـالٚی کـرد

هات چو لە پیش شا پاش عـەرزی سـەلام — ســولٚتان و کـی بـون عەلێکەسســەلام

سـولٚتان دەســتوری دانیشـتنی پـیٚدا — فەڕاشیش کویٚ بو هات جییٚ نیشـان دا

پـاش سـەرفی چـایی، قـاوە و قـەلیان — پرســی نــازانی داخــوا چ بازیــان

ولـلا هــی بــەلٚیٚ ســولٚتانم خوٚشبــی — کوا چی دەزانی چی تـوٚ پێت خوٚشبی

## بزانین ئەسمەر چوٚن بازێکی دەکا

دا تا ولٚەی بێنن:دەی جـا لـە سـەر چی — هەر بوٚخوٚت داینێـی چوٚن و لـە سـەر چی

لـە سـەر دلٚخوٚازبیٚ جاریٚ ئـەو دەسـتە — دەیزانـی سولٚتان چیـە و چـی مەبەسـتە

تەختـەیان هێنـا و دەســتی کـردەوە — زویـەکی دەسـتێکی لـە شـای بـردەوە

:دوڕانـدم! تەلٚـەب کـە چی لێم بخوازی — بـە دلٚ دەتدەمـیٚ و لێـت نیـم نـاڕازی

دەسـتور بفــەرمو ماینەکــەم چاکــەن — لە ئەسپە کـەی خـوٚت کارمـان رەهـا کـەن

بــەلٚیٚ! قەبولٚــە بــا داینیینــەوە — دەلٚیٚ لـە سـەرچی سـولٚتان هـەر ئـەوە

لێـی پرسـی تـەنیا چونـە وای لـێرە — پـەیدابوی بـەخێر ئیشــالله خـێرە

:تـەنیا نیـم خوشـکم لــەگەلٚمدایە — هـا توین بـوٚ سـەیران، بـوٚ گەشـت و کایـە

ئـەی چوٚنــە خوشـکت نایەتـە دەریٚ — قـاپ شـتێك کـارێك یـا ئـاویٚ بـەریٚ

عادەتمـان وایـە لـە مـالٚ نـەبیٚ پیـاو — ژن خـوٚ هەرنایـەت بـوٚدەر یـا سـەر ئـاو

سـولٚتانیش دەلٚـیٚ خـوٚ ئـەو عادەتـە — نیشـانەی زیـپـك و زوٚر و شـەهامەتە

ئـەوجاریش دیسـان دوٚڕانـدی تەختـە — دەلٚیٚ تەماشـا ی ئـەو شـانس و بەختـە

ئەوجا رچت د ە ویٚ ئـەی کـا کـە جوانـە — پێـم بلٚـیٚ حـازرم چیـت چـا وەڕ و انـە

لە ئەوتاژی ڕەسەن دەڕەستەت دا یە / ئەمر بوّم چاکەن تاژیم بەبایە
بە فەراشی گوت کاریّ پیّك بیّنن / جاری دو پیاڵەن قاوەی بوّ بینن
سەرف بو قاوە بەلاّم بە بیّ‌واز / تەختە دانراوەهەرلە سەردڵخواز
بە عەمدی ئەوجار، دوّڕاندی ئەسمەر / سولّتانیش لەکزی یەك جیّ هاتە دەر
ئە سمەر ڕ وّ ی تیّ‌کرد بەو چاوی بازی / هەرچی لیّت بویّم پیّی‌دەبم ڕازی
شا تیی هەڵڕ و انی و تی پیم و ا یە / هاتومە سەر ئەو بیرو بڕو ا یّە
لی‌ّزا نی وعەقڵ وئەولیاقەتە / نیز یّك بونەوەی توّخوّ نیعمەتە
کە لیّم قەبول‌کەی خوشکتم دەویّ / گوتی من ڕازیم، بەلّیّ دەتکەویّ
عادەتەتیّکیشمان هەیەو هەربویّە / کچ بوّ شو کردنیّ، خوّی سەربەخوّیە
بەلّیّ من بوّخوّم خوشکم د ە د و یّنم / زوّرم پیّ‌ناچی و،ولاّمیّش دیّنم
هە ستا چوّوە ماڵ، هەر وەژورکەوت / بەو بەرگەجوانەی وەك مانگ دەرکەوت
چوّ کا نی هیّدی ئا و گە کەی پڕکرد / سولّتان بە دوربین هەر تەماشای کرد
وای لە خوّ کردبو ئەسمەر هەربوّیە / زیندو هیچ، مردوش ئیشتیّای دەچوّیە
هەتا سیّ چوار جار دەروژوری کرد / بەرگە کوڕانەکەی خوّی هات دەبەرکرد
ماینەکەی ئاودا، تاژیشی هیّنا / چاکردن و بە کار دوایی پیّ هینا
بە خاترجەمی هەرتکی بردنەوە / لە جیّگا و شویّنی خوّشی بەستنەوە
پاشی چوّ ژوری بوّ ماویّکی کەم / ئەننەهو لەگەڵ خوشکم باس دەکەم
هاتەدەر یەکسەر چوّ لای سولّتانی / قسەی لەگەڵ کرد، شیرین بە جوانی
من چوم بوّو کارە خوشکم ڕا ز ی کرد / پاش کەمیّك سوّحبەت ئاوا عەرزی کرد
کردمیە وەکیلیش سوپاسی دەکەم / مەلایەك بیّنە لیّتی مارەبکەم
لە دیوانی شا بوّ وشادمانی / نەك ئاوا بەرچاو، هەر بە پەنهانی

مـەلایان هێنـا هـەر لـەو دەربـارە — بـێ هـەرا و بـەزم پێـك هـات ئـەوكارە
جـەناب دەتوانـی خۆسـبحەی شـەوێ — بـە قـات بەكێـەویاكێت خـۆش دەوێ
لـە سبەی شەوێڕا مـن دەچـم بـۆ ڕاو — تـا شـگە ڕێمـە وەو، دو شـەوی تـەواو
تۆبچوڵای خوشكم، پێت دەڵێم بۆیـە — لێـت مـارەكراوەۆ؟خـەلاّ لـی تۆیـە
تاژی و ماینەكـەێ ڕاگوێسـتن لـەوێ — پیێگوتـن كـەنگێ بـێ هێنـن بـۆ كـوێ

## سوڵتان مەحمود دەبێتە زاوا

سوڵتان مەحمودیش هەركە شامی خوارد — خـواردی ئەگـەرچی نـەیزانی چیخـوارد
لـەگەڵ چـەند كەسی زۆر باوەڕ پێكـراو — قـرِاوڵ وگزیـــر دەترســا لــە داو
شلشـل داگـەڕا ن،بـوڵای تـا زە بـوك — لە لای دیش لێیـان كردبـو دوعـا و تـوك
ڕۆیـین بـێ خشـپە چـووە ژوركـەوت — بـوك خـۆی سازكردبو چاویـان پێكـكـەوت
دو شـەو و ڕۆژان لـە لای بـوك مـاوە — بـۆ دیوانـی خـۆی، ئـەوجار گـەڕاوە
هەر نیوەی شـەوێ ماینی كەوتـە دەست — وەسـایلی هـەمو تێـك نـا لێكیبـە ست
هاویشتنی سـەر و كردنـی بـە بـن بـار — بەسـتی و لیـێ سواربو هێـدی یابـەغار
هاتـەوە مـاڵێ و خـوێ لۆەشـاردن — هـەرتا ڕۆژی خـۆی، هـەر خـۆی لێ بـواردن
بـەیانی هەسـتا سـوڵتان چ هەسـتی — وای دی پییخۆشبوقـەتیش هەڵنەسـتی
لـە جێگای شـۆخ و شـەنگ و چاوبـازان — كولـلارە هـاتوە نیشـتوە لـە رازان

## نەغمە و پەرۆشی سوڵتان مەحمودی بۆ ئەسمەرێ

ئـەی كـوا خەیمەكـەی سـەر بـە ژنگـاری — كـوا سـور گوڵـەكەی بـە لـەنجە و لاری
كوا ئـەو لێو بـەبزەی بێ شـەڕاب و مـەی — مەسـتی دەكـردم ئـەم بـو هۆشـی مـەی
تولـە نەمامـەی دەم ویسـت پـڕ بـە دڵـم — كـوا ئارام بەخشـەی دڵـەی پـڕ لـە كوڵـم
كوانی لـە یلە كە ی زۆر خۆ شم د ەو یست — مـن تـۆم خـۆشدەوێ جارجـار لێمدەبیست

کوا کوڵمەسوورەی بێ سو ر کر د نی | پیاو بۆی دەسوتا کاتی مردنی
کوانی مەحرەمی دڵەی پڕ ڕازم | کوا لە جێ نەغمە و ساز و ئاوازم
کوا قە د بڵیندە ی کەمەر باریکم | شیرن کەلام و زانا و مدر یکم
کوانی چیڵێ هات ئەو بەلەك توورە | دەبوٚم وەبینن ئەو پڕ شعورە
کوا خرنگەی بازنە و هارەی لەرزانە | پاموره و خرخاڵ، جوتەی پاوانە
سینگم لەت لەتی تیری مژۆڵی | بە بروی قەیتانی جەرکی منی کوڵی
ئەو بۆنە خۆشەی بە کێ وەبێنم | شەوچەرەی ماچان لە کێ بستێنم
ئا سکم بۆ ڕام بو، دەمگوت لەو ڕاوە | داخم هیچ ئەسەر نەماو توٚڕاوە
ئەو ئاسکە ناسکەی کە بوٚم کەوتە داو | من لێی حاڵی بوم هەر بە گێژە ڕاو
چەندی هاتن و چون دەرو ژورو خوار | بوٚوە قەترە ئاویك لە عەر ز ی چوٚ خوار
کوا دەڵێم ئوٚخەی دو شەو یا شەوێك | ئەویش بۆ ژیان لێم بێ بە خەویك[1]
هەرچەندی گەڕان ئەودوڵ وشیوە | لە هە رچی پرسیان دە یگوت نە مد یوە

سوڵتان ناچار بوڕا وبەتاڵی کرد لەبەر پەرۆشیان وادەردەکەوێ ئەسمەر کە هێندە جوان و زانا بوە، سوڵتانیش تەمەنی بڕێك چوٚتە سەرێ پیاوی بڕێك بەعومر، جوان و نەرم و نوڵ و شۆخ و شەنگێکی ئاوای وەدەستکەوێ و هەر ئاواش سوك و هاسان لە دەستی بچێ، بێ ئەوەێ بزانی چی بەسەرهات و چوٚن و چبو، زوٚر ناخوٚشە و ئەو پی هەلاگوتنەی زوٚر بەجێبوە.

سوڵتان ناچاربو ڕاوی کرد بەتاڵ | زوٚر بە بێکەیفی هاتەوە بو ماڵ
لە شار و لە دێ دایـنابون مەعمور | خەبەریك نەبو، لە نیزیك یا دور
لەگەڵ هەیاسیش دایـنابو بڕیار | پاشی ئەو کارەی پێیبسپێری کار

[1] ـ ئەو نیوە شێعرە هی شاعیر و نووسەری گەورەی کورد خوالیخوٚشبوو هەژاری موکریانییە.

چون لەبەر ئەوەی هیوای بڕابو هێندە تێك چوبو كاریشی كرابو
سوڵتان مەحمودی بەئەو دڵی پڕكەسەر جی هێڵێن با بچین بۆ لای بوك ئەسمەر

## با بزانین ئەسمەر ئەوانە چۆن بار د ێنی

چەند بزنە مەرەز سور وەك سورقوچی كڕینی بزانین ئەوانە بۆچی
ڕۆژی دوجاران شانەی دەكردن بەشی بەرماڵیی، ڕیس لێ كۆكردن
جاری د ر و ستی كرد ئەوەڵێ بەرماڵ لە پێش هەمو شتێك وەك بناغەی ماڵ
تاژیەكەی ترەكی دو كوڵێ هێنان بەخێوی كردن، جوان باری هێنان
پاش نۆ مانگ و ڕ و ژ، خوا كو ڕێكی بۆ بەخێوكردنێ ناردیە لای دایە
هەر بووەی كەسیش فكری نەكردبێ كاری ئەسمەریان ڕێی بۆنەبر د بێ
ماینی شی خەزاڵیش پاش ساڵەوەختێك هەرچاوەڕوان بون بۆجانوئەسپێك
وەختی دو ساڵ بو دەگەڵ سوڵتانی وەختی گەیبوێە خۆشی دەیزانی
پاشی دو ساڵان ئەو مام هەیاسە چۆ لای ئەسمەرێ بزانی چ باسە

## هەیاس چۆ ماڵە خاڵ بارامی بو لای ئەسمەرێ

ئەسمەر كە زانی بەپێرێوە هات پێیڕاگەیاند ورد هەمو كارەسات
ئەوەت جانو ئەسپ، جوان لیێبڕوانە لە تاژیەكانیش كێ هەت پێ جوانە
ئەوەت ئەوانە بچینە ژور فەرمو كوڕپیی هەڵگرتبو دەهات و دەچو
كوڕەكەش ئەوەتا جوان جوان تێیفكرە هەموان یەك بە یەك تەحویل وەربگرە
وا یان تێفكری هێند ورد بە جوانی بەرماڵەكەشی كرد بە شانانی
لێیان ڕازی بو، هەروەك خواستی خۆی سواربو كوڕەكەشی، دانا لە پێش خۆی
تاژی ڕەستەكراو جانوش یەخترمە كەوتنەڕێ هەروا بە قورە و پڕمە

هاتنـەوەی هەیاسـیان ڕاگـەیاند بـە شـا     دیوانـی هــەموی هاتنــە تەماشــا
تـازە یــەك یەكــە زانیــان ئــەو باسـە     هـەر ئافـەرینبو بـۆ ئــەو مـام هەیاسـە
جا سـوڵتان مـەحمود دەگـەڵ مام هـەیاس     پاش ئەحواڵپرسـی و کـەمێك قسـە و بـاس
تـێ فکری و گوتـی لـەم عەسـر و دەورە     وەك تــۆ ئینســانێك زانــابێ و گـــەورە
مـن بـەدی ناكــەم بـیرم بـو نــاكرێ     لـەو زەمانــە كـێ وەك تـوی پێدەكـرێ
دو ساڵ لـەوەی پێش،چم پی ئەسپاردوی؟     هـەتا وەخـتی خـۆێ هـەر خـۆم لێبـواردوی
ئیســـتا ڕێــك و پێــك حــازر كــراون     لــە كــاتی خۆێــان هـــەموت هێنــاون
زۆر هێدی و شیرن، لـە كورەكـەی ڕوانـی     هێنـدە جـوان دەیـدا شـبی ســولتانی
جــانوت بــەرەڵلا كردبــا نێــو ڕەوە     هیچكـە س نـەبو بلـێ كـێ هـەیان هـەوە
تاژیــان بــەردا بـو هــەر گەییشـــتەوە     دوا یــە ش كــەس نــەبوبی ناســێتەوە
بەرماڵــەكەشی جــوان حــاڵی كــردن     پێـك هــاتبو ڕیسـی لــە شـانە كـردن
سـەد جار لـە عـەمر و چاوی منـت كـەوێ     ئــەمن ســاحێبی ئەوانــــەم دەوێ
هـەیاس كـاری خـۆی كـە تـەواو كردبـو     خـۆ ئێمــە قسـێكی وامــان نــەكردبو
جەفـەنگیان لێدا، قسـەی خــۆش كــرا     ئــاخـریكـەی ئـاوابـرپیـار ی بــۆدرا
دەتدەمـێ ئـەویش چۆنـی پێـم خۆشـە     دەیزانـی سـولتان بـۆی ز ۆ ر لــەجۆشە
دەڵـێ چـی ئـەمن لــە تـۆم ویسـتوە     شـتێك تـا ئـەورو كــەس نەیبیســتوە
وەخـت و كـاتی خـۆی حازرت كرد هێنـات     لــەوەی گــەورەتر نــابینم خــەلات
ئـەوەش هـەر كـاری خۆتـە هـەر بۆخـۆت     دەگەڕێتــەوە خــۆ هــەر بــۆ لای خــۆت
ئەسمـەری هێنـا لـە شـای مـارە كــرد     بـە ڕای هـەردوكیان جـل و بــەرگی كـرد
بـە هیچكـەس بارگـە حیسـاب نـەدەكرا     بـە قـەتتار وشـتر دە ڕێگایـە كــرا
وەك لـەشكر دە جمـی خۆیـان تێك بـەزاند     ســوارە هاتنــەوە و بوكیــان دابــەزاند

سـوارەبلاوبون کـە چـوڵ بـو دیـوان وا خاترجـەم بـو نـەیماون میـوان
چـو بـۆ لای بوکـێ، دیـتی و ناسـیەوە کـەم مـابو شـێت بـێ، لێکیـان بانیـەوە
بوشـی بـەیان کـرد چـەندە پەرۆشـی پاشـی ئـەو شـەوەی نـەیدیبو خۆشـی
سولتان مەشغوڵ بـو، ئـەو بە عـەدڵ و داد خـاتون ئـە سمـەریش بـە شـا بـو دڵشـاد
ئێمـەی بێکـاریش لـەبەر زۆر گـەڕێ سـەگ نـەبو بوێـری تـا پێمـان بـوەڕێ
ڕەحمـەت لـەو کەسـەی بـۆی گێڕاومـەوە بـۆ زیندوکردنیـان هـانی داومـەوە



### ماسی دێمەی

مـام وەیسـە پیـاوێکی زۆرفـەقیرو مسـوڵمان و.بۆنوێژانیـش بـێ وێنـەبوپاش هـەمونوێژان دەپاڕاوە خودایە عەفومکەی.لێم خۆشبی،لە ئاهی دایك وبابی خۆم ڕزگارم کەی یـاڕەببی خودایە، لە زەللەی شەیتانم بەدورکەی،ڕزقم زیادکەی،ئاوادەپاڕاوە؛

خێزانیشـی وەکوخـۆی بـوو بۆپاڕانـەو بۆنوێـژا ن ئەمماهـەموجارێ بـەمام وەیسـەی دەگوت بڵێ خودایەلەمەکری ژنانم بەدورکەی.مام وەیسەش هەرهەموجاران پێی دەیگوت دەبێ‌دەنگ بەپیاو،ژن چن ومەکریان چ بیت.ئاوا ماوە،

ڕۆژێکی خانمێ مام وەیسەی ناردی لە چۆمـی دە پـازدە ماسیان بۆگـرت هەربەئـەو کابرایەی کە ماسیەکانی بۆگرتبون، ماسیەکانی ناردنە ئەو جێگایـەی ئەگـەر مـام وەیسـە جوتی لێدەکرد، ژنە پێیگوت ماسیەکان دە خەتی جوتی نێ وەرە،

کابراش چو ماسیەکانی دە خەتی جووتی دەپێش گاسنی نان و گەڕا وە بۆ ماڵێ.

سبحەینێ مام وەیسەچۆ مەزرایەو بەبێ فکر بسم الله.ودەستی بەجووت کردنی کرد، دەگـەڵ ئـەوەڵ خـەتی جووتـی ماسـی وەدەرکـەوتن، مـام وەیسـە گوتـی ئەوەچەیـە

خودایەعەجایب ما ئەوجار هێنای بەبێدەنگی ماسیەکانی دەتورەکەی نان و گەڕا وە بۆ ماڵێ، خێزانی زانی نەخشەکەی گرتویەتی پێی سەیربوومام وەیسە وا زوو گەڕاوەتە وە، کەئەننەهو ئاگام لە هیچ نیە.چۆوپێش مام وەیسەی و: پیارێزگە ئەوەبۆ.وازو هاتیەوە خۆشوکرهیچ نەبوە،مام وەیسەدەڵێ گەوەر ماسیم هێناونەتەوە!..

گەوەر:ماسی؟!ماسی چی؟ئەتۆ چوبویە جوتی ماسیت لەکوێ هێناونەتەوە؟!

مام وەیسە:خودا ناردویەتی، بیخۆ فەقیر، دە خەتی جووتیدابون!

گەوەر دەڵێ دەنگێ مەکەئەوەرزقێکی زیادیە، خودا ناردویەتی باکەس نەزانێ بۆشەوێ سازیان دەکەم؟ئەتۆش کێت پێخۆشە بانگیکە!

گەوەر هەرئەو وەوختی ماسیەکانی بەخشین وبۆ شەویش هیچی لێنەنا. مام وەیسەش بێخەبەر لەکاری خێزانی، دوای نوێژی شێوان دەگەڕا وە بۆماڵێ دو کەس لە ڕەفیقەکانی خۆی کەجیرانیشی بون، دەگەڵە خۆی هینانەوە ماڵێ:ئەوشو شتێکی خۆشن هەیە دەچین هەم برێك سەیرو سۆحبەتێ دەکەین و هەم نان و چێشتێکی خۆشیش دەخوێن.

مام وەیسە لەگەڵ میوانەکانی گەییشتنەوە ماڵێ، خێزانی بەخێرهاتنی کردن و چایەکی بۆدانان دوایە بانگی مام وەیسەی کردو.

:ئەرێ وەیسە ئەگەر میوانت دەگەڵ خۆت دێنانەوەبۆدەنگت نەدەکرد شتێکم لێنابا!

مام وەیسە:چۆن؟! ناکا ماسیەکانت سازنەکردبن؟!

گەوەر:ماسی چی؟! مام وەیسە:ئەیجا چۆن ماسی چی؟!

گەوەر:باشە ماسین لەکوێبوون؟ ئەتۆ هێناوتن؟! ئەتۆ چوبویە جووتی، نەچوبویە ڕاوەماسێە خۆلە تۆش بەدەر کەسمان نیە بچێتە ڕا وێ.

مام وەیسە:ئەدی ئەو هەموە ماسیەم لە جووتیڕا نەهێنابووە؟!

گەوەر:چاکەلەکوێی جووتیت ڕا هێنابونەوە؟!

گەوەر بۆیە ئاوا وردلێی دەپرسی هەتا چاك توشی هەڵەی بکات وبەهیچ

پینەوپەڕۆیەك بوی چاك نەكرێ تەوە ؟

مام وەیسە:كچێ! ئەدی دەخەتی جووتی‌دا چەندم ماسی دیتبونەوەو هێنابومنەوە!

گەوەر:ئایارو!خەتی جووتی و ماسی؟! میوانەكانی مام وەیسەی كە هەر جغارەیان دەكێشاو چایان دەخواردەوە بە بیستنی ئەو قسانە عەجایب مان.خۆبەخۆ پێكێیان دەگوت و پێدەكەنین:خەتی جووتی و ماسی؟!

مام وەیسەئەوە قومارمان پێ دەكادەناپورگەوەڕاست دەكا ئاخەخەتی جوتی وماسی مام وەیسە ش زۆر تێلچوبو لەلایەكی خێزانی هیچی لێنەنابو بیخۆن بەتایبەتی لەبەر میوا نەكان لە لای د یكەوە پیێ بە هەڵەی خوی بردبو:ڕا ست دەكەن ئاخر خەتی جوتی و ماسی؟!بەلأم نەیدەویست وەسەرخۆی بێنیت. میوانەكانی مام وەیسەی ئەوانیش نەیان‌دەویست مام وەیسەی لە كن خێزانی بشكێنن وگەوەریش دەست بەردار نەبو:تۆ خودا مام گولاوی! مام وەسمان ئەوەعومرێكوڕابوارد قەت زانیوتانە ماسی دە خەتی جوتی‌دا بێت؟!

مام وەسمان و مام گولاویش دەیان گوت ناوەڵلا خوشكە گەوەر، ماسی هەردەنێو ئاوێ‌دادەبی دەئیشكاییەداناژی!

بەڵێ كێشەی مام وەیسەوگەوەرێ توندبو:ئایارۆ! وەیسە شێتبوە! وەیسە شێتبوە!مام وەیسەش لەحەیفان دەیگوڕاند، میوانەكانیش هەرچەند بەگەوەری خێزانی مام وەیسەیان دەگوت، بێ‌فایدەبو، ئاخیری بەئەوشەوەی تەواوی خەڵكی دێیان لێخڕبووە، گەوەر:بۆ خاتری خودای عالەمینە، وەیسەی بگرن شێتبۆوە، بیبەنە ماڵە شێخی خەڵكەكەش بێ ئەوەی بزانن چباسە، مام وەیسەیان گرت ڕەپێچەك داو دەستیان لە پشتەوەڕابەستن و بردێان بۆ ماڵە شێخی، لە ڕێگایەدا هەرچەندی دەیگوت بابم! ئەمن شێت نەبومە ئاخر بۆكوێم دەبەن هەرد وكانیش ڕاستیان دەكرد؟! بەلأم گوێیان نەدا بەقسەی مام وەیسەی بەدبەخت. لە ماڵە شێخی مام وەیسەیان وەبەر شولكان‌دا:هەر دەیگوت ماسیم دە خەتی جووتی‌دا گرتوون!ئاخرەكەی خێزانی چۆ بن گوێی و پێی‌گوت

ئەگەردەمگوت بڵێ خودایە لە مەکری ژنانم بەدورکەی ئەوەیە !

ئێستاش ئەگەروا بڵێی ڕزگاردەبی دەنا هەر دەوحاڵەی‌دا دەبی کە دەیبینی.

مام وەیسەکەزۆری زەجر ی دیتبوو ناڕەحەتیان کردبوو، پێی‌خۆش‌بولەئەو وەزعەی نەجاتی بێت، بەخێزانی دەڵێت باشەچ‌بکەم؟

خێزانی :بڵێ ئەمن ماسیم دە خەتی جووتی‌دانەدیتونەوە.

بەڵێ مام شێخ دێتە سەری دەڵێ پێم‌بڵێ بزانم.مام وەیسە دەڵێ چت پێ‌بڵێم مام شێخ بەتوڕەیی؟پێم‌بڵێ بزانم نێویان چیە؟

مام وەیسە:نێوی چی وحیسابی چی؟! ئەمن هەرسۆحبەتم دەگەڵ گەوەرێ دەکرد، دەنا هەموکەس دەزانیت ماسی دەنێو ئاوی‌دا دەبێ دە ئیشکایەدا ناژیت مام شێخ دەڵێ زۆر چاکە. بانگی خێزانی مام وەیسەی دەکات:وەرە پور گەوەر. پور گەوەر دێت و پیی‌دەڵێ مام وەیسە دەڵێ ئەمن سۆحبەتم دەگەڵ گەوەری کردوە دەنا هەموکەس دەزانیت ماسی هەردەنێو ئاوی‌دا دەبێت و دە ئیشکایی‌دا ماسی ناژیت. وەرە دەستانی بکەوەو بیبەوەبۆ ماڵێ خوواحافیزو بێت.

مام وەیسە دەگەڵ پور گەوەرێ هاتنەوە ماڵێ؟ لەئەو ڕۆژەی بەد وا وە مام وەیسە ئەگەرنوێژی دەکرد دەپێش دوعاخوێندنی‌دا دەیگوت:خودایە لەمەکری ژنانم بەدورکەی.

جا دوایە دوعاکانی دیکەی پاش نوێژیی دەخوێندن.



## قۆناغ گێتماغ

موحەمەد، ئیسماعیلی ناھارا قوناغ چاغرمیشتی. ئیسماعیل ناھار یاخنی یوڵە توشتی موحەمەدن ئێونەگێتسن،حوسێنە ڕاست گێالدی حوسێن دێدی ھا! ئیسماعیل ھارادی؟ ئیساعیل :موحەمەدن ئێونە گێدرم ناھارا قوناغ چاغرب.حوسێن :مەندا گێالرم، ئیسماعیل دێدی یاخچی.سەن نەکارەسن؟حوسێن مەن نەکارەیەم؟ مەن توفەیلیەم. باھم گێتیلار بویوڵ قوربانە ڕاست گێالدیلار. قوربان دیدی ھا! ئیسماعیل حوسێننان ھارا گێدرسس؟ ئیسماعیل:موحەمەدمەنی چاغرب، حوسێندا دیر مندا توفەیلیەم گێالرم. ئۆندا قوربان دێدی وەڵلا مەندا گێالرم! ئیسماعیل دێدی یاخچی، مەن قوناغم حوسێن توفەیلیدی سەن نەکارەسن؟

قوربان:مەندا توفەیلینن توفەیلیسیەم بالی، توشتیلار یوڵە.موحسین کوچە باشندا چخدی دیرھائیسماعیل ھاراگێدرسز؟

ئیسماعیل دێدی موحەمەدمەنی قوناغ چاغرب بولاردا ،ئوڵوب لارسەلیم جوھەری دۆڵپاسی،حوسێن دێرمەن توفەیلیەم گێالرم!قوربان دیرمەن توفەیلن توفەیلیسیەم گێالرم.موحسین دێدی مەنداگێالرم.ئیسماعیل دیدی یاخقی سەن نەمەنەسەن؟

موحسین دیراومەنی تانیر،بالی دویرت نەفری گێتیلارموحەمەدن ئێونە:سەلام سەلام سەلام سەلام؟

موحەمەد،بیرازباخدی سۆرەئیسماعیلەدێدی:مەن سەنی قوناغ چاغرمیشم،بولارنەمەنادی ـ لار! حوسێن دێرمەن توفەیلیەم.موحەمەد:یاخچی بوسەن.قوربان:مەن داتوفەیلینن توفەیلیسیەم.موحەمەد.دێدی قوناغ سەن چۆخ خۆشگێالبسن.توفەیلی سەنداخۆش گێالبسن.توفەیلینن توفەیلیسی سندائێلەچۆخ خۆش گێالبسەن، بوکپیئوغڵی نەکارا دی؟

موحسین یوڵداشلارە باخدی:دێمادم او مەنی تانیر؟



## بیرەوەرێك لەسەرعەشیرەتی شێخ شەرەفیان لەڕوانگەی گەورە پیاوانی زاناو بەتەمەنەوە

(( شێخ شەرەف)) لەئەوەڵەوە تائیفەیکی زۆرگەورەو زاناوبەکاربونەو لەچەنددییەکی عێراقیٚ دا ژیاون بەلاٚم بەشی زۆریان لەکوردوستانیٚ ئێرانیٚ وەکو١-کەوتەر٢- سەرمساغلیٚ ٣- حەسەن چەپ ٤- سێلمیٚ ٥- باگردان ٦- لیمونج ٧- بێنگوین ٨- شێخان ٩- دۆولی شێخان ١٠- سێرویٚ ١١- قەلاتیٚ سنسان ١٢- سەرهولاٚن١٣- سەرتەنگ ١٤-نێلاٚن ١٥- چۆمان لەڕۆژ ئاوای سابلاٚغیٚ ودێیەکانی

١- لگبن ٢- کێلیٚ ٣- بابەکرا وێ ٤- کانی زەرد ٥- ئەحمەدغەریب٦-شێوەبرسی٧- بازاڕگە ٨ - دێلکە٩- هەوشینان ١٠- کوری١١- وکەڵەکوکەکان لەمەنتیقەی خانیٚ هەمومولکی شێخ شەرەفیان بوە(حاجی بایزبابی مەحودا ئاغی شێخ شەرەف )گەورەو.وردێن سپی تەواوی ئەوتایفەی بوەلەگەلٚ چەندکەسی عالم وروناکبیروبەدین سەرپەرەستی تائیفەی شێخ شەرەفیانیان وەستوی خۆگرتبو؟وبەهوی ڕێنوێنی گەورەگەورەکانیان لەکێشەوهەراله- گەلٚ جیرانەکان هەمیشەخۆیان پاراستوەلەپاش ئەوەی کەحاجی بایزلەدونیادەرچوە چونکەشێخ شەرەف هەردەهات ودەستیان ئەستوردەبولەئەودەورەولەدەورەکانی پێشوش حکومەتی ناوەندی دایمەلەسەربزێوی عەشیرەتەکان ترسی هەرهەبوەوکەمتریش وابوەڕاستەوخۆبەگژیان داچوبی هەربەفێلٚ وتەڵەکەلاوازی کردون،وبۆهێندێك لەتایفەکان بیٚ بەڵگە،دەهۆیٚ بۆسازدەکردن،ئێکێك لەوانە،وبەئەوهۆیەوەحاکمی مەراغەی ئەو،وەختی کیٚ بوە،کاغەزێکی بۆشێخ شەرەفیان دەنوسی وبەپیاوێکی خویٚ دابۆیان دەنێریٚ :ئەگەرکەیخوداکانوهەروەهاگەورەپیاوەکانوبێن بۆمەراغەی هەتابۆخۆم هەم ملکەکانوبۆ- سەبت کەم وقەباڵەی سەبتیووهەرکەسەوبەنێوی خۆوبدەمیٚ؟گەورەگەورەکانی شێخ شەرەفیان بەبیٚ بیرکردنەوە فریوی حاکم مەراغەی دەخۆن و تێگڕاگەورەپیاوەکان وکەیخوداکان دەچن بۆمەراغەی چونکەهیچ بیروفکری خەراپیان دەژبەحکومەتی نەبوە. حاکمی مەراغەی بەپێچەوانەهەستی پاك وبیٚ خەوشی ئەوتائیفەی وبەبیرکردن وفکری

ناپاکی خۆی هەموانیان دەست بەسەردەکاو.ودەیان نێرێتەخۆراسانی ولەشارۆچکێکی داین دەمەزرێنی شارەکەیان نێوناوە(کوردان) ودوایەبەمرورگۆڕاوەو هەروەکی دەڵێن بۆتەئەو(گورگانەی)کەئیستادەیبینین؟

وەختێکی پیاوەبەکارەکانی شێخ شەرەفیان ئاوادوردەخرێنەوەو.ژن ومنداڵەکانیشیان لەبەربێ کەسی وبێ سەرپەرستیێ هێندێکیان دەچن بۆلای پیاوەکانیان ئەوانەدیکەش پەرپوەی هەندەران دەبن ودییەکانیان هەتاچەندسالان بەچۆلی دەمێننەوەو، جامەنگوڕومامەش لەسەرمولکی شێخ شەرەفیان بەدمەقالێ هاتون وقڕڕەیان لێ پەیدابوە دوایەپێك دەڵێن ئەومولکەنەمولکی مەنگوڕانەونەمولکی مامەشانەجادوای ئەوچەندساڵەی هێندێك ماڵ لەشێخ شەرەفیان ئەوی دیکەش هەتاجێگایان بۆتەوەهەم لەدیوی مەنگوڕان هەم لەدیوی مامەشان غەیری تێ خزاون هەروەکوئیستاکەدەبیندرێ؟

بەسەرهات وئاڵ وگۆڕی کەبەسەرشێخ شەرەفیان هاتوەدڵۆپێك لەدەریایەکیەوئەوە نمونەیەکە،بۆ وەبیرهێنانەوەی؟هەرکەسێکی بەڵگەی هەبیت دەتوانی بەپێی بەڵگەباسی زیاتری لەسەربکات وزۆرتریشی سوپاس دەکەین.

حەمەدئاغاپاشی کۆچی دوایی مەحموداغای بابی زیاترلەدێبۆکری دەمێنێتەوە (بەردەبۆری د ێبۆکری)کەنیشانگەی حیسابگەریەکانی حەمەداغای بوەهەرماوە.

پاشی دێبۆکری ماڵی هاتۆتە دێلکەوهەوشینان وئاخرەکەی هاتۆتەلگبنێ حەمەدئاغای شێخ شەرەفی ئەوچەند ساڵەی ئەگەرلەلگبنێ دەمێنێتەوە هەروەکو لەنێوبانگی ڕادیارەپیاوێکی بەئازمون ولەحیسابگەریدا ئینسانیکی زۆر زاناو ماهیر بوە، ئێستاش کە ئێستایە حیسابی حەمەدئاغای شێخ شەرەفی هەرماوەو زۆرکەس کارەکانی بە حیسابی حەمەدئاغای ئەنجام دەدات. دیارە ئەوحیسابە دەگەڵ حیسابی شەمسی پێنج ڕۆژی فەرقە یانی لەپێشترە.ئەگەرمانگی ئاخیری زستانی واتاڕەشەممە سی ڕۆژ تەواوبێت بەحیسابی حەمەدئاغای شەوی بیست و شەشی ڕەشەممەیە،نەورۆزە، ئەگەر ڕەشەممە، بیست ونۆڕۆژ بیت شەوی بیست وپێنجی ڕەشەممەیە نەوروزە.

ئەوجارلەوڵاتەکوێستان وبەفراویٚ کەی مە،ئەگەرلەدوازدەی ڕەشەممەیە،دەلوجەی،بای وەعدەی دێت دەگەڵ دەلوجەی بای وەعدەی ئەگەرکرێوەوساخڵەت نەبێت لەگ لەگ لە گەرمێنیٚ ڕادەگەڕێتەوە.لەپازدەی ڕەشەممەیەحەقەبای دێت لە هەژدەیڕابەفر بە هەمو بایەکی دەچێتەوە. حیاسبەکانی ئاخری ساڵیٚ لە ئەووەڵیٚ مانگی ڕەشەممەیەڕا ئاوا حیساب دەکرین ١ـ لە ئەووەڵی ڕەشەممەیەڕا هەتا سیٚ ڕۆژان خاتو زەمهەریر شینی بوٚ برایان گێڕا وە.چونکەبرایەکانی دەئەو سیٚ ڕۆژانەدالەکوێستانان سەرمابردوونی، هەوای زۆر ناخۆشەوکرێوەی دەکات.لەدوای وی سیٚ شەشی هەیاسی حیساب دەکریٚ کە شەش ڕۆژەی ئەووەڵیٚ هەوای زۆرناخۆشە،شەش ڕۆژەی دوهەمی ناخۆش وخۆشە،شەش ڕۆژەی ئاخری تائەندازەیەك خۆشە،سیٚ شەش دەکاتەهەژدەوئەویش سیٚ دەکاتە بیست ویەك.

**بیست و یەکەڵەی گۆرانی**

بیست ویەکەڵەی گۆرانی،ئەگەرنەباری لەقوڵتەی ڕانی٠،گۆران هیچ لەهیچ نازانی

هەرلەئاخیرمانگی زستانیٚ خەلوٚ تفاقی لی ّبڕاوەوجەلوٚش تفاقی فرۆشتنیٚ هەبوە،پێك هاتونەباقەیٚ بەمەڕێکی بداتیٚ،جەلوٚدەڵیٚ ئەگەرباقەوێنجە لەمەڕەکەی درێژتر بێت،باقەکەی دەبڕمەوەبابەقەدمەڕەکەی بێت زیادییەکەت نادەمیٚ.

**خەرنەبەرەی پیرێژنی:** پیرێژن لەمانگی ڕەشەممەیدا کوڕەکەی دەچێتە سەفەریٚ، بە کوڕەکەیٚ دەڵیٚ ڕۆڵەخەریٚ مەبەرە ! کوڕەکە:خەریٚ دەبەرم. دایکەکەی:ئەگەر خەریٚ دەبەری کورتانی مەبەرەکوڕە دەڵیٚ خەرێش دەبەرم، کورتانیش دەبەرم.کوڕە چوٚ سەفەریٚ، کەرەکەی دەبەفریٚداسەرمابردی وتۆپی، کورتانەکەشی لەویٚ بەجیٚما.

**وشتریٚ پیرێژنیٚ** ؟ وشتریٚ پیرێژنیٚ بەسەرماوکرێوەوەکەل ّهاتوە.

**هێلکەی لەگلەگی:** هێلکەی لەگ لەگی ئەگەرسەهول ّوسەرمانەیبەستی نابێتە جوجکە بابوٚشەوێك یا ڕوٚژێکیش بێت ؟

**کابوٚ بوٚزی بای بە گواران** ؟هەرلەڕەشەممەیەژنێك برای لیٚ میوان دەبیت، بوٚ بارگینی براکەی تفاقیان نابیت، وەنێو دییٚ دەکەوێت دەڵیٚ حازرم گوٚارەی زێڕی خوٚم بوٚ بارگێنی

کاکم بە تفاق بدەم؟بەلاّم تفاق هێندە گران دەبێت، بە گوارەی زێڕیش بەشی جەمێکی پێی ناکڕێت ، شەویَ دەنون، بەیانی کە وەخەبەرد یَن، بای وەعدەی دێت وبەفری شەقارشەقارکردوەو بن داران وەدەرکەووتوە، هەر جومەی ئاشگێڕێکی ئاو پێداد یَت.

کا، بۆ بۆزی یای بە گواران٠ ؟ گو بە گوۆڕی بابی کا و کاد یَنداران٠

ئەوە خودا ڕوحمی کرد، وەدەرکەوت بنی داران٠

**خاکەلێوە٠** ؟ئادار ناچی بیَ دوَ *** نیسان ناچی بیَ جوَ٠

د یسان دەلێن مانگی ئاداریَ٠؟بباریَ لە گوییَ داریَ *** نامێنی تا ئێواریَ

**دە شەوەی شـوقـاقـیَ**:دە ڕۆژ پـاش نـەوروزی، دە شـەوەی شـوقاقی پیَدەلێـن، دەئەو ڕۆژەیداشوقاق تفاقیان لیَ براوەولێیانقەوماوە،مەڕومالاَتیان هەمو قڕانی کردوە.

**سێزدەبەدەر**:سێزدە ڕۆژ پاش نەوروزیَ یە.

**گیسکی بەلـەمس** ؟گیسکی بەلەمس گوڵی ڕێواسیَ دەخوات و دەلیَ:

خواردم گوڵی نیسانیَ *** ڕیام لـەویَ زستانیَ؟ زستانیش دەلیَ

ڕۆژێکم مابی لە کاردا *** لاقت دەکەم بە داردا٠

بەفرێکی زۆردەباریت، گیسکی بەلـەمس سەرمادەیبات ولاقی بە دارێوە هەلّدا وەسرێت؟

وەکی لەگەورەپیاوانی بەتەمەن وڕوناکبیرانی باوەڕپێکراوم گوی لیَ بوەگوتویانەلـە لەزەمانی حەمەداغای شێخ شەرفی دا.لە لگبنیَ جێالەخەمەداغای حیسابگەرێکی دیکەشـی لیَبوەودەلێن ئەویش هەرنێوی حەمەداغابوەو یان هـەرنێویَکی هـەی بـوە؟شەویَ لەسـەر هاتنـەوەیَ لـەگ لـەگیَ لـە مزگـەوتیَ گرێویـان کـردوە حیسـابگەرەکەی دیکـەدەلیَ ئەوشولـەگ لـەگ دێتەوەحەمەداغای شـێخ شـەرەف دەلیَ ئەوشـوناگەڕێتەوە،گریوەکـەی ئاوادەکەن هەرکەس دوڕاندی،کچەکەی بدات بە کـوڕی ئـەوی دیکـە،خـەلّك بلاّوەیدەکـات ئەوحیسـاب گەرەئەگـەر.دەمـەوای دەفکری، زۆر نـاخۆش و سـەرما دەبـیَ و پروشـەی دەکات،دێتەوەمالیَ وبـەکوڕەکانی دەلـیَ، گرێویَکـم دەگـەلّ حەمـەدئاغای کـردوە وبەئـەو هەوایەی دەی بینم دوڕاندومە، کوڕەکانی لێیدەپرسن چ گرێوێکت کردوە ؟

دەڵێ لەسەرلەگ لەگی ؟گوتومەئەوشولەگ لەگ دێتەوەبەلاّم لەبەرەرۆژمی سەرمایەناگاتەوە ئێرە لەئاوەڵی ئەحمەدئاوی (کانی کۆخەی) دەمێنێتەوەجا ئەگەربتوانن بچن بیگرن وبیەێننەوەئەوەچاکە دەناخوشکودۆڕا وّە،بەڵێ کورەکانی دەچن لەئاوەڵی ئەحمەدئاوێ حاجی‌لەگ لەگ کەسیرەدەبێت وناتوانی هەڵفڕێ دەیگرن و دەیەێننەوە، لەبن کورسێ گەرمی دەکەنەوە بەێنی شەو.ورۆژان لەسەرقەلاّغێی دادەنێن (حەمەدئاغای شێخ شەرەف)کەهەڵدەستی بچێتە نوێژێ بەیانی حاجی لەگ لەگی لەسەرقەلاّغێ دەبینی و دەزانێت حاجی لەگ لەگ بۆخۆی نەهاتۆتەوەوبەدەست هاتۆتەوەئەگەرتەقەی لەدندوکێ دینێ وحەمەداغا.دەڵێ بەخێرێیەوە!بەخێرێیەوەئەگەرچی بەلاقی خۆشت نەهاتویەتەوە، بەیانی ئەگەرقسەبلاّو دەبێتەوەودەڵێن حەمەدئاغای شێخ شەرەف گرێوی دۆڕاندوە، بەئەوحیسابگەرەیی،حەمەداغا دەڵێ:ئەگەر ئەتۆحازربی سوێندێ بخۆی وبڵێی حاجی لەگ لەگ بۆخۆی هاتۆتەوّەلەباتی کچێکی دوکچانت دەدەمێ ئەومام حیسابگەرەش کەناتوانێ سوێندی بخوا،ئینسانی واگەورەدرۆیەناکاو سوێندیشی لەسەربخوا،کارەکەیان پێك دێ بە ژنبەژنە؛؟ ژنبەژنەیان کردوە، هەمو خەڵکی لاجان و پیران شاهیدی ئەوموزوعەنەو، ئاگادارن بەتایبەتی ئەوانەی بڕوکێك بەتەمەنن.

بەعزەکەسێك دەڵێن لە (دایەشێخڕا )لەگ لەگ یان هیناوەتەوەبەلاّم ڕنگ بی (ئەحمەداوێ)ڕاست بی چونکەدایەشێخی لەلگبنێ ڕازۆردورە٠؟!

هاوینێ وەختی درووینەی حەمەدئاغای شێخ شەرەف دەچێتە گەنەدارێ مامەشان، وەختێکی دەچێتەسەرحەوزی دەست نوێژی هەلگرێت،دەست دەئاوەکەی هەڵدەدات، ودیتەوەنێودیێ بەخەڵکی ئاوائی ڕادەگەیەنیت و:بچون پالەی مەزرایە بێننەوەباران دەباریت،بەقای پیّناکەن،نیوسەعاتێك پێوەدەخورێ،پەڵەهەورێکی ڕەش دیتە ڕوی ئاسمانێ ودای‌دەداتەبارانەی سێڵاّوهەستاوەیەغنیەگەنمی بەساغی بەخڕێ کەندە قولانّدا هێناوەتەخوارێ.خەڵکی ناوچەی ئەوانەی ماون ئەوسێڵاّوەیان لەزاری باب ومام یابرا گەورەکانیان بیستووە.بەتایبەتی خەڵکی گەنەدار، بەرکەمران وخڕێ بەرداشان.

## قاژو، ڕێوی، قشقەڵە

قاژوێك کوتە بـەزێکی دیتـەوە، قشقەڵە بـەغار هەڵیگرتـەوە، لـە سـەر ئـەو بـەزەی بەشەڕهاتن، بەچەنگ و دندوکان لێکیـان‌دەدا، مـام ڕێوی، چاوی‌پی‌کـەوتن:ئەوەچیـە،بـۆ وادەکەن؟ ملکی بابو بەشردەکەن؟ قاژو وەجواب هات:چابو هاتی مـام ڕێوی، ئـەمن ئـەو بـــەزەم د یتۆتـــەوەو قشـــقەڵە هەڵیگرتۆتـــەوە ؟ وێم‌ناداتـــەوە، قشـــقەڵە قـــاژوی وەدرۆخستەوەوگوتی نـەخێربۆخۆم هەڵمگرتۆتـەوە.ئەتۆهەرنەشت دیوەمـام ڕێوی زۆری ئیشتیاچوبەزەکەی، لـەبەرەخۆیەوە گوتی؟ واچاکە فێلێکی سـازکـەم و بۆخـۆم بەزەکـەی بخۆم ئەوانە لەبەرشەڕوهەلآیەپێیان ناخورێ پیی‌گوتن ئـەو هەڵلایـەی نـاوێ وازی‌لی‌بێنـن؟ بەلآم قاژو دەست هەڵگرنەبوو قشقەڵـەش نـەیدەدا وە، ئـەوجارمام ڕێوی بـە خـۆی گـوت نەخشەکەم گرتی. ڕوی تی‌کردن پێی گوتن ئەمن ڕێگایەکو بۆ دادەنێم ئێـوەش وەرن بـە قسەێ من بکەن باهەڵلآ خەلاس بێ. چونکە ئەمن بە دلٚ بە شەڕی ئێوە ناڕەحەتم.

قاژوو قشـقەڵە ئەگـەر مـام ڕێویـان ئـەوا بـە دڵسۆزی دیت، قـەولیان‌دا لـە قسـەی دەرنـەچن و چۆنـی مـام ڕێـوی بۆیـان دانـێ ڕازی بن.مـام ڕێـوی دەڵـێ بـەڵێ، زۆرچاکـە تەرازوێکی پەیداکەن هەتا ئەمن لێوبەش‌کەم وهەر یەکەی نیوەی بخۆن، هەردو ڕازی بـون وبەزەحمەتێکی زۆرتەرازویان هێناولەپێش مام ڕێویان دانا،گوتیـان؟ئەوەتـەرازوو ئـەوەش بەزەکـە. مـام ڕێـوی ڕۆی بۆیـە بەزەکـەی، لـەت کـرد، بـەلآم وای لـەت کـرد، لـەتێك گەورەتربێ، لە پـێش چـاوی وان، دە بەرتـەرازوی نـا.لـەتێك قورس‌تربوبڕێکـی دم ولـوت لستەوەقەپالتێکی لە لـەتە گەورەکەی دا ئـەوجار ئـەوی دی قورس‌تـر بـو، قـەپالێکی لـە لـەتە قورسەکەی دا، ئەوجار لـەتەکەی دی قورستر بو، بە قەپالتان هەموجارێ لـە لـەتە گەورەکـەی دەدا، هـەتا وای‌لی هـات هـەر لـەتەی بـە قـەد مەرمـەرە شوشـێکی چوکـە مابونەوە،هەردوکی بەدوی یەك دا هاویشتە زاری و ڕوی دە قشقەڵەو قـاژوی کـردو گوتـی وەڵلآ هێندە چوك بیوونەوە بۆبەش‌کردنێ نەدەبون. خولاسە بەمەکرو حیلـەو دۆستایەتی بەزەکەی لی‌خواردن.

## ( شێعری ) قاژو، ڕێوی، قشقەڵە

قاژویەك، بەزێكی لە ڕێ دیتەوە
قشقەڵەش بە تاو هەڵیگرتەوە
لە سەر ئەو بەزە بو بە هەڵلاو جەنگ
وا لێکیان دەدا بە دندوك و چەنگ
قاژوکە دەیگوت، هەر لێتدەستێنم
لەسەرئەو بەزەی من دەت فەوتێنم
قشقەڵەش دەیگوت چێژی لێناکەی
ئەگەر دە ڕۆژیش بەدوام دا ڕاکەی
ڕێوی پەیدابو، ئەو شەڕەی کە دی
تورەبو.وگوتی هۆی نەدی وبەدی
مام ڕێوی بە زی دی ئیشتیای چو بە
بە خۆ ی گو ت فێلێك ساز کەم هەربۆیە
هەی نەزانیتە، بوچی وا دەکەن؟
میراتی بابو هاتون بەشدەکەن؟
قاژو:ئەوبەزە،من دیتومەوە
قشقەڵە ش دەیگوت،من گرتۆمەوە
هێن تێك چوم ئەبەو،شەڕو هەلایە
هۆشم لێ بڕاوەو،ئەبەۆخولایە
بۆودادەنێم من،ڕێگای جوان ووین
ئێوەش مەردانە،لەقسەم دەرمەچون
ئەگەر.ڕێویان دی،واهێندەغەمخوار
زانیان دورکەوتون،زۆرلەشوێن وبوار
قاژو.وقشقەڵە،دایان بەڵێنی
ڕازی بون دوایی،بەئەوکێشەبێنی
ئێوە شەریکن تەرازوێك بێنن
هەتا لێو بەشکەم، واز لە شەڕبێنن
بەز بو بە دولەت، میزان حازر بو
لەتێك لەوی دی کەهێندێ زیاتر بو
قەپاڵتێکی دا لەو لەتە گەورە
چەندە بەتام بو، ئەو بەزە چەورە
سمێڵی بادا بە فیکە و جیکە
کەوتە بەر هێرش پارچەکەی دیکە
هەر بە قەپاڵتان دەیخواردن زوزو
بەقەد مەرمەرێك مانەوە هەردو
هاویشتنێ زاری هەردو بە یکجار
فیزمالی دایە و ڕۆییشت بەرەوخوار
ڕاستی لە ئێوە زۆر شەرمەزارم
بوم بەشنەدەکرا هاویشتمە زارم
دەزانی چبکا، ریوی قازی بێ
وەزعیش مەعلومە، کێ نارازی بێ

## چەقەڵ و مریشکی پیرێژنێ

چەقەڵ مریشکی پیرێژنێکی فڕاند، پیرێژن بەداد و هاوار وەدوی‌دەکەوت ودەیگوت، خۆمریشکە سپی من دوسێ دەبو، چەقەڵ بەئەودرۆییەی پیرێژنی زۆر ناڕەحەت‌بو، لەداخان سورهەلگەڕا، مام ڕێوی بە لای چەقەڵی‌دا هات گوتی ئەوەبۆ وا ناڕەحەت بویە؟

چەقەڵ گوتی، لە حەیفی پیرێژنێ سەگسار؟ خۆ ئەو مریشکە چارەگێك نابێ، پیرێژن بەدرۆ دەڵێ، دوسێ دەبو. ڕێوی گوتی ؟دا وەمنی‌دە بزانم چەند دەبێ؟!

ڕێوی دەگەڵ مریشکی کەوتەدەست، فڕاندی وهەلات. دە هەلاتنێ‌دا گوتی چەقەڵ بەداپیر ەی بڵێ با چوار سێیان لە سەرە من بنوسێ بە قەرز.

### ( شێعری ) چەقەڵ و مریشکی پیرێژنێ

( لە فارسیەوە )

چەقەڵ، مریشکی پیرێژنیی ڕفاند — بە پلار و جوێن لە دوی، دەیگوڕڕاند
دوسێ پتر بو مریشکە سپی من — چەقەڵ ڕفاندی لە بن سەری من
چەقەڵ بەو درۆییەی هێند تورە ببو — لە داخان ڕێگای خوی لێ ونببو
ڕێوی هات چاوی بەو وەزعەی کەوت — زو زانی پاروی دە ڕۆنی کەوت
:چتە؟ بۆ قەلسی؟ بوچی شێواوی؟ — لە چی تورە بویی سور هەلگەڕاوی؟
لە داخ پیرێژنێ مەیمونی سەگسار — بە شیرەشیر و بەبۆڵە و هاوار
خۆ ئەو مریشکە چارەگێك نابێ — ئەگەر درۆبکەم مالم خەرابێ
:دادەی وەمنی‌دە، هەلی‌سەنگێنم — گەورە و چوکەیێ با وەدەستبێنم
ڕێوی، مریشکی کەوتە دەست؛ ڕای‌کرد — بە ئیشارە و دەست، هەروا هەرای‌کرد
:چەقەڵ زەحمتم کەمێ بۆ بکێشە — بەپەلەم ڕێگای دورم لە پێشە
:بە داپیرە بڵێ باش چاپلوسی — لە سەر من چوار سێ قەرز با بنوسی

## ڕێوی و قاژو

قاژویەك سەلکە پەنیرێکی دیتەوە، هەڵی‌گرتەوەو چۆ سەرداریکی بڵیند بیخوا. ڕێوی لەوێ ملۆ وموی دەکردچونکەڕسقی ڕیویەهەرلەسەرلاقانەو،ئەگەرچاوی بەپەنیرەکەی کەوت زۆری ئیشتیا چۆیە، گوتی واچاکە فێلێکی سازکەم، بەلکو ئەو پەنیرەی بخۆم. دەستی‌کردبە تەعریفات وجوانییێ قاژوی بۆ فریودانیێ:ئەمن ڕەشی وا جوانم نەدیوە چاو ئەوپەڕ وباڵەولاقەت چەندە ڕەش و جوانن، وەك بۆخۆت جوانی دەنگیشت ئاوا خۆش‌با تەعریفت بەکەس تەواو نەدەبو، قاژو فریوی خواردو گوتی بابخوێنم بەلکو دەنگیشم وەکورەنگم جوان بێ. دندوکی لێکردەوەو پەنیر کەوتەخوارێ، ڕێوی هەڵی‌گرتەوە، دەبا قاژو هەر قارەقارێ بکات بزانین پەنیری دیکەی وەدەست دەکەویتەوە.

### (شێعری ) ڕێوی و قــــاژو

لە فارسیەوە بۆ کوردی

پەنیرێکی دیت لە سەر ڕێگایەك — هەڵی‌گرتەوە قاژو خێرایەك
چۆ سەر دارێکی بلیند، قەڵەمە — نۆشی گیانی کات، پەنیر دەڵەمە
ڕادەبرد؛ دیتی ڕێوی جادوکار — بۆ فریودانی قاژو کەوتە کار
ئەرێ چەند جوانی، چەند شۆخ و شەنگی — بە ڕاست لە تۆ دێ جوانی و چەلەنگی
ئەو پەڕو باڵەت چەند جوان و ڕەشە — دندوك و لاقت، لە ڕەشیان گەشە
دەنگیشت وەکو ڕەنگت خۆش بایە — جا دەمکوت بە کەس تەعریفت نایە
هەوای چۆ دە سەر، ویستی بخوێنی — وەك پەڕوباڵی دەنگی بنوێنی
نوکی کردەوە، پەنیر کەوتەخوار — ڕیوی دای هاتێ و گرتیەوەو بەغار
دەی تا دەتوانی قارەقاری بکا — تا پەنیر یا شت چی پەیدای بکا

## ڕێوی کەڵەشێر و سەزەرد

ساڵێکی پاییزێ کەڵەبابێك دەگەڵ سەگێکی، لەکۆنە دێیەکی مابونەوەیابەجێی مابون، سەیەکە لە بن د یواری وەرکەوتبو کەڵەبابیش دەگەڕا و چینەی دەکرد بەجینجرۆکان عەرزی هوڵدەکۆلی، مام ڕێوی چاوی پێکەوت گوتی، خودا چاکی دا، ئەونێوچیرەم وەدەست کەوت جارێ لێی نیزێك بوۆەوچاك وخۆشی دەگەڵ کرد، لیێپرسی:ئەوەچۆنە بەتەنێ لێرە پەیدابویە؟

کەڵەشێر:بەتەنێ نیم. مام ڕێوی:ئەدی؟ کەڵەباب:کاکیشم دەگەڵە. هاتوینە ئێرە ئاوەدان کەینەوە. ڕێوی:ئەدی کوا کاکت؟ کەڵەباب:لەئەو بن دیوارەی نوستوە سەری دیشیت.مام ریوی وایزانی، کاکی قەلەمونەیەك یا پەلەوەرییێکی لە خۆی گەورەترە. گوتی، نەخێرخودا چاکتری دا،ئەوە بونەدو. مام ڕێوی چوبۆئەوجێگایەی کەڵەباب نیشاڕەئی پێکردبو، لەناکاو بەسەرسەزەردیدا کەوت وبەدیتنی سەزەردی واڕاچەنی وهەلات. سەزەردبە دەورەی کۆنەدییدا دوسێ دەورانی ڕێکەوت، مام ڕێوی لە ترسان هەمو شتێکی لەبیرچۆوە، کەڵەباب بانگی کرد:مام ڕێوی وەرە! بۆ کوێ دەڕۆی؟! وەرە بۆمان ببەبەکوێخا فەعلەمان بۆبگرەکارمان بۆ بکە.

مام ڕێوی لە ولامدا گوتی برو خولاتبری، ئەتوی وا قەرچەناغ و کاکت وا تورە،بە سەد ساڵی دیش ئەود ێیەو بۆ ئاوەدان نابیتەوە.



## (شێعری ) ڕێوی و کەڵەشێرو سەزەرد

کەڵـــەشێرێکی جـــوان و لـــەبەر دڵ
ڕەنـد و ڕەزا سـوک وەك گـوڵ سـەرچڵ

لـــەگەڵ گـــەماڵێك چـابوك و زرەنـــگ
جـەنگ و دم لـە شـەر هـەروەکو پڵـەنگ

پـــایزێ مانـــەوە لـــە دێیـــەکی چـــۆڵ
بە بـێ بژێـوی وەخـتی سـەرما و سـۆڵ

مـام ڕێـوی کـە دی ئـەو کەڵـــەشێرە
چـاوی دەدرەوشـا هـەروەك ئەسـتێرە

لیـێ نـیزێك بـووە و بـە خـۆی گـوت مامـە
پـاروێکی چـەورە و زۆریـش بەتامـە

پاش چاك و خۆشـی؛ ساحیبماڵ کێیـە؟
چۆنـە پـەیدابوی لـەو کۆنـە دێیـە؟

:هـەر مـن و کـاکم هـاتوین دوبـەدو
چـاك بکەینـەوە ئـێرە وەك پێشـو

:ئـەی کوانـێ کـاکت زیـارەتی بکـەم
کـارێ هـەتا نـە یـاریدەو بکـەم

:لـەو بـن دیـوارەی کـاکم نسـتووە
سـەری ژان ئـەکا، تـۆزێ مـاندووە

وەیزانـی کـاکی مـامر یـا قەلـە
یـا باڵندەیـەك وەکـو خەرتەلـە

چـوو تـا ببینـێ پاروەکـەی دیکـە
بزانـی هـەروا چـەورەو نیزیکـە

ڕێـوی سـە زەردەی کـە دی وەك ئاسـك
لیێترسـا هـەڵات ئەوباسـکە و باسـك

زۆر زیرەکانـە تـا خـۆی خـەلاس کـرد
ئـەوجار کەڵـەشێر مـام ڕێـوی گـاس کـرد

وەرە هەڵمەیـە، لـە چـی سـڵ دەکـەی
دەبـی بـە کوێخـا، کارمـان بـۆ دەکـەی

:تـۆی قەرەچـەناغ، کـاك بێحەوسـەلە
چـاك نابێتـەوە ئـاوا ش پـەل پەلـە

بـا مـن پێتبڵێـم دڵـت نەئێشـێ
ئـەو کـارەی ئێـوە سەدسـاڵ دەکێشـێ



## کوتر و کەڵەباب

مریشك بەهێلکەبو،هەربەئێروبەوێ دادەڕویشت:کابان وەدوای‌کەوتبوبەقوربان وسەدەقەی دەبوبەڵام مریشك هەربەئەولاولایان‌دادەڕۆیشت وجوابی کابانێی نەدەداوە، کۆترئەوەی دی زۆری پێ‌ناخۆش‌بو،ڕوی دەمریشکەسوری کردوپێی‌گوت بەخۆت وبەهێلکێکی جیقناوی عەیبێ ناکەێ کابانت ئاواناڕەحەت دەکەی.ئەمن ساڵێ یازدەجارکورك دەبم وجوجکان هەڵدێنم،بەقەدەتۆمنەتێ لەسەرساحێبم دانانێم.کەڵەباب بەغارهات وگوتی خوشکێ ئەوەحافرەتەوناقیس ئاقڵەبڵێ هەتاجوابت دەمەوە کۆتربەکەڵەبابێ دەڵێ،ئەمن دەگەڵەتۆقسان،ناکەم چونکەسێ عەیبی گەورەت هەنە، ١ـبەبێ وەختی بانگ دەدەی٢ـ٠٠وی دەخۆی ودەشخوێنی٣ـسواری دایەخۆشت دەبی؟

### (شێعری) کوترو کەڵەبابی

| | |
|---|---|
| کابان بەیانی هاتەوە ماڵێ | هەمو شوێن گەڕا تا بن هەرزاڵێ |
| لێم سورو عەینە، خۆ بە هێلکەیە | کوخ و جیڕاوکەی لە لای دەرکەیە |
| ئاخری دیتیەوە زۆر لەبەر ماڵان | لە ژێر پلار و هێرشی منداڵان |
| بەفیزو دەعیە و قیرە و کارەگار | دەچوۆوە، دیسان هەروابەرەو خوار |
| کۆتر لەو بەرزەی کە ئەوانەی دین | هات لێی وەجواب هات زۆر بە بوغز و قین |
| ساڵێ یازدە جار جوجکان هەڵدێنم: | لە لای ساحێبم هەر خۆ نانوێنم |
| کەڵەشێر کە دی لە دور کارەسات | بۆ لای مامر و کۆترێ بەغار هات |
| گوتی عافرەتە و عەقڵ ناقیسە | لەگەڵ من بدوی، ولام ببیسە |
| پێش چاوم چۆڵکە لاکەوە بڕۆ: | قسەو باس ناکەم ئەمن لەگەڵ تۆ |
| ئاخر هەی نەزان بەو سێ عەیبانە | لە تۆدا هەیە و من لێم عەیانە |
| شەوو نیوەشەو دایمە دەخوێنی | دوای وی بۆ خواردنی پیس دانامێنی |
| ئێستا کە هاتووی، بە نیازی چاکەی | هیچ فەرقی دایك و بێگانەی ناکەی |

## ڕێوی و مریشکی مەلای

جارێکی ڕێویەك تازەفێرەڕا ودەبوئێستافێری فێڵبازیەکانی ڕێویەنەببو،

مریشکی ماڵە مەلای ڕفاند، بردیەوە مەنزڵیٚ بیخوات، لیٚیانپرسی ئەو مریشکە قەڵەوەت لە کویٚ هێناوەدەڵەی چرگە؟

کاك ڕێوی:وەڵلاٚ لە دەرکیٚ ماڵە مەلای گرتم و هینام، پێیانگوت هەستە خێرا بیبەوەلە جێگای خویٚ دانیٚ وەرە هەتا مەلا نەیزانیوە، وفتوای نەداوە،

ئاگاداربیت وهەربە قوماریش بلیٚ ڕێوی حەلاڵە تاقێکمان لیٚناهێڵن.

## (شێعری) ڕێوی و مریشکی مەلای

دەڵێن ڕێویەکی تازە ببوٚ ڕاوکەر مریشکێکی گرت و لە دێی بردەدەر

هێنایە لانە هیلاك و برسی باوکی لییٚڕوانی و لە کوڕەکەی پرسی

:بەخێر بیێوە؛ وەرە دابەزە لەکوێت هێناوە ئەو خەز و بەزە

هەر توشی هاتم، دیم لەبەر ماڵان مریشکی مەلایە، هێنام بە تاڵان

کەمێك تورەبو پێی گوت هەتیوە! هێشتا توٚ جاریٚ دنیات نەدیوە

من لەگەلٚ مەلا نابم بە دوژمن هەستە بیبەوە! خێرا کوڕی من

تا نەیزانیوە و فتوای نەداوە مریشك بەرەو بگەڕیٚ دواوە

بە قوماریش بلیٚ؛ ڕێوی حەلاڵە تاقمان ناهێڵن ئە لەو محاڵە



## گورگ و ڕێوی

ڕێویك لەکەلێن وقوژبنان هەروا مل ومۆی دەکردودەگەڕا،لەنەکاوگورگێکی برسی دایهاتێ وگرتی لەگورگی پرسی:چیە؟ بۆ وا ڕەنگت زەردهەلگەڕاوە.گورگ ولامیدا وە؟ :برسیمەولەبرسان هێزوتوانام نەماوە نامێڵم ببزوی هەر ئێستا دەتخوم. ڕێوی گوتی بەلاقی خێویوە،بەخوای زەریفە، بەخوای بابە داوەتم بۆ کوڕم کرد،ژنم بۆکوڕم هینا، ئەمن ئەوەچەند ڕۆژە لەتۆدەگەڕێم و چەجیی نەماوەنەیچمێ وئەوەدیسان لەدوای تۆ هاتومەتەوە ئێرە، دا وەتمەوژنێ بۆکوڕم دێنم هەستە وەپێشم کەوە با بڕۆین.

گورگ بێ قسەوفریوێ ڕیوی خوارد وبەلاکەلاك، وەپێشیکەوت.ڕیوی خۆی دە کونێکی ڕاکرد خۆی بۆ نەشێردراوەوهاتەوەدەری گورك لیێپرسی:بۆچویە وێ؟

مام ڕێویێ:ماڵە دۆستێکی بو چوم لێم گێڕاوە! ئەوجارکەلێنێکی پەیداکرد و بەچیرەچیڕ خۆی تێڕاکرد، زانی گورگ قەت زەفەری پێنابا ڕێوی زۆری پێچوگورگیش ئەوەلەوێ قونەتسەی داوەومەحتەلە ئەوجار: هەرایکردی دەوەرەمام ڕێوی بۆخۆت مەعتەل دەکەی؟ مام ڕێوی گوتی دەبرۆدەفنبە ئەوە دو ٠٠و٠٠ی کالم بۆ کەندی،بەخوای بابە نەکوڕم ژنێ د ێنێ و نە دا وەتێ دەکەم، ویستم خۆم لەدەستە تۆ خلاس کەم گورگ زۆری ئەولاوئەلاکردو،ڕێوی نەدیتەوەو لێ داڕۆیشت هەربەلاکەلاك.

### ( شێعرەکەی ) گورگ و ڕێوی

مام ڕێوی بیری ڕۆزی خۆی دەکرد — لەو تیش و بنبەرد، ملۆمۆی دەکرد
لەپڕ، قیت بووە گورگێکی برسی — هەروا دایهاتێ و ڕێوی لێی پرسی
چیتە؟ نەخۆشی؟ بۆ وا شێواوی؟ — زۆربەداخم بوت، کزو داماوی
:برسیم، لە برسان هێزم نیە بڕوم — نایەڵم ببزوی، هەر ئێستا دەتخوم
:بە خوای زەریفە بە لاقی خێوی — زەماوەندی کرد بۆ کوڕی ڕێوی

دەبــێ بمبــوری، دەڵێــم نــەفامی — ڕێوی، کوا گۆشتی و کوا چێــژو تــامی
وەپێشــمکەوە هەســتە بــا بڕۆیــن — شاییە و لــەوێ چــی خۆشبــو دەیخۆیــن
گــورگ کەوتــە ڕێ، هــەر لاپــەی دەبــرد — بەپەلــە،ڕێــوی خــۆی دە کونێــك ڕۆکــرد
چــی حــەولیدا خــۆی پــێ نەشــێراوە — بــە نــاعیلاجی،هــا تــەوە دواوە دواوە
پیێ گوت بە ڕێوی، چ بوو؟ چ دەکەی؟ — بۆ بــە خۆڕایــی، خــۆت مەعتــەل دەکــەی
:ماڵــە دۆستێکیە ، چــوم لێــم گــیراوە — لــەو نێو بەردانــەش، کەرێشــکم مــاوە
گــەڕاو کونێکــی تەســکی پــەیدا کــرد — هەر بــە چیرەچیــڕ خوی دە کون ڕاکرد
کــەمێك مــەلاس بــوو، ڕوانــی دەورویــەر — زانــی، قــەت گــورگ پیێنابــا زەفــەر
:دە زوبــە ڕێــوی، ڕەفیقــت بێنــە — ڕوژ زۆر درەنگــە، خــۆ مەخافڵێنــە
:دە بڕۆ دەفنبــە، هــەی گورگــە فــەندی — دو ۰۰و و ۰۰ــی کــاڵم بــۆ کــەندی
نــە کورم ژن دێــنی و نــە داوەت دەکــەم — ویستم لە دەست تــۆ خــوم خــەلاس بکــەم



## ڕێوی و کەڵەشێر

ڕێویەك لە قەراغ دێیەکی کەڵەبابێکی فڕاندو هەڵات، سەگەل کەوتە دووی. تەنگاویان کردبو کەڵەباب گوتی ئەگەردەتهەوێ لەدەست ئەوانەڕزگار بی، بانگیانکە بڵێ ئەوە ئی دێیی ئێوە نیە، ڕەفیقی خۆمە، لەئەودێیەی د یکەڕابۆخۆی هاتوەباڵەکۆڵت بنەوە؟ مام ڕێوی فریوێ کەڵەشێری خوارد دەگەڵ زاری لێلنکردەوە حالیانکات کەڵەباب هەڵفڕی و هەڵات دەگەڵ باڵەفڕەی کەڵەبابی، ڕێوی کەوت و سەگەل گرتیان وکەولێان لەحاجەت ئیخست ،

کەڵەباب هەم خۆی نەجات داوهەم تۆڵەی ئیدەد یکانەشی لەڕێویەکردنەوە .

## (شێعری) ڕێوی و کەڵەشێر

| | |
|---|---|
| ڕێوێك جارێکی بە دێیەئدا هات | کەڵەشێرێکی قەپدایە و هەڵات |
| سەگەل کەوتەدووی مام ڕیوێان ڕەتاند | زۆر بە چالاکی، نێوچیری ڕفاند |
| کەڵەشێر گوتی ئەگەر حەز دەکەی | لەچەنگ گەماڵگەل خۆت خەلاس بکەی |
| بانگیانکە و بڵێ ئەو کەڵەشێرە | ڕەفیقی خۆمە و بەیاری فێرە |
| لەو دیێ دیکەڕا، بۆخۆی بۆلام هات | هی دێی ئێوە نیە، بەسکەن شاتەشات |
| تەنگاویان کردبوو سەگەل و تاجی | زاری کردەوەو بە ناعیلاجی |
| هەتا حاڵیان کات، چییە کارەسات | کەڵەشێرە سور، تێی تۆڕاند، هەڵات |
| لەگەڵ فڕین و باڵەپڕە و قڕی | ڕێویشیان گلاند، فرزەیان بڕی |
| بۆ جارێکیش بێ، ئەستاندی تۆڵە | خۆشی ڕزگار کرد، لە دەست ئەو زۆڵە |



## بانگەێشتنی لەگلەگ و ڕێوی

ڕۆژێکی ڕێوی خۆی پیاوی چاك دەكاودەچێ ولەگلەگی بانگێشتن دەكا،لەسەر هەمو خواردەمەنی دونیایە، پەلوی بوڵێ دەنێ چونكەدەیزانی بەدندۆكێ هەڵناگیرێ ودێنی بۆی لەسەر بەرد ێكی پانیش ڕۆدەكا، دەڵێ دەی حاجی فەرموو دەی! بخۆ. ڕێوی بە زبانی دەیلێستەوە، هەتا خەلاسی كرد، لەگلەگی فەقیریش دوجاری دندوك پێدادا وەختابو دندوكیشی بشكێ وهیچی پێ نەخورا؟

ئەوجارلەگلەگ فكری كردەوەچەبۆڕێوی لێنێ چۆنی تۆڵەلێ بكاتەوەڕێوی بانگ كردوئەویش دانوی بوڵێنا، دە نێو كولەكێكی مل درێژی كرد، لەگلەگ بەدندووكان دەنك دەنك دانوی دەردەهێنان ودەیگوت فەرمو دەی مام ڕێوی،خۆشێوێكی زۆر زەریفە ئەوەبۆ ئیشتیات نیە ئەبەئەوجورەی لەگ لەگ توڵەی لە مام ڕێوی كردەوە، نەیەێشت دەنكێكی بخواوبەبرسیایەتی بەڕێی كردەوە.

## بانگەێشتنی لەگلەگ و ڕێوی

### ( شێعرەكەی )

لەگلەگی، بانگ كرد، ڕۆژێكی ڕێوی — نیوڕۆژی سازكرد لە چۆل و كێوی
پەلوی بوڵێنا هیند بە دەست و برد — لەسەر، بەردێكی، زۆر پانی ڕۆكرد
حاجی وەرە پێش، فەرمو بسم‌الله — وادەبێ، غەزا ئەشەدو بالله
تایبەت میوانیە، ئەو شێوی وا خۆش — هیوادارم تۆش نەمكەی فەراموش
هەموی لستەوە، تا بڵێی یك و دوو — لەگلەگیش لەوێ تیێ وەرامابوو
نۆرەی حاجی هات بانگی بكا ڕێوی — تا بەڕێ و گەزی كوێخا ی بپێوی

دانـــوی بوڵێنـــا، زۆر بـــەتام و چێـــژ کردیـــە نێـــو کدوێکـــی زلی ملدرێـــژ

دەریدەهێنـــان بـــە دنـــدوك دانـــوو مـــام ڕێوییـــش لـــە لای، هەلتروشـــکابوو

نـــەیتوانی دەنکێـــك باویتـــە زاری ســـەری بـــەرداوە بـــە شـــەرمەزاری

تۆڵـــەی کـــردەوە لەگەڵـــەگ لـــە ڕێـــوی نەیەێشت چێژێ بکا، لـە نـان و شـێوی



**ڕێوی کوێستان خوور شینەی گەرمێنی**

پاش ئەولائەلاوگەڕانێکی زۆر.ڕێوێکی گەرمێنێ وڕێوێکی‌کوێستانێ توشی یەك بـون و بونەڕەفیق.ڕێوی کوێستانی بە ڕێوی گەرمێنی گوت، لەمێژەگەڕیدەی پێم بڵێ بـزا نم چەند فێڵان دەزانی؟ گوتی هەزار فێلیش زیاتردەزانم ،ئەدی ئەتۆچـەند فێـڵان دەزانـی؟ ڕێوی کوێستانێ گوتی ئـەمن هەرنـەخۆش بومـە چم لەبیرنەماوەتـەنیافێلێکی پوچەڵـە دەزانم. وەڕێ کەوتن بەزیك دیاربو، ڕێوی گەرمێنی غاریدایە، ڕێـوی کوێستانی گوتـی کوڕەنەیکەی ئەوەتەڵـەیە بـەخۆڕای لێرەدانـەندرا وەنەکـەی،ڕێـوی گـەرمێنی گوتـی کوڕەنەیخۆم دڵمدەتوقێ، هەرهات وچولـەناکاو تەڵە ترازا و ڕێوی پێوەبو، دەستی کرد بـە هـاوار هـاوارێ، هـەرای ڕێـوی کوێسـتانیێ دەکـرد:کـوڕە چارە یـەکم بکـە ڕێـوی کوێستانێ. گوتی ئاخر پێم نەگوتی تەڵـەیە، بۆ خۆت دەوێ هاویشت. ڕێـوی گـەرمێنێ : تـازە کـارە هـاتووە.ڕێـوی کوێسـتانێ:ئـەی ئەتونـەت دەگـوت هـەزار فێڵیـش دەزانم ئێکێکی دەکارکەوخۆت نەجات دە وبانەمەش ئەوفێڵەی تۆفێربین،ڕێوی گەرمێنێ:ئەمن فێڵـەکانم هەمودەکیسـولکێکی کردبـون لـەبن کلکـم هەلاوەسـیبوون،بەتەقـەی تەڵـەی،هەموپـەرت وبلاوبـون زۆریشم لێ ڕوانـین هیچم نەدیتنـەوە.ڕێـوی کوێسـتانێ : وەڵلا ئەمنیش وەکی پێم گوتی هەرفیلێکی پوچەڵە دەزانم،ئەویش ئەوەیە:ئـەتۆخۆت لەمردن دە،ڕا وچی ئەگـەرهات،لەتەڵـەت دەکاتـەوەودەڵێ حەیفـەمنداربوە،ئەمنیشمن ئەوەلەهۆوەی خۆدەمرێنم چاوی بەمن دەکەوێ ودەڵێ ئەوەدەبێ دەرمانیان خـوارد بێ

چیە ؟دەگەڵ بۆلای من هات نابێ بم گاتێ ئەمن هەڵدێم،دەگەڵ ئاورِی بۆ لای تۆدا وەئەتۆش تەڕدەستێکی هەڵێ ؟بەڵێ رِێوی گەرمێنێ خۆی مراندورِێوی کوێستانیش لەدوری تەڵەی خۆی مراند،راوچی هات لەدورچاوی پێی کەوت وگوتی لەدایەمنت کەوی گەیشتەسەری وچاوی پێ کەوت وگوتی حەیف منداربوەوادیارەتازەش منداربوە لەتەڵەی کردەوەوهەستاپێ وروانی چاوی بەرِێویکەی دیکەکەوت بۆلای چووگوتی ئەوەدەبێ دەرمانین خواردبێ راوچی چوبۆلای رِێوێە،ئەی گەیشتێ رِێوی هەڵات ئاورِی دا وەورِێوی کن تەلش نەمابو وەکی دایان‌نابو ئاوا رِێوی نەجاتیان بوو، وراوچیش دم لەپوش هاتەدەرێ؟،

**(شێعری) رِێوی کوێستان خۆر، شینەی گەرمێنی**

لە چرو دوڵێ یەکتریان بینی — رِێوی کوێستانی و شینەی گەرمێنی
لیێ‌پرسی لالو، چەند لەو فێڵانە — فەریامان کەوێ رِۆژی تەنگانە
رِێویە شین دەڵێ قەزات لە گیانم — لە هەزار فێڵیش، زیاتر دەزانم
تۆش وەکو منی، یا بگرە زیاتر — ئەوەش دەزانم، تا پتر، چاتر
دەی بۆم بەیانکە، با دڵنیابم — بۆ نێچیر گرتن با زووتر رِابم
:ئەوەی دەیزانم، فێڵێکی چووکە — لەنێو فێڵاندا، چرووك و پووکە
:رەگەڵم کەوە هەستە با برِوێن — برسیمە و شتێك پەیداکەین و بخوێن
هەر وەرِێکەوتن لە قەراغ رەزێك — بە جوانی دیاربون دو گۆشت و بەزێك
رِێویە شین بەغار، هەڵیکوتایە سەر — هاتبوو بیگاتێ،پەنجەی دایەبەر
:نەکەی تەڵەیە، ئاخر برای خۆم — دەیگوت خۆ دڵم دەتوقێ نەیخۆم
دەهات و دەچو، گەرِا دەوروبەر — تەڵە ترازا و لاقی کەوتەبەر
بە هاوار دەیگوت هۆی برای گیانم — بە قسەم نەکردی، زۆر پەشیمانم
چارەیەك بکە و بگەرە فریام — لە بیرو هۆش و فەننت، دڵنیام

:ئەتۆبوی دەتگوت، زیاتر لە هەزار — فیلان دەزانم بە سیا و بە ئەژمار

لەو هەزار فیڵە، یەکیان دەکارکە — دەرسێك بۆمە بێ و خۆشت ڕەزگارکە

گشت فیڵەکانم ناو کیسێك نابون — وا لە ژێر کلکم، هەلاوەسرابون

بە تەققەی تەڵە پەرت و بلاوبوون — ورديش لێم ڕوانین هیچیان نەمابوون

:خۆت لە مردن دە، هیچ خۆ مەبزێوە — هەتا ڕاوچی دێ، منیش بەو پێوە

لاقت دەردێنی لە تەڵە، یەقین — حەیفە منداربووە،دەڵێ ڕێویەشین

دەڕوانێ دەورەو ویستی بۆ لام بێ — دەبێ ئەوانە دەرمانیان خواردبێ

نابێ بمگاتێ تیێ دەتورێنم — هەر من هەلاتم تۆ بکەوە شوێنم

وە کی داینابوو گەڕا کارەسات — ڕێوی هەلاتن، فیڵیان بەکارهات

ڕاوچیش دم لە پوش چی نەکەوتەداو — فریوی ڕ ێوی خواردئاقلێ ناتەواو



## توتك و سەوو تاژی

دەڵێن ساڵێکی گورگێك ڕێگای کەوتەقەراغ د ییەکی دەڕۆیی، سەی دەوڵەمەندی، تاژی ئاغای و توتکی فەقیری ڕییکەوتن، برێکێیان لەبەرهەلات، دوایە کوتی با بزانم، ئەوانە چکارەن ڕەمندەکەون؟ گورگ لەبەریان ڕاوەستاوەو، ئەوانیش هەرسێ لەدەورەی گورگی ڕا وەستان. ڕوی دە سەیەکەی کردو گوتی سەرزەلامی پێچك ئاشەوان، ئەتو چکارەی؟ ولامی دا وە:ئەمن سەی دەوڵەمەندیم.

گورگ گوتی بەڵێ هەقتەئەگەر ئەتو گورگی نەخنکێنی، ساحێبت نانت ناداتێ.؟

دوایە ڕوی دەتاژێ کرد گوتی لینگ درێژی کلك باریك ئەتو چکارەی؟

تاژی ولامی داوە، ئەمن تاژی ئاغام.بەڵێ ئەتۆش حەقتە. چونکە سوکەپێی، هەرچی دیتت دەبێ مەیدانێکی ڕێیکەوی.

ڕوی دە توتکی فەقیری کرد، لییپرسی ئەدی خرپنە ئەتۆ چی؟

بە دەنگێکی نوساوو فەقیرانە ولامی داوە کە بە زەحمەت گوێی لێدەبو :من توتکی داپێرەم. بیکەس و فەقیرین. گورگ بە لەسەرەخۆیێ گوتی ئاخر چت پێبڵێم، سەی دەوڵەمەندی نی، گورگی بخنکێنی، تاژی ئاغاش نی، بلەی سوکەپێم هەرچی دیتت مەیدانێکی ڕێکەوی.

:توتکی فەقیری، چەپوکێکت پێدادەم هەردو چاوانت ڕۆڕژێنم.

## ( شێعری ) توتك و سەوو تاژی

لە قەراغ دییەك، گورکێك ڕادەبرد    توتك و سەو تاژی هێرشیان بۆبرد
لەبەریان هەلات تاوێکی بەغار    دوایە گەڕاوە لییکردن پرسیار
ئێوە دەزانن ئاخر ئەمن کێم؟    چۆنو وێراوە وا بێنە سەر ڕێم؟!
ڕوی دە گەماڵ کرد : زلی ناهەموار    چکارەی دەگری ڕێگا لە ڕێبوار

کارم مەعلوومە من پاسەوانم     لای دەوڵەمەند یە جێگەو مەکانم
بەڵێ تۆ دەبێ گورگ خنکێن بی     سەی دەوڵەمەندی بە بڕو بێن بی
کلك و لینگ باریك هوی دمدرێژە     ئەتو چی دادەی وەرە پێم بێژە
من تاژی ئاغام چوارپەلم سورە     پێم‌ئەسپێراوە تا ئەو سنورە
هەرچی بیبینم تاوێ ڕێی‌کەوم     جێم لە وەتاغە، دوایە وەرکەوم
ئەشهەدوبیللا دەبی ئاوا بکەی     تاسەولەی کەمێ تریش پەیدابکەی
شانازی دەکەم ئا ئە بەوکارەی     کوڵکنەی خرپن ئەتو چکارەی؟
توتکی داپیرەم بێ هیوا و بێکەس     لەو خوایە بەدەر نیمە فەریادرەس
گورگەشێن هێدی ڕویتی کردئەوجار     جوانی حاڵی بکاوەلێت جابەغار
سەی دەوڵەمەندنی گورکی بخنکێنی     یا هەموشتێکی وەدەست خوت بێنی
تاژی ئاغاش نی، بلەی سوکەپێم     تا هەرچی دیتم، بە دوای‌دا هەڵێم
توتکی فەقیری، بێکەس و بێدەر     بە دو وچەپوکان چاوت بێنمەدەر

* * *



## بارگینی نەخۆش

دەڵێن کابرایەك بارگینێکی نەخۆشی فرۆشت جڵەوی وە دەست کڕیاری داو پێی‌گوت براگیان، بە خوای چرای خۆم کوژاندەوەو چرای تۆم هەڵکرد.

کابرا زۆربە کەیفخۆشی، بارگینی بردەوە ماڵێ وای زانی شتێکی چاکی وەدەست کەوتوە. شەوێ وەختی نوستنێ بارگین دەستی کرد بە کۆخینێ . کابرا هەر لاقێکی لە ژوری بوو لاقی دیشی لە تەویلەی بوو. ناچار هێنای لە تەویلەی لە بن سەری بارگینی چرای بۆ هەڵکردو هەتا ڕۆژ بارگین هەر کۆخی و چراش ئاییسا.

کابرای فەقیر لەسەرەخۆ گوتی کوڕە ئەوە بۆیە کابرای فێڵەزان گوتی چرای تۆم هەڵ کردو چرای خۆم کوژا ندەوە،

ئەوەبە چرای بن‌سەری بارگینی دەگوت.

### (شێعرەکەی )

| | |
|---|---|
| پیاوێکی بێ فێلْ ئەسپێکی کڕی | پوڵەکەی دایە، قیمەتیان بڕی |
| کابرای فرۆ شیاردەیگوت بە تـا نە | ئەگەر پێم دەکەی بەقا وموتمانە |
| ئەمن چرا کەی خۆم کو ژ انـدەوە | چراو ڕ ونا کی تـۆم گە شانـدەوە |
| برد یۆ ە ما ڵێ لەو وەختە ی شـەوێ | ئالیکی بۆ برد پێش کاتی خـەوێ |
| دیتی دە کۆخێ بارگـین نا سـازە | خۆ هیچ ناخوات وزۆریش بـێ وازە |
| هـەر ها تـەژوروچۆوەتـەو یلـە | ناچار دا گیـر ساند چرا و فتیـلە |
| چرا ئا یسا تا ڕۆ ژ هـاتـە دەر | بۆرەشن کۆخی ئەوشەوەی یەکسەر |
| کابراش بەبێ خەو هەروا هات وچو | بەورتەدەیگـوت هـیلاك ومانـدو |
| فێڵاو ی ئە گە ر وای بە من دە گوت | بەچرای بن سەری بارگینی دەگوت |

چارویٚ دار

**( شێعر ) لە فارسیەوە**

ڕۆییشت بۆ سەفەرکابرای چارویٚدار — دە کەری پێبون بیانخاتە ژێر بار
سواربوو لە یەکێ ڕەتاندنی بەغار — لێیان خوردبوٚوە، نۆ هاتنە ئەژمار
دابەزی، کەوتە ناخۆشی و عەزاب — ئەژماردنی ئەوجار دەهاتنە حیساب
سواربوکەڕویشت کەوتە هەم هەمە — کەری ئەژماردن، خوٚ یەکیان کەمە
دابەزی ودیتنی، دە کەر بون تەواو — شل‌بوٚوەو.وەکو بەنێکی زۆر خاو
سوار نەبوو گوتی ئەوەی ناهێنی — بە سواربوونی من کەرێك نەمێنی



## لێ کۆڵینەوە و پێشنیارێك لەسەر پەندی پێشینیان )

ئامۆژگاری ڕێنوێنی پێشینیان ئەگەربەمەتەڵ گوترا وەو.بونەتە ئەوپەندانەکەئاواپڕ ماناووشیرن وخۆشن ئەگەرهەرئاوا.بەساکاری،،تیێان دەفکری ،،لەزۆرجێگایان بێ ئەدەبی وناحەزی تێدادەبیندرێ ،،وەکوپەندی پێشینیانەجوانەکانی خوالێ خۆش بوی مام وەستا مەلاغەفوری دەبباغی( ناحەزوجوان):ئەممائەگەر لێی ورد بێ وەوماناکەی بدۆزیەوە دەزاندرێ ئەگەر بێ ئەدەبی تێدانیە هیچ ،،دڵی پیاویش زۆربەجوانی پارا ودەکا وتێی دەگەیەنێ،، بەڕونیش دیارەهەروالەخۆڕا نەبونەتەئەوپەندانە پیاوی زۆربەئازمون ئەوپیاوەبەغیرەتانەی سەرماوگەرمای زەمانەیان دیوەودیلی وکۆیلەتی بێ بەشی وجیاوازی ڕەگەزایەتیان بەسەرهاتوە ئەگەرنەیان وێرا وە ڕا ستەوخۆقسەکەبکەن ئاواکردویانەتەئەومەتەڵانە۰

وزۆرشتیشیان ڕاگەیاندوەجاری واش هەبوەبۆئیسباتی کارەکەی لەتویلکیان هیناونەتە دەرێ وکاکڵەکەیان بۆلەسەربەی دەستی داناون۰

کەوا بودیارەئەو ڕێنوێنیانەزۆریان هەورا زونەشیودیوەبەجێ ماون لەبیرچونەتەوە بەزارا وێکی دی ولەشوینێکی دی سەری هەڵدا وەتەوە،زۆری زەحمەت پێوەکێشراوە هەتاهاتوتەوە جێگای خۆی ،،

ناکرێ بڵەین ئەوە بەساڵێك ودوان ئەوهەموپەندەپێك هاتوەو ئیستاش ئەوەخەڵکەکەمان بەشانازیوەکەڵکی لێی وەردەگرن ئەوەبەمروری زەمان لەکەڵ مێژوی دورودرێژی پڕ لەگەندوکۆسپی نەتەوەکەمان لەشوینە جوربەجورەکانی ولاَت واهەبوەلەجیران وتەنانەت لەبێگانەش وەرگیراوەتەووەرگێڕدراوەتەوەسەرزمانی ڕەسەنی کوردی۰

۰دەکرێ بڵەین بەدەیان ساڵ پەندێك ویاچەندپەندێك پێك هاتوەوگوترا وەو وگوتراوەتەوە هەتابونەتەئەوپەندانەی کەئێستا دەیبینین۰

دەبێ هەموشمان ئەوەی بسەلمێنین وبەباشی بیزانین ئەگەرهیچ پەندێك بەبێ هۆ پێك نەهاتوەوهەرپەندێکی هاتوتەسەرزمانان وخەڵکەکەمان دەیڵێن ڕۆدا وێکی بەخۆوەدیوەو

بەهوی ڕودا وێك كارێكی كراوئەوپەندەپێك هاتوەو . دا ندرا وە٠٠٠

جائەگەرئەمە بێن قەیاتەكانی ڕوداوی ئەوپەندانەبنوسین وبیانخۆێنینەوەبەزۆرانیان ئەلەئەو پەندانەئـەوەندەپیٚ دەكـەنین لەخۆدەبینەوەبەسەرسـوڕمانەوەلەهێدێكانیش دەڕوانـین ودەڵێین؟؟چۆن ئەوپەندەلەبەرئەوكارەی ئەوشتەی ئەوقسەی داندرا وە؟؟

لەڕابردودا زۆرلەزاناوشاعیرەكوردەكان بۆكۆكردنەوەی پـەندی پێشـینیان هـەوڵیان داوە و نـەیان هێشتوەببنەدەستەچیلەی ئـاگر یـان لەنێوكەلێنـەدیوارەگڵێكان وكۆنەچاڵەگـەنم وجۆیەكان دابڕزن ولەناوبچن و ،خوا هـەڵی نـاگریٚ لەئـەوبوارەدا زۆریـش سـەركەوتوبونەو كارەكانیشـیان ئـەوەندەی بڵەبـەرچاوە،جائەگەرنوسـەرخۆی بـەخاوەن؟بەدانـەری ڕاستەقینەی ئەوپەندانەنـەزانیٚ خۆینـەرڕێزیان لیٚ دگـرن ودەبەرابـەریانداكڕنۆش دەكـەن بۆپاراستنی بیروهۆشی پێشینیان كەئەوڕۆوەكوخەزێنەیەیكی زانستی وایەبۆنەتەوەكەمان، لێرەدابەپیٚ ویستی دەزانم لەهەموهۆگرانی فۆلكلۆروڕوناكبیرانی بەڕێزداوابكـەم هەرقـەیات وبەسـەرهاتێك كەدەبێتـەهۆی پێـك هـاتنی هەرپـەندێكی جاچەقـەیات بـیٚ ولۆلـۆولیٚ لیٚ بنێشتەخۆشـكە یاهـەرچی بـیٚ وەكوئەوسـیٚ قەیاتـەی ئەوەلـەئاخری ئەوكتێبـەی دانوسیومەتەوەبەخەتێكی جوان بـۆم بنوسنەوەوبەئەوناوونیشـانەی بـۆم بنـێرن دەپێـش هەموشتێك داسوپاس بیٚ سنورخۆم بەئیوەی زاناڕادەگەیـەنم خـوا یـاربی هەموپـەندەكان كۆدەكەمەوەودەنوسرا وێكی جیاوا زدا پێش كێش بەخۆینەرانی خۆشەویستی دەكەم ٠

ڕەنگ بیٚ بتوانم زۆرلەئەوباس وقەیاتانەلەكتێبەفارسـیەكانیش بدۆزمەوەبـەلاَم خۆشێكەی ئەوەیە.لەزاری،بێژەری،ڕابنوسرێتەوە؟!

❋ ❋ ❋❋ ❋ ❋ئەوەش سیٚ قەیاتەكان ❋ ❋ ❋❋ ❋ ❋

١- ئاردی خۆڕا سانێ ❋ ❋ ❋ترِی پور ئامانێ

پێتـــان وانـــەبێ هەرلـــەنێوەخۆماندا ئەوجورەمەتـــەلێ وقسەنەســـتەقانەهەبونە٠، وادەگێڕنـــەوەزۆرپێش ئەورۆ٠کەئەوسەردەمەی خۆراسـان شـارۆچکێك زیاترنـەبوە لـە ئەوخۆڕاسانەی ژنێکی فێڵەزان وپیاوێکی گێل ونەزانی لێ ژیاون ٠

ئەوژنەنانـەگولێ گولێـەکانی دەدابـەخزم وکـەس وکارەکـەی خـۆی و٠٠ یاهەرکەسێك وکەپەکەکەشی دەکردەکولێرەومولێرەودەرخواردی گێلەی مێردی دەدا

ئاخرەکەی گێلـە،لەکەپـەك خواردنـێ جاڕزدەبی چونکەزۆرلەژنەکەشـی دەترسا.ڕۆژێکی زۆربەپارێزەوەلەژنەکـەی دەپرسـی ودەڵـێ ئـەرێ خـانم ئەونانـەی مەبۆهەرکەپەکـە، وادەردەکـەوێ وەکـی لای مـە.لـەماڵان و.هـەرژنانیش نانیـان کـردوە،وەك ئـەورۆ نـانی نانەوەخانەی نەبوە.

ژنەش:بۆنازنی ❋ ❋ ❋ کابراگێلە: نابەخوای

ژنـە :ئەوەخوشکەسـەڵیتەکەت لەسـەرا وانـێ دەتـرِی ئاردەکـەی مـەلێرەبادەیباو وکەپەکەکەش دەمێنێ تـەوە گێلەئەوقسـەی زۆرپـێ نـاخۆش دەبـی ودەباڵـە خۆێدادەڵێ خۆادەزانی دەبی بچم دەردێکی بەسەربێنم هەرخوابیزانی چۆنە٠،

بـەڵێ زۆری نەکێشـا.رۆژێکـی گێلەبـەرەوجیێ ماڵەخوشـکی کەوتـەڕی وگەیشـتەجێ وچولەماڵەجیرانێکی خوشکی وەژورکەوت؟

ژنـی جیرانی کـابرای دەناسـی ودەچـی بەخوشـکامانی دەڵـێ کـاکت ئەوەلەماڵەمەیـە خوشکامان پیی ناخۆش دەبی وخێرایەکی دەچی بـۆلای وکـاکی ئەگـەرچی کـاکی ڕوێکـی وای نـاداتی ولـوت ولێوێکـی زۆرگرژوناخۆشـی دەبـی هـەرجورێکی بـو،خوشکامان کـاکی بەخێرهاتن دەکا٠،ودوایەدەڵێ هەرچەندی ئێرەوەکوماڵەبابی خۆمەبەڵام پیاوماڵەخوشـکی خۆی لەجێگایەکی بێ چۆن دەچێتەماڵی دەدیکانەهەستەبابچینەوەماڵەخۆمان کاکەگیان٠

گێلەدەڵێ جاچۆن ئەمن دێمەماڵەبێ شەرمی وەکوتوئەوەچەندساڵە کەپەکم دەرخۆارد دەدەی،خوشکامان ڕاچەنی:ئەیەڕۆخوایەتۆبەکاکەگیان خوانەکایاخواجاچون ئەمن کەپەکی دەرخواردی تۆدەدەم،؟٠

گێلە:جاچۆنی بۆچیەئەتۆلێرەدەترِی ئاردەکەی مەبادەیباوکەپەکیش دەمێنێتەوە خوشکامانیش حیللەوحەواڵەی زانیون وزودەزانێ ئەوەکاری ژنەکەیەتی ودەڵێ باشەئەتۆوەرەوەبابچینەوەماڵەخۆمان جائەمنیش لەئەوڕۆڕاتۆبەی دەکەم ناترِم ٠ بەڵێ هەرجورێکی بوخوشکامان کاکی بردەوەماڵەخۆیان گوتی کاکەگیان دەزانم زۆرت برسیەجارێ باهێکەورۆنێکت بۆسازکەم، گێلەش دەڵێ ئەرێ وەلا ئەوەلەبرسان دەمرم٠

بەڵێ خوشکامان ڕۆنی دەتاوەی دەکاو دەبا.لەسەرکولانەی وەسەری دەنێ ولەئاورگی بن کولانەی ژورێ ڕا،دەپێشدائەوکولانەوئاورگەزۆربون ،بۆدوکەڵ کێشانی٬ ئاوری وەبەردەدا. زۆری پێوەدەخورێ خۆهەرتینیشی بۆناچێ وئاخرەکەی گێلەزگی وەقورِەقورِدەکەوێ لەبرسان وەجواب دێ ودەڵێ دیارەکارەکەی دیکەشت وا یە دەناهێلکەورۆن لەسەرکولانەی وئاور.دەئاورگی ژۆرێدا ئەوهێکەورۆنەچۆن دەبێتێ وکەنکی دەخۆرێ٠

خوشکامانیش هەربۆ ئەوقسەوبەڵگەی ئەوگەلاڵی دارِشتبو،زوێکی دەیقۆزیتەوەو دەڵێ جاکاکە.ئەگەر ئەلەوەندەی ڕا ئاور نەگاتەئەوکولانەی چۆن ترلەسەراوانێ ڕادەگاتە شارەکەی تۆو لەنێو متبەقەکەش ئاوا ئاردی بەبا دەکات٠٠



٢- ❋ ❋ ❋ پادارن بگرن بیٚ پا ئی خۆنە❋ ❋ ❋

هەرلەنێوئەوکوردەواریەی خۆمانداتایفەیەك هەبون وئێستاش هەرهەنەئەوزەمانی خەڵك بەگشتی کەمێك لەشارستانییەت دوربونەئەوتایفەهەرکارێکی کردبایان هەرچەوت وبەراوەژو دەهاتەدەرێ و ڕودا وی زۆرسەیریان بەسەردەهات خەڵکەکەباوەڕیان پێی نەدەکردن وەدیانگوت ئینسان هێندەنەزان نابی و وانیە٠

جاهێنایان بۆتاقی کردنەوەی چەندکەسیان بەگەورەکەیانەوەلەدیوانی میری یالەدیوانی یەکیك لەمەزنەکان بانگ هێشتن کردن دابی کوردەوارێ وابو،پاش نان خۆاردنێ بەتایبەتی لەشەوەکانی دورودرێژی پایزوجستانێ دا،شەوچەرەیان دادەناشەوچەرەش دەئەو زەمانی دا لەنێوەمە٠مێوژوگوێز٠مێوژولەتکە٠هەنار٠برێشکە٠تۆوی سوێرو٠ئەوجورەشتانەدادەندران بلاّم ئەوشەوەی بەتایبەتی بۆئەومیوانەبەڕێزوخۆشەویستانەهێندێکیان قالۆچەڕەشکەبۆ گرتبون ودەگەڵ مێوژەڕەشان بۆیان لێك دابون دەقاپێکی دا لەنکەرێکیان بۆلەسەردانابون ودیارەبوبۆهەمومەجلیسێ لەنگەری لەسەر قاپەمێوژوگوێزەکان دا ندرابو؟

ئەوخڵکەی ئەگەرلەمەجلیسەکەێ دابون لەنگەریان لەسەرمێوژوگوێزان وەلابردوودەستیان کردبەخۆاردنێ و،میوانەکانیش وەکوئەوخەڵکەی دەگەڵ لەنگەریان لەسەرقاپەکەی وەلابرد قالۆچەکەوتنەجولەجوڵ وهەلاّتنێ گەورەکەیان ئەگەر ئاوای دی دەڕەفیقەکانی ڕاخوڕی وگوتی لەبابی منوکەوێ پادارن بگرن بیٚ پائی خۆمانن٠٠

تیٚ بینی؟!قەولێکی دیکەش هەیەودەڵێن؟میری کوڕەی ڕەواندزێ،زۆربەتوڕەیی دەنێرێتە سەرئەوتایفەی چونکەزۆرلەمێژبۆەزەکات، یان خەرج وباجیان،نەناردوەوئەوتایفەش چەند کەسێکیان هەڵبژاردونەوناردویانەبۆخزمەت میری ومیریش حاڵی دەکەن کەئەوتایفەبڕوکێك کەترەخەمن؟جادەڵێن لەوێبوە،ئەگەرقالۆچەومێوژەڕەشەیان بۆلێك داون وگەورەکەیان گوتویەتی پاداران بگرن بیٚ پائی خۆمانن ؟

وەختێکی میرلەدیوانێ ئاوایان دەبینێ لیٚ یان خۆش دەبیٚ ودەڵیٚ ئەوتایفەلەبەزۆرزانیە

لاساریان نەکردوەوبەڵکو،هەرئەوەندەلەدونیایەحاڵینە؟

٣- ❊ ❊ ❊ عوزرلەقەباعەتیٚ خەراپتر ❊ ❊ ❊

پیاوێکی ساحیب ماڵ ودیوودیوەخان کارداریکیٚ بۆکارەکانی ماڵیٚ دیووەخان وشاروبازاڕ هەروەهاخزمەتی میوان و وردەکارەکانی دیکەی ماڵیٚ دەگری ؟

ماوەیەك ئەونۆکەرەلەئەوماڵەی دەمێنێتەوەوهەموجێگایەکی بەڵەد.دەبیٚ وبەڕاشکاوی دەرو وژورا ن دەکاوئاغاش لەخزمەتەکەی زۆر ڕا زی دەبی کەبەڵیٚ کارداریٚکی زۆر باشم وەدەست کەوتوە وخەمی ماڵ ومیوانانم نیەوئاسودەم ٠

بەڵیٚ ڕۆژێکی پاش بەڕیٚ کردنی هێندێك لەمیوانەکان ئاغای ساحیب ماڵ دەپێشداوکاردار لەدوی ئاغای دەڕۆیشتنەوە بۆباڵەخانەی لەپێلیکانان وەسەردەکەوتن کاردارەکە دەستێکی لەسمتی ئا غای دەدا ؟!ئاغاش زۆر بەتوڕەیی لیی دەگەڕێتەوەوخەریك دەبی ئانگژای نۆکەرەکەی‌بیٚ ودەڵیٚ ئەوەچیە بۆ وادەکەی هەی٠٠٠

نۆکەرەکەش زۆر هێدی ولەسەرە خۆدەڵیٚ

ئاغا بم بورە وەمزانی. ئی خانمێیە،،؟؟

❊ ❊ ❊

تەوا وبو بەڕوحم ولوتفی خوای تەبارەك وتەعالا ئەم کتێبەبەنێوی٠

## دیاری پیرانشار

## ((گەشاندنەوەی ئاگری دامرکاوی پێشینیان ))

بەڕۆژی جومعەی چوارم مانگی جۆزەردان ساڵی هەزاروسیٚ سەت وهەشتای هەتاوی بەرابەربەیەکەمی مانگ سەفەریٚ سەرەتای ساڵی هەزاروچوارسەدەوبیست ودوی لەپیرانشاری ولەباغەسیٚ ساڵەکەم جابەتەمای خوای گەورەبابزانین کەنگی بۆن،چاپ دەکریٚ یاهەرناکریٚ وئاواتی ئەوەشم وەکوئاواتەکان دیکەدەدڵی دابمێنێتەوە؟

**((بانگاوازێك بۆ هەمو خەڵکی کوردستان))**

لە هەمو ئەو بەڕێزو خۆشەویستانەی کە هەرجورە ئاگاداریکێیان لە سەر شەهیدەکانی مەڵبەندی پیرانشارو دەورویەری، لە سەردەمی حکومەتی شای گۆڕکرا ودا کە شەهید،ویان گوللەباران کرا ون، هەیانە وەکو:

الف - ژیاننامە. ب - وەسیەت نامە. ج - وێنە. د - ناوونیشانێکی تەوا و (بیوگرافی) هـ - ڕۆژو شوێنی شەهیدبون و یان گوللەباران کردنیان،. ولەکوییێ بەخاکێ ئەسپێردراون،.بە ناوو نیشانی خوارەوە بۆمبنێرن .ولەهەمونەوگەورانەم دا وادەکەم بولەبارکردن ودارشتنی کتێبێك وناساندنی کاك مرادشیرێژ و هەوالانی،بەتەمام دەداهاتوێکی نیزێکدا،زۆربەڕێك و پێکی ویە تەوا وی بینوسمەوە،لەهەموبارێکەوەهاوکاریم بکەن پێش نیاربۆدانانی نێویَ کی جوانیش بۆکتیبەکەی،سوپاستان دەکەم.

چونکە بەڕاستی زۆر حەیفە ئەولاوە ئازایانە ئەولاوەخوێن گەرمانە ئەو ئینسانە لەخۆ بردوانە ئەگەردەڕۆژێك داکەس نەیدەوێرا،بەڕاشکاویَ بەرگەجوانەکەی خۆیَ(بەرگی کوردی)دەبەرکاوکوردی نوسین تاوانێکی ئاواگەورەبوکەحکومەت بەهیچ جور چاوپۆشی لیَ نەدەکرد،گیانی خۆیان لەڕێگای ئازادی ولات ویەربەرەکانی لەگەڵ پیاوە خۆێن خۆرەکانی بنەماڵەی پەهلەوی بەخت کرد وە ویەخۆێنی گەشیان ولات کوروستانیان ڕنگاندوە هەرئاوا بیَ نێوبمیننەوەوکەسیش باسیان نەکاوهیچ کەس هیچ ئاگادارێکی لیَ یان نەبیَ وبەیەکجاری لەبیر بچنەوەکەس وکارەکانی خۆشیان تەنانەت بەگلکۆکەشەیان نەزانن،. ئەوکەسانەی ئاگادارن وبیدەنەگەی لیَ دەکەن نابی لەبیریان بچی ئەوانەدەبەرا بەر مێژودا بەرپرسن.

ناو نیشان ١- پیرانشار- شەقامی ئازادی ڕۆژئاوا-کتیب فرۆشی مەولەوی ٢- بگات بەدەستی محی دین بەرشان(گویَ ڕەش) ژومارەی تەلەفون، ٠٤٤٤٢٢٦٢١٦ وموبایل ٠٩١٤٤٤٢٧٤٨٩-

## فەرهەنگوك

ئەم فەرهەنگۆکەتەنیاتایبەتی ئەم کتێبەیە

ئە لف

ئاڕاستە حازر.ئامادەو.جوان ولێك ولەبار،

ئاخوڕ جێگای تفاق تێ کردنی ئاژەڵیە.

ئارەخچن کلاو.تەقیلە.

ئاکام نەتیجە.ئاخری کار.

ئاڵی کوڵیوی بەردەستی ژنێ.

ئالیك خواردەمەنی تایبەتی ئەسپ ئێستروگوێ درێژ..

ئامور باسکێش ودەندەی لێك دەبەسترین بۆجوتی پێیان دەڵێن ئامور.

ئاوەدان ماڵاتێکی لەمیزان خوێ گەورەتربو.دەڵێن ماڵاتێکی ئاوەدانە.

ئاوەڵ گەرمك.جێگای گیاووگوڵ وکانیاوی گەرم.

ئەجیننە جندوکە،شتی نادیارئەگەرزۆرکەس بەدیتنی شێت بونە.

ئەرك پێ سپێردراو. وەزیفە.

ئەرخەیان بە خاترجەم بە.

ئەسلان نێوی ژنێکی بەدفەڕبوە.

ئەسکوێ کەچکێکی گەورەبولەداری دروست دەکراشێویان لەمەنجەڵێ یالەدیزەی ڕا پێ دەقاپان دەکرد.

ئێغنی گالێشی گەنم وجوێ ودانەوێڵەی.

ئێخترمە ولاخی بەجل وبەڕیا بەزینەوەوکەسی سوارنەبێ

ب

باج عەواریز.

بازرە ڕەوینەوەی ئەسپ ونێستروماڵاتی دەدیکانە.

| | |
|---|---|
| بازو | نێوی گاجوتیە .بازو .بەڵەك .گاشین .پیاڵە .قنجە . |
| باقە | گەنم وگیاو. .ئەگەردەدروێ دەپێشدادەکرێتەباقە٠ |
| باویەتی | هەلی وەدەست کەوتوە،فرسەتی وەدەست هێناو. |
| بایخ | قیمەت. ئەرزش.بەها. |
| بحایشێنی | بیری لی بکەیەوەبەراوەژو٠ |
| بزرکاو | ڕەنگ گۆڕاو٠ |
| بزوت | داری سەربەئاور.وبەئینسان زۆرزیرەکیش دەڵێن. |
| بژوێن | بە جێگایەکی دەگوترێ کە لەوەڕو ئاو و هەوای خۆشی هەبێت . |
| بژیو | ئازوقە،خواردەمەنی. |
| بوخچە | پەڕۆیەکی خاوێن شتومەکی خاوێنیان تێ دەنان لەجیاتی ساکی. |
| بۆچەك | سوتانی شتی دەگەڵ ڕۆنی. |
| بوختان | توهمەت . |
| بۆز | ڕەش وسپی تێکەڵ. |
| بوسەی بەنیفاق | ماچ کردنی بەدرۆ.وبۆفریودانێ وفێڵ لێ کردنێ. |
| بۆشناغ | پیاو یاژنێك خاوێن بێت وبەرگی خاوێن وباش دەبەرکات. |
| بەتەڵەبە | ماین ئەگەرەوەکەڵ هات دەڵێن بەفاڵ یابەتەڵەبە. |
| بەدی ناکەم | پێم شك نایە.نایەتەبەرچاوم. |
| بەدان | بەهاران مەڕ بەیانان و ئێوارا ن بۆ دۆشین و تێبەردانێ ئەگەر دیتەوە دەڵێن مەڕ بەدان دێتەوە٠ |
| بەرپرس | مەسئول.لێ پرسراو. |
| بەرزەلانە | ئاوەشەم.بن بەرداشی. |
| بەرهەم | بەروبوو.داهات. |

| | |
|---|---|
| بەرچیغ | داری دەوری تاڵێ .داری خوری شوتنێ و·· |
| بەڕە | پێشوراپایان دەخست وبەسەرپێڕك وكورسی وتەندوریان دادەدا· |
| بەرخوارد | خواردەمەنی بۆ ئینسانی وتفاق بۆئاژەڵی بەشێكی دیاری دەكەن ودەڵێن بۆبەرخواردێ |
| بەرو·وبو | بەرهەم·داهات·ئازوقە، |
| بەڵەك | ڕەش وسپی پنۆك ·پنۆك. |
| بەلادامینان | چادروچیغ بەبێ دەنگی ولەناكاو،كۆ دەكرێتەوەووەلا دەچی . |
| بەلگە | مەدرەك.شتێك بۆسبوت كردنێ كارویاشتی دیكە. |
| بێ شەما | نەوعەتوتنێكە وەختێكی لەكوردوستانی زۆردەكرا. |
| بێشكە | لانك . |
| بێ خەوش | پاك وخاوێن·بێ وفێڵ بێ درۆ. |
| بێگار | كار بەكەسێكی كردن بەزۆری وبەبێ پوڵی·· |

پ

| | |
|---|---|
| پارێز | بێ هەست وبەبێ دەنگی بۆشتێكی چون · |
| پاداران بگـرن بـێ پا،ئی خۆنن | مەنزورلەشتێكیە،ئەوەی بەبیروبڕوادەزاندرێ خەریكەلەدەست بچی دەبی دەپێشدا ئەوی وەدەست بێنی |
| پالاوتن | شت پالاوتن،بەتایبەتی شیردەپێشدادەبی بی پالێوی ودوایە بیكولێنی(بەهەلاتنی بەدزیش دەڵێن)· |
| پالە | ئەوكەسەی گەنم یاجوی دەدروێتەوە· |
| پردەبازگە | چۆم ئاوی تەنك ئەگەر پردی نەبی بەردانی بۆ دادەنێن بۆ پەڕینەوەی پێی دەڵێن پردەبازگە· |
| پرسە | سەرەخۆشی. |
| پروشە | جارجارەكرڕێوەوبای سارد. |

| | |
|---|---|
| پرووپاگەندە | قسەبڵاوکردنەوە .تەبلیغات. |
| پلوسك | لوساوك |
| پللار | دارهاویشتن بۆدوری . |
| پنج وبناوان | یانی هەتا ئاخیری .هەمو شتێك. |
| پۆپەشمینە | لەخوری دروست دەکرا.تەنك لەکاتی نوستنێ دالەبەرمێش ومێشولان بەخۆیان دادەدا. |
| پەحا | بەعزەژنێك لەبەعزەقسێکی داو،ادەڵێ . |
| پەری | فریشتە. |
| پەرێوە | ئاوارەبون ڕۆیشتن بۆجێگای نامەعلوم. |
| پەڕوازە | لەخەم ڕستن.گەورەبون. |
| پەرژین | وارش. |
| پەردو | جێگایەك لەنێومالێدا بەچیغ وبەرچیغان بۆبوك وزاوایانیان دروست دەکرد . |
| پەشتەماڵ | پارچەپاشتێکی خاوێن. |
| پەڵەباقی | لەقەدیمەوەزۆرگوتراوەودەبێ کارێکی زۆر.زەحمەت بی لەکشت وکاڵی کابرازۆریش ماندوبێ دەڵێن خۆپەڵەباقیت نەکردوە، |
| پەلەوەر | باڵندە.باڵدار. |
| پەڵو | خواردەمەنیکە بەئاردی چاك دەکرێ بۆئینسان بێ ددان. |
| پیاویژگە | بەتابەتی.زیاتر ژن بەمێردی دەڵێ، |
| پیتۆڵ | شت زان،زۆرزان،لەشتی حاڵی بوو |
| پێز | کێش وهێز |
| پێڵاو | کەوش. |
| پێرك | هەرزاڵ .جێگای نوێنان. |

پێشەنگ — دەپێش کاروانی دادەڕوابۆتاقی کردنەوەی ڕێگایە.

پێچك — مەچەکی ئەستور.چێچکی کورسی.

ت

تابڵەمە — تۆڕێکی چوکەیەتێلی پێوەیەبەئەوتێلەی هەڵیاندەسوڕاندبۆڕەژی گەشاندنەوەی وەختێکی سەماوەری ڕەژیێ هەبوئەویش زۆربو.

تانوت — زوربۆهینان .هەوڵ دانێ

تاسا — عەجایب ما.عەبەسا.

تاوان — گوناه.

تاوڵە — تەختەنەرد.

تفاق — خواردەمەنی ئاژڵیە.

تۆران — زیزبون.لەناڕەحەتیان.ڕۆیشتن.

تورئەسپ — تورەکەی جوی بۆئەسپ وئێسترو..کە وەسەری هەڵداوەسن.

تۆربە — کیسەبۆشت تێ کردنێ.

تۆڕ — جانوئەسپ یاجانومابن و..کەهێشتاسواری نەبوبن.

تۆوتەرز — نەبەئەجورەی .نەبەباشی.

توتو — بەهیچ جور.

تۆقە — بەدفەر.شلوغ.نائەهل.

تەپاڵە — ڕیخی ماڵاتی کەئیشك دەبی.

تەرز — بەمانای وەکو.هەروها ڕێك ولەباریش،

تەرە — توتن لەتەرەدەدرابگات.شوتی لەتەرەدەدراخەرانەبی

تەعنە — بەسەرڕۆیشتن

تەقڵەبازی — بەئەسپ وگوێ درێژێ ومنداڵیش بۆخۆیان غارغاردێنی دەکەن .

تەڵەب کە — داوابکە . لێم بخوازە.

تەماڵ — راوچی ئەگەر چوّ ڕاوێ و تاژی پێ بو کەروێشکی دیتەوە دەڵێ تەماڵە و تاژی تێ بەردەدا .

تەیار — حازر .ئامادە.

تێ توڕاندن — هەڵاتن لە کاتی مناسب و وەختی باشدا.

تێشو — خواردەمەنیّ تایبەتی شوانیە.

تێك سڕماو — ئەستور.قایم.بەجەم.

ج

جاڕز — نارەحەت ووەڕزبون لەشتێکی.

جاڕڕاهێشتن — خەڵك ئاگادارکردن.

جندۆکە — شتێکی نادیار.زۆرکەس بەدیتنی شێت بووە.

جۆم — خڕێکی چوکە لەچاو دۆڵێکی.

جەزرەبە — نارەحەتی.

جەلە — مریشك یاولاغان بەبەنی یان بەگوریسی لێك قایم کەن وتێکیان خەن، جەلەی پێ دەڵێن.

جەواڵ — لەبەنی دروست دەکرا.ئێستا،تەلیس لەجێگای وی کاریّ دەکا.

جێخون — خەرمان.

چ

چالاك — زیرەك.

چاروێدار — قەتارچی.

چاپ لوس — پێ هەلاگوتنی بەدروّ.

چل تەریدە — چەند کەسێك پێکەوە.یەك گرتودەبون بۆدزی وڕێ گرتنێ.

چەرتەمە — بەسێ چوارقامکی دەستان لێ دەدرێ بۆشادمانیّ.

چەرمەسەری کوێرەوەری وناڕەحەتی ·
چەرخ گۆیا ؟کەرستەیەك بووە.دەزەمانی پێشـودابۆعەزیەت وناڕەحەت کردنی ڕعیەتان وشکاندنی لەشیان·
چەقەڵ وەك ڕێویەوایەلەگەرمێنێ زۆرە·
چەڵتوك برینج وەختی چاندنێ وخەرمان هەڵگرتنێ·
چەلەنگ ڕێك،لەبار.
چەل ومل خۆبەستۆدابڕین·
چەمان خۆاریونەوە·
چێشت شێو·شۆرباو.
چیرەچپر بە زۆری خۆتیٚ ڕاکردن·
چینە مریشـك و کەڵــەباب وپەلــەوەر بــە دنـدوك و لاقیــان حــەرزی هەڵدەکوڵن بۆ وەدەست هێنانی کرم و..
چێژ تامکردن·
چێشتەنگاوێ چێشتانێ، پاشی نان وچاخواردنی بەیانان،بەشێك لەڕۆژێ دەڕوا.

ح

حاشاری دا شاردێوە·ونی کرد.
حافرەت بەتایبەتی ،مێرد زیاتربەژنێ دەلێ،
حوجرە بەدوکانی تایبەتی تاجران وجێگای خوێندنێ فەقێیان دەلێن.
حەریف ژنێك ئەگەربەغەیری مێردی خـۆی لەگەڵ کەسێکی دیکەتێکەڵ بوبێ دەلێن حەریف هەیە.
حەرامزادە زۆڵ، بیژو·
حەسود بەخیل·
حەسیر لەجەگەنی وپەڵەغی دروست دەکرا بۆلەسەردانیشتنێ ·

| | |
|---|---|
| حەوق مان | عەجایب مان .باوەڕ نەکردن بەئەوکارەی· |
| حەیار | فێڵەزان .جادوباز· |
| حەیارە | میزان. ئەندازە· |
| حیندرحۆو | توندڕۆیشتن·بەهەڵپەڕین. |
| حیلەیەك | فێڵێك.کەڵەکێك. |

خ

| | |
|---|---|
| خاتوزەمهەریر | نێوی سێ ڕۆژ لەڕۆژەسادەکانی ئەوەڵ مانگی ڕەشەمەییە· |
| خاچ | سەلیب نیشانەی عیسەویانە· |
| خاسان | ئینسانانی باش ولەخواترس. |
| خرپن | بەمندال مالات چوارپێی قەڵەو دەڵێن· |
| خمخانە | ریسێان بۆمافورەوشتی دیکانەلەوێ ڕنگ دەکردوئێستاش هەرهە یە· |
| خوتبە | لەنوێژی جومعەی دادەخوێندرێتەوە. |
| خۆگنخاندن | خۆخافلاندن·کارێك یاشتێك وەپاش گوێان ئێخستن. |
| خۆف | ترسان.نیگەران. |
| خەپلە | زەلام، ناقولا· |
| خەرتەل | دالاش. |
| خەرەزەن | لەچەرمی درۆست دەکرێ وجوتێربەدەستی وەدەگری بۆ لێ خورپینێ کەلان.ئێستازۆرکەمە، |
| خەڕەك | کەرستەییێکی جۆلاییە .بەنی پێ لەمەکوکەی دەهاڵێنن. |
| خەزوبەز | پەلەوەریابەشتی دیش دەڵێن ئەگەرزۆرقەڵەوبێ. |

د

| | |
|---|---|
| داپاچراو | ڕاکێشانی ژن وکچ بەزۆری · |

| | |
|---|---|
| دادوستەد | مەعامەلە.سەوداکردن. |
| دارماڵ | پراوپڕ. |
| دلم مەمرکێنن | مەم کوژێننەوە.لێم گەڕێن کوڵی خۆم بەڕێژم. |
| دانو | گەنم نۆك یاگوڵەپێغەمبەرەو..کوڵاو. |
| دای هاتێ | لەناکاو گرتی . |
| دروێنە | درونی گەنم و جۆودانەوێڵە. |
| دروژنە | کانیەو.تەنیا بەهاران ئاوی هەیە. |
| درێشە | کەرەستەییکی پینەچێتێەبۆدرونەوەی کەوش وشتی دیکەش . |
| درۆشانەوە | شوق دان .ڕوناکای پەیدا بون. |
| دڕدۆنگ | لەشتێك ناڕازی بون. ناقایل. |
| دزێو | ناحەز،نالەبەردلان، |
| دڵەخورپە | نیگەرانی لەشتێکی ترسان. |
| دم لەپوش | کەسێك شتێکی نەغد،لەدەست خۆی بدا. |
| دم چەوت | بەبێ ئاقڵی شتێکی ،لێ بستێنن،لەدەستی دەربێنن، |
| دۆغە | دەوڵەمەندان قەدیم حەیوانیان وەفەقیران دەدان دۆی بخۆن ئێ واش هەبوپایزی بێچۆکەشی نەدەویستەوەدەیدا بەکابرای فەقیر. |
| دۆلاش | بەدولاشی دائاودەهاتەسەرپەڕی ئاشی ئاوێ و،بەردئاشی دەسوڕاند |
| دوگە | پاشەڵی مەڕ و بەرانی. |
| دوزام | گوڵی.جورەنەخۆشێکی زۆر ناجورە. |
| دۆدانە | کەوڵی مەڕوبرانیان خۆش دەکردودۆیان تێ دەکرد،سێ پێکیان بۆ نیسێ لەسەردروست دەکرد،پڕبولەشویت قەزوان. |
| دەرزینگاوە | لەنیوەشەوی کات تێ دەپەڕی. |

| | |
|---|---|
| دەستەوا | چەندکەس دەچونەیاریدەی ماڵێکی بۆکاریَ،ئەوماڵەیەك یەکەدە۔ چۆنەوەکاریَ ئەوانەی هاتبونەیاریدەیان دەستەوای پیَ دەڵێن. |
| دەستەبەر | زامن، بەرعۆدەبون . |
| دەشوباند | پێم وایەدیتومە. دەمناسی، |
| دەعبا | جانەوەرێك.دەعبایەك.یابەشتێکی نامەعلوم دەگوتریَ. |
| دەغلَ | ئازوقە.گەنم.قوت. |
| دەڵەمە | شیرئەگەردەکرێتەپەنیر.دەپێشدا.دەڵەمەیە. |
| دەمان .زەمان | بەزەمانەت.بەزامن. |
| دەنە | هان دان. |
| دەوَر | تەڵەکەبازی.بەفێلَ. |
| دیار | وڵات.زێد .جێگای لەدایك بون. |
| دیاردی | کەروێشك،یائەوەی لەڕاویَ دەگیریَ. |
| دێراو | خەتی توتن وبێستان وئەوکردارەی بەدێراو دەکرێن. |

ر

| | |
|---|---|
| ڕائەنگاوت | بەندروێك یائەگەربرێکی لەگلۆلێکی دەکەیەوە. |
| ڕاشکاوی | بیَ پەردەوپایە، |
| ڕاموسان | ماچی شیرن. |
| ڕاوێژ | تەکبیر.بیروفکرلیَ کردنەوە. |
| ڕاوکە | بەعزەمریشکێك هەیـەدەبیَ هێلکـەی لـەبن دانیـیَ جاهێلکـەی دەکا.پییَ دەڵێن ڕاوە. |
| ڕبە | پێوانەیەکی٥ درەمی، صاع. |
| ڕەبەن | سەڵت .بیَ ژن وماڵ . |
| ڕەپێچەك دان | خرکردە نە وە ولیَ خورینێکی زۆر بە تاڵوکە . |

| | |
|---|---|
| ڕەتاندن | لیٚ خوڕینی بەغار . |
| ڕخسان | جوربون .جێبەجیٚ بون .هەڵکەوتن. |
| ڕەز | باغی ترێی. |
| ڕەژی | سەختەداری نیوەسوتاو. |
| ڕەسەن | حەسلٚ بیٚ و،بەدەلٚ نەبیٚ. |
| ڕەستە | ڕزگاربون. |
| ڕەغبەت | ئیشتیا ،ئارەزو. |
| ڕەگەز | بنەچەکە. |
| ڕەند | (لێرەدابەمانای)جوان .زەریف.زۆرچاك، |
| ڕەنێو | گەیاندنەحاسلاٚتیٚ.وپێگەیاندن، |
| ڕیخ | پیسایی ئاژڵیە. |
| ڕێس | بەن وباڵی ڕێسراو. |

ز

| | |
|---|---|
| زاکون | بەسام.بەهەیبەت.و لەبەرچاو. |
| زروقاوە | وەکەیف هاتەوەوهاتنەوەی سەرحالەتی پێشوی. |
| زریشك | وەکوشیلانی وایەدەخوریٚ وبەئیشکیش لەسەرپلاٚویی ڕۆدەکەن. |
| زوڕنا | ئەوەوی چاوەش دەگەلٚ دەهوڵیٚ لێی دەدەن . |
| زۆلٚ | .بیژو حەرام زادە. |
| زەردەهە لگەڕا و | ڕەنگ و ڕویەکی نەخۆشی. |
| زەڕ | زەڕدان زەرەر. |
| زەرنەبو | بەقسەی نەکرد.بەقسەیەوەڕانەوەستا.جوابی نەداوە. |
| زەفەر | دەرەقەت ،پێوەستان. |
| زەللە | کاری بیٚ جیٚ ونەفسانی کردن . |

| | |
|---|---|
| زەن | مەڕ ئەگە دەستی کرد بە زانی دەڵێن زەنی مەڕی. |
| زەندەق | لیٚ ترسانێکی زۆرو،وزۆربە سام. |
| زەنین | شك لیٚ بون.شەك لیٚ كردن. |
| زەوادم نەبڕیوە | یانی نان یاهیچ شتێکم نەخواردوە. |
| زیپك | غیرەت.ئازایەتی. |
| **ژ** | |
| ژوشك | جولەوەرێکی هەزاردڕو. |
| ژەك | ئەووەڵ شیری پاش زانی ئاژەڵی. |
| ژیر | زانا عاقڵ. |
| **س** | |
| سامرە | لەچەندناوچان بەنێری دەڵێن سامرە. |
| سام گرتن | لەشتێکی ترس هێنەر.زورترسان. |
| سایری ئەوانە | وەکوئەوانە.وەك ئەوعالەمەی ئەوخەڵکەی. |
| سڵەمێوە | رەوێوە.لیٚ گەڕاوە. |
| سندە | گڵمەت،سندەگڵ، |
| سوچ | گوناح ،خەتا. |
| سوری عەیار | پیرێژنیکی جاسوسی شای بوە. |
| سور | پاش گێرەکردن وهەلاویشتنی گەنم وجوودانەوێڵەکەساغ بۆوە وهەڵیان داوەپێی دەڵێن سور. |
| سوربکرێتەوە | مەعلوم بێت. |
| سوروسورداش | خوێری وبێکارەی شای بونە. |
| سۆزە | لەکارێکی سیرپری لەشتێکی ئاگات لیٚ نەبی وخەبەرێکت وەدەست کەوی. |

سۆنە نێرەمراوی.

سوێنە تەشت لەگڵی دروست دەکرائێستانایلۆن لەجێگای وی کاریٚ دەکا

سەخڵەت هەوای ناخۆشی جستانی.

سەدئۆباڵم لێرەدایانی (وەباڵ بەستۆم)

سەرکۆنە لۆمەکردن.بەسەرڕۆیشتن.

سەردێر پاش کێڵان وچاندنیٚ زەوی ئاو دەدەن.

سەرە دەپێش پەیدابونی جەنجەڕوخەرمەنکوبی ولاغیان بەگوریسی لەملی یەکتری دەبەستن وگێرەیان پیٚ دەکردن بۆکڵوش وردکردنیٚ ئەوەی لەسەریٚ باسەرەبو،بەئی بنەوەشیان دەگوت بنە.

سەرقەڵەمانە ئەوانەی دوعاو ئایەتی قورئانی (بەنشتو)دەنوسن شتێکیادەدەنیٚ بەنێوی سەرقەڵەمانە.

سەری زمانی خۆی گەست شتێکی وەبیر هاتەوە.لەشتێکی حاڵی بو.

سەوە سەوەتە تفاقی پیٚ دەبەن بۆئاژەڵی وتەویلە وزۆریشیان پیٚ خاوێن دەکردنەوەو،ئێستاخاوێن کردنەوەبەفەرغونیە.

سەکوڵ سەگی قوڵە.

سەگسار بەپیرێژنی خوێن تاڵ و.ناشیرن دەڵێن.

سیٚ تا جورەبەنێکەبۆدروست کردنی جەواڵ وبەڕەو..بەکاردیٚ.

سیاق حیساب.

سێڵ ئانی لەسەردەکەن بۆکولیچەلەسەرکردن وزۆرشتی دیش بەکاردیٚ

سیپە ڕاوچیان لەقەراغ کانیاوردم چۆمان جێگایەکیان بۆخۆحاشاردانیٚ دروست دەکردوپێیان دەگوت سیپە.

ش

شایی — داوەت .هەڵپەڕکێ.

شاتەشات — هەڵلا هەڵلا ی ئێرانە.

شپرزە — ماڵۆز·ناڕێك.

شکوا — پاڕانەوەبۆلێ خۆش بونێ ،تکاکردن.

شلتە — چەندجورەگیایان پێکەوەدەکوتان ئەگەرجێگایەك ئەستوربا یائێشابا،لێیان دەنا هەتادەربا·

شوقاق — عەشیرەتێکن·

شۆرکە — جیی خۆلێشوتنیبو زەمانی پێشو·

شەلاڵ — هەموجێگایەکی گرتبێ دەئارەقەیداشەلاڵ بوە·

شەوچەرە — (شەوچەلەش هەیە)میوەیان شتێکی پاش نان وچای دەخۆرێ.

شەیپور — بۆشەڕی وبۆسانی لەشکەری لێ دەدرێ.

شێخ شەرەفی — عەشیرەتێکی گەورەن لە مەلبەندەکانی پیرانشار، سەردەشت، سابلاغ ، نەغەدە و ئێراقێ.

شینە — ئەویش هەر بەکەروێشکێ دەڵێن.

شیرەشیر — هەڵلا هەڵلای پیرێژنانە.

ع

عارەبە — وەکو داشقەی بو، کەلێیان دەبەر دەکردن دەیان کێشا بۆ کێشانەوەی شتومەك ودەغلٚ ودان وتوتن وکەرەستەی ماڵێ·

عەسر — دەور، زەمانە·

عەوق ما — عەجاییب مان، عەبەسان·سەرسام لەئەوکارەی.

عەمدەن — بەئانقەست.بەفکروویستی خۆێ.

عەیان — مەعلوم.ئاشکرا.

غ

غایله فکر·بیرکردنەوە.

غللور کەسێك یامالاتێك لەمیزانی خۆی زیادەڕەوی بکادەڵێن غللوربوە.

غوسڵ خاوینکردنەوەی لەشی چەپەل·

غەرق هەموگیانی ون بوەدەفکراندا·غەرقی خەیالاتیە.

غەرقبون نوقم بون·

غەمزە ناز.عیشوە.

غەنیمەت دەست کەوتی شەڕی.

غەو زە ڕیك هاتن·ڕنگ گۆڕان·سیس بون·

غەیبەت پاش ملەباس کردن.

ف

فام ئاقڵ،زانائی،

فاق بەبۆنی ناخۆش دەڵێن فاقی سەرم چو.·

فروۆ لەژەکی دروست دەکرێ·

فرزە جێگا نەمان بۆبەربەرەکانی.زۆربۆ هێناوە.

فسۆس خوێڕی .کەجاسوسێ لەکاری خوێڕیانەدەکا.

فەرخە جوجکە.

ق

قاپ ر قاچاغ قاپ و مەنجەڵ و مەجومعە و ...

قانگ کەسێك یاجوڵەوەرێکی دەدیوێکی کەی ودوکەڵی دەباڵ کەی.

قانگەلاشك کەنگری ئیشك بو ·

قاوت ئەوبرێشکانەی ناتەقنەوە. دەی هاڕن ودەیانکەنەقاوت.

قرپە کێشە.هەرا .چەقە.

| | |
|---|---|
| قرتاڵە | لە سەوەتەی چوکەترە بو شت تیْکردنی وەکو سەوەتەی بە شولکان دروست دەکریْت. قاپیان تیْدەنان جارجار دانەویلْەشیان تیْدا دەشوشتەوە. |
| قواستنەوە | قسیك یاشتیْك نەهیْلْی بکەویْتەعەرزی. |
| قوْشە | جورەپوْلْیْ قەدیمیە. |
| قوْشەن | لەشکر.قشون، |
| قولْ وقەپ | دوکەس لەدیار یەکتری هەرکامیان قسە بکا دەدوْریْنی. |
| قەبیح | کاریْکی زوْرناحەز. |
| قەپ دان | گرتنی ئازایانە. |
| قەرەبینا | وەکو تاپوْریْ بوەقوڵەتر،وەکوساچمەزەنی لەسەریْراپرکراوەتەوە |
| قەرەچەناغ | زوْربلْیْ. |
| قەرەلەقەرەدان | دەبیندرا پالْەوانیْك .کەسیْك زورداربوەونەیویْراوەتیْ. |
| قەرەولْ | کیْشکچی. |
| قەفەس | جیْگای حەپسی پەلەوەریە. |
| قەلآشکری | لەتکەداربوْسوتاندنیْ. |
| قەلپوز | سەرەوەی زینی پیْشەوەی. |
| قەیات | داستان.چیروْك. |
| قەیسەری | قەدیم ریْزەدوکان سازدەکران سەریان دادەپوْشین پییْان دەگوتن قەیسەی ئیْستاش هەرهەیە. |

ك

| | |
|---|---|
| کالان | جیْگای شیروخەنجەریە. |
| کالْە | لەچەرمی کەلْ وگامیْش وگاجوتی دروستیان دەکردولەباتی کەوشیْ دەپیْیان دەکرد. |

| | |
|---|---|
| کدو | کدۆسەرئاوی قەدیم زۆربو.ڕۆن خوێ بیبـاری ئیشـك وشـتی دیکەیان تێ دەکردن. |
| کۆت وزنجیر | لەبەندیخانان دەکاردەکران. |
| کوتەك | دارێکی لەبارەبەدەست کەڵەوان ورێبواری ..ووەیە. |
| کوچك | لەقوڕێ دروستیان دەکردبۆمەنجەڵ لەسەردانانێ. |
| کۆخ | جێگای مریشك وپەلەوەریە. |
| کۆز | جێگای کاریلەوبەرخی ساوایە. |
| کوز | خەتی جوتی کەبۆبێستان وتوتنیێ لێ دەدرێن. |
| کۆلەوەژ | ئەودارەی ئەگەرتەندوری پێ تێ وەردەدەن. |
| کۆلکە | کۆتەرە. |
| کۆلەکوتراو | کوێرەوەری .نارەحەتی دیتو. |
| کۆنەماکەر | جنێوێکی چوکەیەبۆحافرەتان. |
| کۆیزر | ئەگەرخەرمانێ دەغڵی هەڵداوێن دەمالۆسکیداجوێی دەکەنەوە . |
| کوێن | پارچەی ڕەشماڵی ڕەش لەموی بزنان دروست دەکرێ |
| کوێخا | کاربەدەستی ئاغای. |
| کەپولە | پێوانەیەك بولەئاشی گەنمیان پێ دەپێوا.لەداری دروست دەکرا. |
| کەپەنەك | لەبـەرگنی دروسـت دەکـرێ تایبـەتی شـوانیەبەخۆی دادەدات وشەوێش پێ دەنویت . |
| کەترەخەم | بەکەسێکی دەڵێن.زۆربیرلەشتی نەکاتەوەوبێ فکروخەیاڵ، |
| کەسیرە | سڕ لەسەرمان . |
| کەشاو | دەپێش دا زەوی ئاودەدەن جـاتۆوی پـێ وەردەکـەن ودەیکێڵـن پێی دەڵێن کەشاو. |
| کەفەڵ | پشتەوەی ئەسپ وئێسترو.. |

| | |
|---|---|
| کەندو | وەك تەندۆرێ لەگڵی دوست دەکرابۆئارد تێکردنیێ وئارد تێداڕاگرتنێ وبرێك لەتەندوری گڵی،گەورەتربو. |
| کین | ڕق وغەرەزی کۆن. |
| **گ** | |
| گاسن | دەدەندەیان دەخست بۆعەرز هەڵقەندی دەجوتیدا. |
| گلاندی | ئێخستی لەعەرزی دا. |
| گرژ | مۆن زامیری توڕە. |
| گراو | دۆست.یار. |
| گرێژنە | شتێك زۆرخەراپ بێ .دەلێن لەگرێژنەچوە، |
| گورز | کرستەییکی شەری .قەدیمی. |
| گورج | توندوتۆڵ.زیرەك وئازا. |
| گوریس | لەبەنی موی دروست دەکرا،ئێستانەپسێن لەجێگای گوریسی کارێ دەکا. |
| گۆران | شاعیر.حیسابگەر.وعەشیرەتێکن . |
| گۆزە | وەکوتونگەی نایلونی ئیستابو.بۆئاوتێداهینان وئاوتێداڕاگرتنێ و..ولەگڵیان دروست دەکرد؟ |
| گولەدەزو | زەمانێك بۆدەرکەمۆرکردن پینەچێتی ومافورە دروست کردنیێ دەکاردەکرا ئێستاش بۆفەرشی بەکاردێ . |
| گوێلەوسار | پەتکێکەدەستۆی مانگا وگوێلك و..دەکەن. |
| گوێزان | قەدیم گوێزان هەبوسەروڕدێن و...یان پێ دەتاشی. |
| گوێس قولاغ | سڵ.بۆشتێکی گوێ ڕاگرتن. |
| گەماڵ | چوارپێ.سەگ. |
| گەلاخرنوك | جورەگیایەکی کوێستانێە. |

| | |
|---|---|
| گیفەی سمیلان | بەکەیف بون.ڕازی بون. |
| گێل | نەزان.فەقیر. |

ل

| | |
|---|---|
| لات | چەقوکێش. |
| لار | خوار. |
| لاو | جحێلْ. |
| لاواز | کز .بێگۆشتە وپێستی تەنکە. |
| لمبۆز | دم ولوتی گوێدرێژونەسپ وئێستروجانەوەری. |
| لوت | کەپوْ. |
| لولێنە | ئافتاوەی لەگلی، ئێستالەجێگای وی مەسینەکاریْ دەکات. |
| لەخشتەبردن | گۆڕینی کەسێکی بەلای ناحەزدا. |
| لەگەن | قەدیم.هەبولەتەشتی چوکەترولێویان لەتەشتی بلێندترو،مس یان لەزەردیش دروست دەکرا. |
| لەمەیی | جورەنەخۆشێیکی مندالآنی ساوابو. |
| لەنگەری | دەوری.پێشخۆری. |
| لیاقەت | لیْ هاتوی. |
| لیرە | زێڕ. |
| لێکدا لێکدا | لەسەرێك لەسەرێك وزوزو. |

م

| | |
|---|---|
| ماتەم | خەم.پەژارە. |
| ماخولیا | ئاگالەخۆبڕاو.وەك شێتان. |
| ماش وبرینجی | بەشێك لەڕدێنیْ ئەگەرسپی بودەلێن ڕدێنی ماش وبریجیە. |
| ماقولْ | پیاوی دەولەمەند؟گەورە؟بەئیحتیڕام . |

| | |
|---|---|
| مالۆسك | بەشێکی لەخەیانێ بردەدەن وهەڵی داوێن پیێ دەڵێن مالۆسك. |
| ماڵەڵڵا | دەروێش ئەگەردەچونەبەعزەماڵێکی لەجیێ ئەوەی بڵێن شتێکمان دەنێ دەیان گوت ماڵەڵڵامان دەنێ. |
| مشت | مشت هەرمستە. |
| موتمانە | خاترجەم بون.بەقاپێ کردن . |
| موتەحەیر | عحجایب مان .باوەڕنەکردن. |
| موشکیل | زەحمەت.پێك نەیەت. |
| مەتاع | وەسائێل. شتومەك . |
| مەحزون | غەم وپەژارە.نارەحەت. |
| مەخافەتی | نیگەران. دڵەخورپە.خۆف کردن . |
| مەرەد | دەرد.ناخۆشی ·بەسەرهێنان، |
| مەزن | بەپیاوی گەورە وبەئێحیڕام دەگوترا· |
| مەعاش | حقوق.دیاری کراوی مانگانە وەرگرتن. |
| مەعسوم | پاك وخاوێن وبەری لەهەموگوناە وشتێکی. |
| مەڵحەکە | جێگای قومار پێ کردنی خەڵکی،گەمەپێ کردن. |
| مەنحوس | بەراوەژوو |
| مەنقەڵ | ئاوری تێدادەکەنەوە،بۆکەباب برژاندن و.. |
| مەلاس | خۆمات وبێ هەست کردن. |

ن

| | |
|---|---|
| ناسۆر | برینی تەشەنابو. |
| ناندێن | لێرەدامەنزورلەکەسێکیەئەگەرلەماڵێکی بیست وخەراپەشیان دەگەڵ بکات · |
| نایاب | شتێکی بەزەحمەت وەدەست کەوێ. |

| | |
|---|---|
| نردو | نانی زۆرلەسەرکەوڵی لەسەرسفرەی. |
| نشتەر | وەك دەر زی بوز وانە، سەری بە قولاپە. |
| نشتو | دوعاوئایەتی قورئانی بۆنەخۆش وبێحاڵان دەنوسرێ. |
| نغرۆو | ڕۆچون ،وێران کردن بۆبەرگری، |
| نۆبەتێ | جورەنەخۆشێکی بەتاوولەرزە. |
| نەدی بدی | بەکەسێکی دەڵێن هیچی نەدیبی بەتایبەتی بەمناڵان دەڵێن |
| نەزیلە | قەیات، حەکایەت. |
| نەغمە | ئاوازێك شێعرێك. ئەگەربەنارە.دەخوێندریتەوە. |
| نەڵێن | دوناوچەی منگوڕوگەورکانەلەمەڵبەندی پیرانشاروسەردەشتێ . |
| نەمرنەژی | ژیانێکی زۆربەنارەحەتی وفەقیری |
| نەهێنی | پەنهان.سرِری.مەحرەمانە. |
| نێری | وەك بەرانی نیرینەی ئاژەڵێە، بۆ بزنان. |
| نیکبەت | چارەرەش. |
| نیر | جێگای کەڵەوەی هەیەداویشرێتەسەرملی کەڵ وگاجوتان.بۆجوت کردنێ. |
| نیچیر | ئەوەی لەراوێ دەگیرێ نێچیر،یانێوچیری پێ دەڵێن. |
| نیسان | نێوی مانگێکی رۆمیە. |

و

| | |
|---|---|
| واقی بردەوە | عەجایب ما. |
| وەجاغ کوێر | کەسێك ئەگەر ئەولادی نێرینەی نە بێت. |
| وەك گیسکس هەیاسی | مەسەلەێیکی مەنشورونۆردورە ؟؟ |
| وەلی | پیاوی چاك ولەخواترس. |

ھ

| | |
|---|---|
| هاندان | دەنەدان .تەحریك كردن.وەغیرەت ئێخستن. |
| هالۆز | شەپریو.شپرزە. |
| هاوێر | مەرویبێچو لێك جویَ كردنەوە. |
| هروژم | هێرشی شلّێوەوبای توند. |
| هۆرە | دارێكەسەری باریك دەكەن بۆقەڵشاندنی داری دیكە(داری گەورە) |
| هەرزە | نەفام. تیَ نەگەیشو. |
| هەلوا | خۆاردەمەنێكەبەئاردورۆن وشەكروذۆشاویش دروست دەكریَ . |
| هەلسەنگاندن | لەكەم وزۆری شتێكی حاڵی بون . |
| هەلاواردن | جویَ كردنەوەی دویان چەندشتان لێكتری. |
| هەلاواردونە | مریشك وپەلەوەر.ئەگەرجوجكان لەخۆجویَ دەكەنەوە. |
| هەلّچون | شیریاشتێك لەسەرئاوری ئەگەركوڵی یاكەسێك ئەگەرتورەبو . |
| هەلێنجیَ | ئاولەكانیەهەڵێنجان.كەمێكی تیَ كەی.لێی هەڵێنجی. |
| هەم هەمە | دلەخورپە، ترسان. |
| هەمبانە | پێستی مەرو..بەرانیان دەخاراندو.دانەوێڵەیان تیَ دەكرد. |
| هەندران | ئێرونەویَ.جێگای نادیار.ونامەعلوم. |
| هەوێن | شیرپاش كولاندنیَ برێك سارد دبیتەوەكەمێكی ماست رەگەلّ خەی ئەگەرنەبوبۆهەوێنی دۆی رگەلّ خەی هەوێنی پیَ دەلێن. |
| هەویَ | دوژنی پیاوێكی هەویَ ئێكترین. |
| هەوەس | ئیشتیای نەفسانی. |
| هەیوان | پێش دەركەی دادەپوشرابۆنیسی .یان بۆلّ دانیشتنیَ. |
| هەیدیَ | لیَ تورەبون و دەنگدان، دەركردن بە دەنگی زۆرەوە. |
| هەیاران؟ئەی یاران | ئەو كارەی بۆ نەكەم. |
| هیزە | لەپێستی بەران ومەری گەورەدروست دەكرا بۆرۆن تێكردنیَ |

هێم — لێرەدا بەمانای دڵ.

هێن — لێرەبەژنی دەلاڵ وخەراپ دەگوترێ.

ی

یاغر یاغر — سەبرسەبر، بەکاوەخۆ.

یەغدان — سندوقێکی گەورەبو، شت و مەکیان دەنێودەنا.

یەکساتەی هەندوی — شتێکی زۆ جێ بەجێ بێ بەپەلەو فەوری.

## مزگێنی مزگێنی

بەهەموخوێنەرانی بەرێزوخۆشەویست ڕادەگەیەنم کەکتێبی پەندی پێشینیان بەنێوەرۆکێکی جوان ئەگەر،لایەکی نەسرەکەیەتی و.لای دیکەشی شێعرە.دە پێنج سەت ودەلاپەڕەیدا دەژێر چاپ دایەوهەربەئەوزوانە.بەچاپ دەگاوبلاودەبێتەوە.


راهنمای جاده‌ای شهرستان پیرانشهر
اشنویه
عراق
نقده
مهاباد
سردشت
دهستان لاهیجان غربی
دهستان لاهیجان شرقی
دهستان منگور غربی
راهنما
شهر پیرانشهر
مرکز بخش
روستا
مزرعه و مکان مسکونی
مزرعه و مکان غیر مسکونی
مرکز دهستان
چادر
مراکز بهداشتی و درمانی
مرکز خدمات جهاد کشاورزی
مرز دهستان
حدود شهرستان
مرز
جاده آسفالته
جاده شوسه
جاده خاکی ( جیپ رو )
جاده مالرو
مقیاس 1:100000
طراحی و پلات رنگی: پیرانشهر ـ نماگرافیک (۴۲۲ ۵۴۴۹)